**ناوی کتێب:** ڕاڤەی کتاب التوحید.

**نووسەر:** زێرەڤان خۆشەوی خۆشەوی.

**تیراژ:** (١٠٠٠) دانە.

**ژمارەی بەرگەکان:** (٢) بەرگ.

**نۆرەی چاپ:** چاپی یەکەم.

**ساڵی چاپ:** (١٤٤٥) کۆچی، (٢٠٢٤) زایینی.

**ژمارەی سپاردن:** لە بەڕێوەبرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان / هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردن (١٠١٥) ساڵی (٢٠٢٤) پێدراوە.

## باب ما جاء في النشرة

**عن جابر رضي الله عنه أن رسول الله (ﷺ) سئل عن النشرة فقال: (هي من عمل الشيطان) رواه أحمد بسند جيد. وأبو داود[١].**

**وقال: سئل أحمد عنها فقال: ابن مسعود يكره هذا كله.**

**وفي "البخاري" عن قتادة: قلت لابن المسيب: رجل به طب أو يؤخذ عن امرأته، أيحل عنه أو ينشر؟ قال: لا بأس به، إنما يريدون به الإصلاح، فأما ما ينفع فلم ينه عنه. أ.هـ[٢].**

**وروى عن الحسن أنه قال: لا يحل السحر إلا ساحر[٣].**

**قال ابن القيم: النشرة: حل السحر عن المسحور، وهي نوعان:**

**إحداهما: حل بسحر مثله، وهو الذي من عمل الشيطان، وعليه يحمل قول الحسن، فيتقرب الناشر والمنتشر إلى الشيطان بما يحب، ويبطل عمله عن المسحور.**

**والثاني: النشرة بالرقية والتعوذات والأدوية والدعوات المباحة، فهذا جائز[٤].**

**فيه مسألتان:**

---

[١] أخرجه أحمد (٢٩٤/٣ رقم ١٤١٣٥)، وأبو داود (٣٨٦٨)، والبيهقي في (الكبرى) (٣٥١/٩)، وصححه الألباني (٢٧٦٠).

[٢] أخرجه البخاري معلقا بصيغة الجزم في كتاب الطب باب (٤٩).

[٣] أخرجه الطبري في (تهذيب الآثار)، كما في (تغليق التعليق) (٤٩/٥)، وانظر: (إعلام الموقعين) (٣٩٤/٤)، وفتح الباري (٢٣٣/١٠).

[٤] إعلام الموقعين (٣٩٦/٤) بنحوه.

**الأولى:** النهي عن النشرة.

**الثانية:** الفرق بين المنهي عنه والمرخص فيه مما يزيل الأشكال.

# باب ما جاء في النشرة

## باسی بەتاڵکردنەوەی سیحر و چارەسەری نەخۆشی جن

پێناسەی (النشرة): لە زمانەوانی دا: بە ضمی نون، فعلة من النشر، وهو التفريق.

لە شەرع دا: بەتال کردنەوەی سیحرە لە سیحرلێکراو.

سەبارەت بە حوکمی: ڕوون دەبێتەوە لەوەی کە دانەری کتاب باسیکردووە ڕەحمەتی خوای لێ بێت کە جوانترین ڕوونکردنەوەی داوە.

گومانی تێدا نییە بەتاڵ کردنەوەی سیحر لە سیحرلێکراو لە بابی دەرمان و چارەسەرە، هەروەها فەزڵێکی گەورەی تێدایە بۆ کەسێک بۆ ڕەزامەندی خوا بیکات بەڵام لە بەشی ڕێگەپێدراوە)[1].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (هۆکاری ئەم بابە لەکتابی تەوحید دیارە ئەویش ئەوەیە: هەروەک چۆن سیحر شیرک بەخوایە و دژی ئەصلی تەوحیدە و ساحیریش موشریکە بەخوا بە شیرکی گەورە، هەڵوەشاندنەوەی سیحریش دەکرێت بە ساحر بەتاڵ بکرێتەوە و بە بێجگە لە ساحیریش بە دەرمان و شتی تری ڕێگەپێدراو یان دوعا و زیکری تری ڕێگەپێدراو، ئەگەر لە ساحرەوە بێت ئەوە هەڵوەشێنەری ئەصلی تەوحیدە و نەفی تەوحید دەکات، مناسبەی دیار سەبارەت بە پەیوەندی نێوان ئەم بابە وبابی پێشووتر: (باب ما جاء في السحر)، هەروەها مناسبەی لە کتابی تەوحیدیش، چونکە زۆربەی ئەوانەی سیحر بەتاڵ دەکەنەوە شەریک بۆ خوا بڕیار دەدەن)[2].

---

[1] القول المفيد (٨٥/٢).

[2] التمهيد لاپەڕە (٣١٤).

**عن جابر رضي الله عنه أن رسول الله (ﷺ) سئل عن النشرة فقال: (هي من عمل الشيطان) رواه أحمد بسند جيد. وأبو داود، وقال: سئل أحمد عنها فقال: ابن مسعود يكره هذا كله.**

واتە: لە جابر دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: پرسیار لە پێغەمبەری خوا کرا (ﷺ) سەبارەت بە بەتاڵ کردنەوەی سیحر (کە لەو کاتە باو بوو) ئەویش فەرمووی: (ئەو جۆرە لە کردەوەی شەیتانەکانە).

دەفەرموویێت: پرسیار لە ئەحمەد کراوە فەرمووی: ابن مسعود هەموو ئەمانەی پێ باش نەبووە.

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(سئل رسول الله (ﷺ)):** واتە: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا (ﷺ).

**(عن النشرة):** واتە: بەتاڵ کردنەوەی سیحر، (ال) للعهده، واتە: ئەوە سیحر بەتاڵ کردنەوەی زانراوە لەسەردەمی نەزانین.

**(من عمل الشيطان):** واتە: لە کردەوەی شەیتانە و شەیتان وەحیان بۆ دەنێرێت.

**(يكره):** وشەی کەڕاهەت پێشینەکان زۆریان بەکاردەهێنا مەبەستیان حەڕام بوو، هەندێک جاریش بۆ کەڕاهەت بوو.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردوە تاوەکو ئاماژە بۆ ئەوە بکات بەتاڵ کردنەوەی سیحر بە سیحر لە کردەوەی شەیتانە و نەفی ئەصلی تەوحید دەکات.

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نەزان دەبێت پرسیار بکات لەئەهلی عیلم بە تایبەتی بابەتی عەقیدە.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە سیحر و بەتاڵ کردنەوەی سیحر هەبووە لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)، چونکە (ال) للعهده، واتە پرسیاری ئەو سیحر بەتاڵ کردنەوەیان لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد کە زانراو بوو لە سەردەمی نەزانین.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بەتاڵ کردنەوەی سیحر بە سیحر لە کردەوەی شەیتانە، چونکە (ال) للعهده لەسەردەمی نەزانین سیحریان بە سیحر بەتاڵ دەکردەوە.

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بەتاڵ کردنەوەی سیحر بە سیحر تاوانێکی زۆر گەورەیە و لە گەڵ حەرامکراوەکانی تر جیاوازە و توندترە، چونکە فەرموویەتی کردەوەی شەیتانە.

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەرام کردن حصر ناکرێت تەنها لەوەی بە وتە بڵێت: حەرامە یان دروست نییە، بەڵکو ئەگەر سزا بۆی دانرا یان درایە پاڵ شەیتان بەڵگەیە کردەوەکە حەرامە.

**٦-** ئیمام ئەحمەد لەسەر وتەی ابن مسعودە کە دەفەرموێت (نشرة) مەکروهە، بەڵام فەرموودەی (باب) ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە، بۆچی فەرموودەی هەڵنەبژاردووە و نەی گوتووە حەرامە؟

وەڵام: چەند وەڵامێک هەیە لەوانە:

١- لەوانەیە کەڕاهەت مەبەست پێی حەرامی بێت.

٢- لەوانەیە ئەو کاتەی کە وەڵامی داوەتەوە فەرموودەی پێ نەگەیشتبێت، دوای وەڵام دانەوە فەرموودەی پێ گەیشتبێت.

**٣-** لەوانەیە فەرموودەی پێ صحیح نەبێت، بۆیە وتەی صحابی هەڵبژاردوە.

**٤-** لەوانەیە پرسیارکەر زانی بێتن کە فەرموودە لەم بابە هەیە، بەڵام پرسیاری ئەوەی لێ کردبێت وتەیەکی تر هەیە.

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بەتاڵ کردنەوەی سیحر بە سیحر دروست نیە تەنانەت لە کاتی پێویستیش.

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (هەندێ زانا بۆ ئەوە چوون دروستە سیحر بەتاڵ بکرێت بە سیحر لەکاتی پێویستی، ئەم وتەیە ڕاست نییە بەڵکو وتەیەکی هەڵەیە، چونکە زەروریات دروست نیە بەوەی دین و تەوحیدی لەسەر دابنێیت لەبری، ئەوەی زانراو بێت پێنج شتە زەروورەکان شەریعەت پێی هاتووە بۆ پاراستنی، یەکەمیان پاراستنی دینە)[1].

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٣١٨).

**وفي (البخاري) عن قتادة: قلت لابن المسيب: رجل به طب أو يؤخذ عن امرأته، أيحل عنه أو ينشر؟ قال: لا بأس به، إنما يريدون به الإصلاح، فأما ما ينفع فلم ينه عنه. أ.هـ**

واته: بوخاری دەگێڕێتەوە کە قەتادە بە سەعیدی کوڕی موسەیەبی گوت: پیاوێک سیحری لێکراوە یان لە خێزانی بەستراوە، ئایا دروستە سیحرەکەی بۆ بەتال بکرێتەوە؟ ابن مسیب فەرمووی: هیچی تێدا نییە ئەوان ئەو کارە بۆ چاکسازی دەکەن، ئەوەی سوودی هەبێت نەهی لێ نەکراوە.

**وروى عن الحسن أنه قال: لا يحل السحر إلا ساحر.**

واتە: حەسەنی بەسرِی دەفەرمووێت: (یەکێ سیحر بەتاڵ دەکاتەوە کە خۆی ساحیر بێت).

**قال ابن القيم: (النشرة: حل السحر عن المسحور، وهي نوعان: إحداهما: حل بسحر مثله، وهو الذي من عمل الشيطان، وعليه يحمل قول الحسن، فيتقرب الناشر والمنتشر إلى الشيطان بما يحب، ويبطل عمله عن المسحور.**

**والثاني: النشرة بالرقية والتعوذات والأدوية والدعوات المباحة، فهذا جائز).**

واتە: ابن قیم دەفەرمووێت: بەتاڵ کردنەوەی سیحر دوو جۆرە:

یەکەمیان: بەتاڵ کردنەوەی سیحر بە سیحرێکی تر، ئەمەیان ئەوەیە کە جۆرێکە لە کاری شەیتان، وتەی حەسەنی بەسرِی ئەمەیان دەگرێتەوە.

چونکە ئەو کەسەی کە سیحرەکە بەتاڵ دەکاتەوە لەگەڵ ئەو کەسەش کە سیحرەکەی بۆ بەتاڵ دەکرێتەوە، بەو جۆرە کە شەیتان ئارەزووی لێ بێت خۆیان لە شەیتان نزیک دەکەنەوە، جا لەبەر ئەوە شەیتان کاریگەری سیحرەکە لەسەر سیحر لێکراوەکە بەتاڵ دەکاتەوە.

دووەمیان: بەتاڵ کردنەوەی سیحر بە ڕوقیە، واتە: خوێندنی قورئان و معوذاتی قورئان و سوننەت و بەکارهێنانی دەرمان و دوعای حەڵاڵ، ئەمەیان دروستە.

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (چارەسەری تری سیحر کە باشترین چارەسەرە هەوڵدانە بۆ دۆزینەوەی شوێنی سیحرەکە، لەناو زەوی یان چیا یان شوێنی تر، ئەگەر دۆزیتەوە دەری دەهێنیت و پووچی دەکەیتەوە (واتە: دەیسووتێنی)، سیحرەکە بەتاڵ دەبێت)[١].

---

[١] مجموع فتاوى ومقالات الشيخ ابن باز (٣/٢٨٠).

# باب ما جاء في التطير

**وقول الله تعالى:** ﴿أَلَا إِنَّمَا طَائِرُهُمْ عِندَ اللّهُ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ **{الأعراف:١٣١}.**

**وقوله:** ﴿قَالُوا طَائِرُكُمْ مَعَكُمْ﴾ {يس:١٩}.

**عن أبي هريرة رضي الله عنه، أن الرسول (ﷺ) قال: (لا عدوى، ولا طيرة، ولا هامة، ولا صفر) أخرجاه[١].**

**زاد مسلم: (ولا نوء، ولا غول)[٢].**

**ولهما عن أنس رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (لا عدوى ولا طيرة، ويعجبني الفأل) قالوا: وما الفأل؟ قال: (الكلمة الطيبة)[٣].**

**ولأبي داود بسند صحيح عن عقبة بن عامر رضي الله عنه قال: ذكرت الطيرة عند رسول الله (ﷺ) فقال: (أحسنها الفأل، ولا ترد مسلما فإذا رأى أحدكم ما يكره فليقل: اللهم لا يأتي بالحسنات إلا أنت، ولا يدفع السيئات إلا أنت، ولاحول ولاقوة إلا بك)[٤].**

---

[١] متفق عليه: أخرجه البخاري (٥٧٥٧)، ومسلم (٢٢٢٠).
[٢] أخرجه مسلم (٢٢٢٢) من حديث جابر رضي الله عنه.
[٣] متفق عليه: أخرجه البخاري (٥٧٥٦)، ومسلم (٢٢٢٤).

[٤] أخرجه أبو داود (٣٩١٩)، والنسائي في (عمل اليوم الليلة) (ص٢٥٥ رقم ٢٩٣)، وضعفه الألباني في "الضعيفة" (١٦١٩).

**وعن ابن مسعود رضي الله عنه مرفوعا: (الطيرة شرك، الطيرة شرك، وما منا إلا، ولكن الله يذهبه بالتوكل) رواه أبو داود، والترمذي وصححه، وجعل آخره من قول ابن مسعود[١].**

**ولأحمد من حديث ابن عمرو: (من ردته الطيرة عن حاجة فقد أشرك) قالوا: فما كفارة ذلك؟ قال: (أن تقول: اللهم لاخير إلا خيرك، ولاطير إلا طيرك، ولا إله غيرك)[٢].**

**وله من حديث الفضل بن عباس رضي الله عنهما: (إنما الطيرة ما أمضاك أو ردك)[٣].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** التنبيه على قوله: ﴿أَلا إِنَّمَا طَائِرُهُمْ عِندَ اللّهُ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ مع قوله: ﴿قَالُوا طَائِرُكُمْ مَعَكُمْ﴾.

**الثانية:** نفي العدوى.

**الثالثة:** نفي الطيرة.

**الرابعة:** نفي الهامة.

---

[١] أخرجه أبو داود (٣٩١٠)، والترمذي (١٦١٤)، وابن ماجه (٣٥٣٨)، وأحمد (٣٨٩/١)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٤٢٩).

[٢] أخرجه أحمد (٢٢٠/٢ رقم ٧٠٤٥)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٠٦٥).

[٣] أخرجه أحمد (٢١٣/٢ رقم ١٨٢٤)، وضعفه ابن مفلح في "الآداب الشرعية" (٣٧٧/٣)، وضعفه سليمان آل الشيخ في تيسير العزيز الحميد (ص٣٢٦)، وقال: في سنده نظر، وفيه انقطاع بين مسلمة وبين الفضل بن العباس.

**الخامسة:** نفي الصفر.

**السادسة:** أن الفأل ليس من ذلك بل مستحب.

**السابعة:** تفسير الفأل.

**الثامنة:** أن الواقع في القلوب من ذلك مع كراهته لا يضر بل يذهبه الله بالتوكل.

**التاسعة:** ذكر ما يقوله من وجده.

**العاشرة:** التصريح بأن الطيرة شرك.

**الحادية عشرة:** تفسير الطيرة المذمومة.

## باب ما جاء في التطير

## باسی شومی و ڕەشبینی کە چ هەڕەشەیەکی لەسەرە

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (هۆکاری هێنانەوەی ئەم بابە لە کتابی تەوحید ئەوەیە: شومی جۆرێکە لە جۆرەکانی شیرک، شیرک لە ڕووی شومی نەفی تەواوی تەوحیدی واجب دەکات چونکە شیرکی بچووکە).[1]

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: ((التطير): بەشوم زانینی هەر شتێکی بیستراوە یان بینراوە یان زانراوە، شتی بینراو بە نموونە: ئەگەر باڵندەیەک ببینێت و ڕەشبین بێت پێی، یان شتی بیستراو بە نموونە: کەسێک شووم دەیگرێت بە بیستنی وتەی کەسێک و دەڵێت: ئەی خەسارەتمەند، شووم دەیگرێت، یان شتی زانراو: وەک ڕەشبینی بە هەندێک ڕۆژ یان هەندێک مانگ یان هەندێک ساڵ، ئەمەیان نابینی و نابیستی.

بزانە ڕەشبینی نەفی تەوحید دەکات، نەفی تەوحید کردن لە دوو ڕووەوەیە:

یەکەم: ئەوەی تووشی ڕەش بینی بووە تەوەکولی بڕیوە لەسەر خوا و پشتی بە بێجگە لە خوا بەستووە.

دووەم: پەیوەستە بە شتێک هیچ حەقیقەتی نییە، بەڵکو وەهم و خەیاڵە)[2].

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٣٢١).

[2] القول المفيد (٩٣/٢).

**وقول الله تعالى:** ﴿أَلا إِنَّمَا طَائِرُهُمْ عِندَ اللّهُ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ {الأعراف:١٣١}.

واته: با بزانن و ئاگادار بن ئەو شومی و نەگبەتیەی ئەوان کە بە سەریاندا هاتووە لە لایەن خواوە بووە و بەهۆی کردەوەکانی خۆیانەوە ڕووی داوە، بەڵام زۆربەیان نازانن.

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿طَائِرُهُمْ عِندَ اللّهُ﴾: (طائرهم): مبتدأ، عند الله: خبر، ماناکەی: ئەوەی تووشی ئێوە بوە لە ناخۆشی و وشەکە ساڵی بەهۆی موسا و قەومەکەی نەبووە، بەڵکو لەخواوە بووە.

﴿وَلَـكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ واتە: نازانن خێر و شەڕ لەژێر قەدەری خوای گەورەدان.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

عبدالله بن جار دەفەرموویێت: (مناسبەی هێنانەوەی ئەم دوو ئایەتە لەم بابە: هەردووکیان بەڵگەن کە ڕەشبینی کردەوەی کافرەکانە، خوای گەورە زەمیانی کردووە و سزای داون)[1].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە خێر و شەڕ خوای گەورە تەقدیری کردوون و هەموویان لەژێر قەدەری خوای گەورەدان.

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە نەزان هۆکاری هەموو شەڕ و خراپەیەکە.

---

(١) الجامع الفريد لاپەڕە (١١٤).

**٣-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە ڕەشبینی حەڕامە و سیفەتی کافرەکانە.

**وقوله:** ﴿قَالُوا طَائِرُكُمْ مَعَكُمْ﴾ {يس:١٩}.

واته: خوای گەورە دەفەرمووێت: (پێغەمبەران وتیان شومی و نەگبەتیەکەتان لەگەڵ خۆتان دایە، واتە: بەهۆی کردەوەکانی خۆتانەوەیە).

## ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿قَالُوا طَائِرُكُمْ مَعَكُمْ﴾: واتە ئەوانەی بۆ ئەو شارە نێردران وەک وەڵام دانەوە بۆ وتە یان ئەمەیان گوت، کە ئەوان گوتیان: (إنا تطيرنا بكم).

## هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

مناسبەی هێنانەوەی ئەم دوو ئایەتە لەم بابە ئەوەیە: هەردووکیان بەڵگەن کە ڕەشبینی کردەوەی کافرەکانە، خوای گەورە زەمیانی کردووە و سزای داون[1].

## سوودەکانی ئایەتەکە:

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە هۆکاری ڕەشبینی کردەوەی مرۆڤە، هیچ دژیەک نییە لەنێوان ئەم ئایەتە و ئایەتی پێشووتر کە دانەری کتاب باسیکرد، ئایەتی یەکەم بەڵگەیە ئەوەی شت تەقدیر دەکات تەنها خوایە و لەژێر قەدەری خوای گەورە دایە، ئایەتی دووەم ڕوونی کردۆتەوە هۆکاری ئەم ڕەشبینی یە ئەوانن[2].

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە ڕەشبینی حەرامە، چونکە وەک زەم باسکراوە و عادەتی سەردەمی نەزانین بووە.

---

[1] الجامع الفريد لاپەڕە (١١٤).

[2] القول المفيد.

**عن أبي هريرة رضي الله عنه، أن الرسول (ﷺ) قال: (لا عدوى، ولا طيرة، ولا هامة، ولا صفر) أخرجاه. زاد مسلم: (ولا نوء، ولا غول).**

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (گواستنەوەی نەخۆشی نییە واتە: (هەر لە خۆیەوە بڵاونابێتەوە بەڵکو بە قەدەری خوایە)، شومی و ڕەشبینی نییە، بایەقوش کاریگەری نییە، مانگی سەفەریش شوم نییە)، لای موسلم ئەمەشی لەگەڵدایە: (ئەستێرە کاریگەری نییە و دێو زەرەر و زیانی نیە).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(ولا هامة):** (هامة): باڵندەیەکی بەناوبانگە وەک کوندە پەپوو وایە، ئەگەر هاتبوایا لەسەر خانووی کەسێک بخوێنێت دەیانگوت: ئەوە لەبەر ئەوەی خوێندی کەسێک دەمرێت لەو ماڵە، باوەڕیان وابوو مردنی نزیک بووە.

**(ولا صفر):** دوو وتەی بەناوبانگ هەیە سەبارەت بە (صفر):

١- هەندێ زانا دەڵێن مەبەست پێی مانگی صفرە.

٢- هەندێ زانای تر دەڵێن نەخۆشییەکە تووشی ورگی وشتر دەبێت، نەقل دەبێت لە وشترێک بۆ وشترێکی تر، لەسەر ئەمە عطفی لەسەر عدوى لە بابی عطفی خاصە لەسەر عام، ئەوەی ڕاست بێت مەبەست پێی مانگی صفرە.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە تاوەکو ئاماژە بۆ ئەوە بکات ڕەشبینی بوونی نییە و حەڕامە.

## سـوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە گواستنەوەی نەخۆشی نییە، واتە: هەر لە خۆیەوە بڵاونابێتەوە بەڵکو بە قەدەری خوایە.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کات کاریگەری نیە لەسەر داهاتووی مرۆڤ و قەدەری خوای گەورە، مانگی سەفەر وەک هەموو مانگەکانی تر خێر و شەڕی تێدایە.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئەستێرە کاریگەری نییە لەسەر ژیانی مرۆڤ.

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دێو زەرەر و زیانی نیە، لەسەردەمی نەزانین باوەڕیان وابووو دیو شەڕ بۆ مرۆڤ دەهێنێت، دێو کردەوەی شەیتانەکانە شێوەی خۆی دەگۆڕێ لەبەردەم خەڵک، بەتایبەتی ئەگەر مرۆڤ بترسێ هەندێک شتی پیشان دەدات و بزری دەکات لە ڕێگا یان دەیبینێت ئاگرێک لەبەردەمی نقل دەبێت، یان گوێی لە دەنگێک دەبێت، یان شتی تر، لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (إذا تغولت الغيلان فبادروا بالأذان)، واتە: ئەگەر دێو لەبەردەم تۆ بەدیار کەوت بە پەلە زیکری خوا بکە (واتە: بانگ بدە)، چونکە زیکری خوا شەیتان دەردەکات، ئەگەر زیکری خوات کرد یان قورئانت خوێندەوە ئەم کردەوە شەیتانی یە دەڕوات و نامێنێت.

لەسەردەمی نەزانین باوەڕیان وابوو ئەم دێوانە شەڕ دەهێنن، پێغەمبەر (ﷺ) نەفی ئەم شەڕەی کرد، فەرمووی هیچ ئەصڵی نییە، ئەمە کردەوەی شەیتانی یە و زیان بەکەس ناگەیەنێت ئیلا بە ئیزنی خوا نەبێت، هەروەها باسی چارەسەری تەواوی کردووە کە زیکری خوایە [(١)].

**ولهما عن أنس رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (لا عدوى ولا طيرة، ويعجبني الفأل) قالوا: وما الفأل؟ قال: (الكلمة الطيبة).**

---

[(١)] إعانة المستفيد (٢/١٣-١٤).

واتە: ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (تەنینەوەی نەخۆشی نییە، شومی و ڕەشبینی نییە، وە گەشبینیم پێ خۆشە)، گوتیان گەشبینی چیە؟ فەرمووی: (وشەیەکی جوانە یان ناوێکی جوانە).

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(ويعجبني الفأل):** گەشبینیم پێ خۆشە، دواتر باسی کردووە (فأل) چییە، فەرمووی: وشەیەکی جوانە یان ناوێکی جوانە.

### هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە تاوەکو ئاماژە بۆ ئەوە بکات ڕەشبینی بوونی نیە و حەڕامە.

### سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە گواستنەوەی نەخۆشی نیە، واتە: هەر لە خۆیەوە بڵاونابێتەوە بەڵکو بە قەدەری خوایە.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە پێغەمبەر (ﷺ) گەشبینی پێ خۆش بووە، گەشبینیش وشەیەکی جوانە، کە هۆکارە بۆ خێر وچاکە.

**ولأبي داود بسند صحيح عن عقبة بن عامر رضي الله عنه قال: ذكرت الطيرة عند رسول الله (ﷺ)، فقال: (أحسنها الفأل، ولا ترد مسلما فإذا رأى أحدكم ما يكره فليقل: اللهم لا يأتي بالحسنات إلا أنت، ولا يدفع السيئات إلا أنت، ولاحول ولاقوة إلا بك).**

واته: له عورووەی کوڕی عامر دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: لای پێغەمبەر (ﷺ) باسی شومی کرا، ئەویش فەرمووی: (لەوەدا گەش بینی جوان و حەڵاڵە، موسڵمان له کارەکەی ناگێڕێتەوە، جا ئەگەر هەر کامتان شتێکی بینی و پێی ناخۆش بوو با بڵێت: خوایە هەرچی شتە خراپ و ناشرینەکانە تەنها خۆت لایان دەدەیت، ناشتوانین حاڵی خۆمان بگۆڕین لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی دیکە مەگەر تەنها بە کۆمەکی خۆت نەبێت، هیچ هێزێکمان نییە مەگەر خۆت پێمان ببەخشیت بە کۆمەکی خۆت).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(أحسنها الفأل):** واتە: باشترینی گەشبینی یە، گەشبینی لە (طیرة) نییە، لەبەر ئەوە بە (طیرة) چوواندووە چونکە مرۆڤ گورج دەبێت و هان دەدرێت بۆ ئەنجام دانی کردەوەکە، لەم ڕووەوە وەک (طیرة) وایە.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوون بکاتەوە هەر کەسێک شتێکی بینی پێی ناخۆش بوو سونەتە بڵێت: (اللهم لا يأتي بالحسنات إلا أنت، ولا يدفع السيئات إلا أنت، ولاحول ولاقوة إلا بك).

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک شتێکی بینی پێی ناخۆش بوو سوننەتە بڵێت: (اللهم لا يأتي بالحسنات إلا أنت، ولا يدفع السيئات إلا أنت، ولاحول ولاقوة إلا بك).

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم دوعایە گەورەیە سەبارەت بە جۆرەكانی ڕەشبینیە كە ڕوو لە دڵ دەكەن)[١].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەزڵی گەشبینی.

---

[١] التمهید لاپەڕە (٣٢٦).

**وعن ابن مسعود رضي الله عنه مرفوعا: (الطيرة شرك، الطيرة شرك، وما منا إلا، ولكن الله يذهبه بالتوكل) رواه أبو داود، والترمذي وصححه، وجعل آخره من قول ابن مسعود.**

واتە: لە ابن مسعود دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ڕەش بینی جۆرێکە لە شیرک ڕەش بینی جۆرێکە لە شیرک)، ابن مسعود دەفەرمووێت: هەر یەک لە ئێمە شتی وا دێت بە دڵیدا، بەڵام بەهۆی تەوەکول و پشت بەستن بە خواوە، خوا ئەو شتە ناهێڵێت لە دڵیدا.

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(وما منا إلا، ولكن الله يذهبه بالتوكل):** ئەمەیان وتەی ابن مسعودە خوا لێی ڕازی بێت، هەروەک دانەری کتاب ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە.

### هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە تاوەکو ئاماژە بۆ ئەوە بکات ڕەشبینی شیرکە.

### سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ڕەشبینی شیرکە، وە شیرکی بچووکە و حاڵەتیش هەیە شیرکی گەورەیە، ڕەش بینی شیرکە و دروست نییە، چونکە:

أ- پشت بەستنە بە بێجگە لەخوا.

ب- تەنها وەهمێکە و هیچ حەقیقەتی نییە.

صالح ال الشيخ خوا بيپارێزێت دەفەرموويێت: واتە: (شيركی بچووكە بەخوای گەورە)[١].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموويێت: (ئەگەر باوەڕی وابێت ئەو شتەی پێی ڕەشبينە خۆی فاعلە بێجگە لەخوا، ئەمەيان شيركی گەورەيە بەخوا، چونكە كەسێكی كردۆتە شەريک لەگەڵ خوا لە دروست كردن و هێنانەدی)[٢].

**٢-** ئەم فەرموودەيە بەڵگەيە چارەسەری ڕەشبينی و نەمانی ڕەش بينی پشت بەستنە بەخوا، زانايان دەڵێن چارەسەری ڕزگار بوون لە ڕەشبينی بريتيە لە:

أ- تەنها پشت بەخوا ببەستە.

ب- كارەكەی خۆت دوامەخە و ڕەتی مەكەوە لەبەر ڕەشبينی.

ج- داوا لەخوا بكە ڕزگارت بكات لە فێڵی شەيتان، داوای خێر لەخوا بكە و پەنا بگرە بەخوا لە شەڕ.

مناوي ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموويێت: (ئەوەی تووشی ڕەشبينی بووە دەبێت داوای خێر لەخوا بكات و پەنا بەخوا بگرێت لە شەڕ، هەروەها كارەكەی خۆی بڕوێنێت و پشت بەخوا ببەستێت)[٣].

صالح الفوزان خوا بيپارێزێت دەفەرموويێت: (ڕەشبينی چارەسەر دەكرێت بە سێ شت:

يەكەم: پشت بەخوا بەستن.

---

[١] التمهيد لاپەڕە (٣٢٦).

[٢] القول المفيد (٩٨/٢).

[٣] فيض القدير (١٣٦/٦).

دووەم: کارەکەی خۆی بڕوێنێت و کاریگەر نەبێت پێوەی و بە هەڵس و کەوتیەوە دیارنەبێت، وەک کەسێک بێت کە هیچ ڕووی نەداوە و هیچ نییە.

سێیەم: ئەو دوعایانە بکات کە فەرموودەی پێی هاتوون، ئەگەر ئەم دوعایانە بکەیت خوای گەورە دەتپارێزێت لە ڕەشبینی و یارمەتیت دەدات و سەرت دەخات و تەوفیقت دەدات)[١].

---

[١] إعانة المستفيد (١٧/٢).

**ولأحمد من حديث ابن عمرو: (من ردته الطيرة عن حاجة فقد أشرك) قالوا: فما كفارة ذلك؟ قال: (أن تقول: اللهم لاخير إلا خيرك، ولاطير إلا طيرك، ولا إله غيرك).**

واتە: ئیمام ئەحمەد لە فەرموودەی ابن عمر دا دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێک شومی بکات لە شتێکدا و بیگێڕێتەوە لە کارەکەی، ئەوە شەریکی بۆ خوا داناوە)، هاوەڵان وتیان ئەی کەفارەتی چییە؟ فەرمووی: با ئەوە بڵێت: (اللهم لاخير إلا خيرك، ولاطير إلا طيرك، ولا إله غيرك)

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(لا خير إلا خيرك):** واتە: خێر هەمووی لەخواوەیە، جا بە هۆکاری زانراو بێت یان شتی تر.

**(لا طير إلا طيرك):** واتە: باڵندەکان هەموویان موڵکی خوان، هیچ شتێک ناکەن و بەڵکو مسخرن (واتە: ژێربارکراون).

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردوە تاوەکو ئاماژە بۆ ئەوە بکات هەر کەسێک شومی بکات لە شتێکدا و بیگێڕێتەوە لە کارەکەی، ئەوا شەریکی بۆ خوا داناوە.

## سوودەکانی فەرموودەکە:

١- ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروست نیە ڕەشبینی مرۆڤ بیگێڕێتەوە لە کارەکەی، ڕەشبینی حەڕامە، نەفی تەوحید دەکات، ئەوەی تووشی ڕەشبینی دەبێت لەم دوو حاڵەتە بەدەر نییە:

یەکەم: وەڵامی ڕەش بینییەکە دەداتەوە و کردەوەکە واز لێ دەهێنێت، ئەمە گەورەترین جۆری ڕەشبینییە.

دووەم: کارەکەی خۆی ئەنجام دەدات بەڵام دوو دڵە و ترسی ئەوەی هەیە کاری تێ بکات، ئەمەیان سوکترە.

هەردووکیان کەم و کوڕی یە لە تەوحید و زیانی لەسەر بەندە هەیە، بەڵکو برۆ لەسەر دڵ خۆشی و ئاسوودەیی پشت بەخوا ببەستە، گومانی خراپ بە خوا مەبە)[١].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ڕەشبینی جۆرێکە لە شیرک، لەبەر وتەی: (من ردته الطيرة عن حاجته فقد أشرك)[٢].

**٣-** ڕەشبینی کەم وەک وەسواسێکی کەم کاریگەری نییە، هەر کەسێک ڕەشبینی کەوتە ناو دڵی و لە کارەکەی پەشیمانی نەکردەوە، ئەمەیان زیانی بۆ نیە هەروەک لە فەرموودەی ابن مسعود: (وما منا إلا ولكن الله يذهبه بالتوكل) باسمان کرد[٣].

**٤-** هەموو شتەکان خیر و شەڕ بە دەست خوای گەورەیە[٤].

**٥-** خوای گەورە بەتەنیایە لە بەندایەتی کردن دا هەروەک چۆن بە تەنیایە لە دروستکردن و بەڕێوەبردندا[٥].

---

[١] القول المفيد (٢/٩٣-٩٤).

[٢] القول المفيد (٢/١٠٠).

[٣] القول المفيد (٢/١٠٠).

[٤] القول المفيد (٢/٩٨).

[٥] القول المفيد (٢/١٠٠).

**وله من حديث الفضل بن عباس رضي الله عنهما: (إنما الطيرة ما أمضاك أو ردك)**

واتە: هەر لە ئەحمەد لە فەرموودەی فەزڵی کوڕی عەباسدا هێناویەتی: (شومی ئەوەیە کە هانت بدات بۆ کارێک یان لە کارێک ساردت بکاتەوە و پەشیمانت بکاتەوە.)

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(ما أمضاك أو ردك):** هانت بدات بۆ کارێک یان لە کارێک ساردت بکاتەوە و پەشیمانت بکاتەوە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە تاوەکو ڕوونی بکاتەوە شومی ئەوەیە کە هانت بدات بۆ کارێک یان لە کارێک سارد و پەشیمانت بکاتەوە.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە شومی ئەوەیە کە هانت بدات بۆ کارێک یان لە کارێک ساردت بکاتەوە و پەشیمانت بکاتەوە.

تێبینی: گومانی تێدا نییە چەندین فەرموودە هاتوون سەبارەت ڕەشبینی کە مرۆڤ نابێت ڕەشبین بێت بە کات و شوێن و شتی تر، بەڵام سەبارەت بە ئافرەت و خانو و ئەسپ فەرموودە هاتووە:

عَنْ ابْنِ عُمَرَ قَالَ ذَكَرُوا الشُّؤْمَ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (إِنْ كَانَ الشُّؤْمُ فِي شَيْءٍ فَفِي الدَّارِ وَالْمَرْأَةِ وَالْفَرَسِ)[1].

واته: (ئەگەر ڕەشبینی لە شتێک دا هەبێت ئەوا لە خانوو و ئافرەت و ئەسپ دایە).

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: (الشُّؤْمُ فِي الْمَرْأَةِ وَالدَّارِ وَالْفَرَسِ)[2].

واته: (ڕەشبینی لە ئافرەت و خانوو و ئەسپ دایە).

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا كُنَّا فِي دَارٍ كَثِيرٌ فِيهَا عَدَدُنَا وَكَثِيرٌ فِيهَا أَمْوَالُنَا فَتَحَوَّلْنَا إِلَى دَارٍ أُخْرَى فَقَلَّ فِيهَا عَدَدُنَا وَقَلَّتْ فِيهَا أَمْوَالُنَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): (ذَرُوهَا ذَمِيمَةً)[3].

واته: ئەنەس خوای لێی ڕازی بێت دەڵێت: پیاوێک گوتی ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لە خانوییێک دا بووین ژمارەمان زۆر بو و ماڵمان زۆر بوو، دوای لەو خانوە رۆیشتین چووین بۆ خانووییێکی تر ژمارەمان کەم بوو واتە چەند کەس لە ماڵی ئێمە مردن و سەروەت و سامانیشمان کەم بوو واتە هەژار بووین، پێغەمبەر خوا (ﷺ) فەرمووی: (واز لەو خانووە بهێنن خانووییێکی باش نیە).

[1] رواه البخاري (٥٠٩٤)، ومسلم (٢٢٥٢).
[2] رواه البخاري (٥٠٩٣)، ومسلم (٢٢٥٢).
[3] أبوداود (٣٩٢٤)، والحديث حسنه الألباني في صحيح أبي داود.

زانایان چەند وتەیان هەیە سەبارەت بە ڕەشبینی بەم سێ شتانە و ئەو فەرموودانەی هاتوون و نەهیان لە ڕەشبینی کردووە و بەڵکو بە شیرک وەسفیان کردووە:

یەکەم: هەندێ زانا دەڵێن تەنها لەم سێ حاڵەتە ڕەشبینی دروستە و مرۆڤ پێی تاوانبار نابێت و شیرک نییە، چونکە ئەم سێ شتانە بەرجەستەن و خەیاڵ نین.

دووەم: هەندێکی تر دەڵێن ڕەشبینی وەک مەجاز بەکارهاتووە، ڕەشبینی بە خانوو لەبەر دراوسێی خراپە، وە بە ژن لەبەر منال نەبوونە، وە ئەسپ لەبەر جیهاد نەکردنە بەو ئەسپە جا لەبەر هەر سەبەبێک بێت.

سێیەم: هەندێکی تر دەڵێن فەرموودەی ابن عمر بە راشکاوانە ناڵێت ڕەشبینی لەئەمانەدا هەیە، بەڵکو دەڵێت ئەگەر هەبێت کەواتە ڕەشبینی لە هەموو شتێکدا حەڕامە بەڵام دەڵێن ئەی چ لە فەرموودەی ئەنەس دەکەیت کە روون ئاشکرایە؟! دەڵێین لەوانەیە لەبەر هۆکاری تر بێت کە فەرموودە باسی نەکردوە.

چوارەم: هەندێکی تر دەڵێن ئەم فەرموودەیە باسی ڕەشبینی دەکات بەم سێ شتانە منسوخە بە ئایەتی سورەتی حدید: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴿٢٢﴾﴾ [الحديد: ٢٢]، کەواتە ڕەشبینی بە هەموو شێوەیەک حەڕامە و شیرکە.

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (فەرموودەیە جێگیر بووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە دەفەرموێت: (الشؤم في ثلاث: في المرأة والبيت والدابة)، وفي لفظ آخر: (إن كان الشؤم ففي ثلاث)، ئەگەر مرۆڤ لە خێزانی خراپە و زیان ببینێت و زۆر بێت، یان لە ئەسپ و وشتر و گوێ درێژ یان شتی تری وەک ئەمانە کە ئازاری بدەن و زیانی بۆی هەبێت و لە عادەت دەرچوو بێت، یان لە شوێنێک دابەزی بێت و نیشتەجێ ببێت کە ناخۆشی و زیانی بەردەوام بێت، هیچ ڕێگریەک نیە لەو خانووە بچێتە خانوویەکی

تر، وه له ئەسپ و وشتریش جیاببێتەوه به فرۆشتن، وه له ئافرەتیش جیابێتەوه، لەبەر وتەی پێغەمبەر: (الشؤم في ثلاث: في المرأة والبيت والدابة)، وفي لفظ: (والفرس، الفرس من الدواب.)

هیچی تێدا نییه ئافرەت تەڵاق بدات ئەگەر زیانی زۆری هەبوو، یان ئاژەڵێک زیانی زۆری هەیه دروسته بیفرۆشیت یان به دیاری بیدەیته کەسێک، خانووش بەهەمان شێوه بفرۆشیت، یان بەکرێی بدات، هەموو ئەمانه هیچی تێدا نییه لەبەر ئەو فەرموودەیەی که باسمان کرد)[1].

وتەی ڕاست ڕەشبینی هەمووی زەم کراوه و هیچ شتێک له خانوو و ژن و ئەسپ سوود و زیان به مرۆڤ ناگەیەنن مەگەر به ئیزنی خوای گەوره، خوای گەوره مرۆڤ تاقی دەکاتەوه به ئافرەتی خراپ و مامەڵەی ناخۆش یان به خانووێک مرۆڤ تیایدا ماندوو بێت یان ڕزقی کەم بێت، دروسته بۆ مرۆڤ خۆی لێی ڕزگار بکات به هەڵاتن له قەدەری خوا بۆ قەدەری خوا نەوەک تووشی ڕەشبینی ببێت.

---

[1] نور على الدرب.

## باب ما جاء في التنجيم

**قال البخاري في "صحيحه": قال قتادة: خلق الله هذه النجوم لثلاث: زينة للسماء ورجوما للشياطين، وعلامات يهتدى بها. فمن تأول فيها غير ذلك اخطأ، وأضاع نصيبه، وتكلف ما لا علم له به. أ.هـ[1].**

**وكره قتادة تعلم منازل القمر، ولم يرخص ابن عيينة فيه، ذكره حرب عنهما، ورخص في تعلم المنازل أحمد وإسحاق.**

**وعن أبي موسى قال: قال رسول الله (ﷺ): (ثلاثة لا يدخلون الجنة: مدمن الخمر، وقاطع الرحم، ومصدق بالسحر) رواه أحمد وابن حبان في صحيحه[2].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** الحكمة في خلق النجوم.

**الثانية:** الرد على من زعم غير ذلك.

**الثالثة:** ذكر الخلاف في تعلم المنازل.

**الرابعة:** الوعيد فيمن صدق بشيء من السحر ولو عرف أنه باطل.

---

[1] أخرجه البخاري معلقا بصيغة الجزم في كتاب بدء الخلق باب (٣).

[2] أخرجه أحمد (٣٩٩/٤ رقم ١٩٥٦٩)، وابن حبان (٣٦٦/٧ رقم ٦١٣٧)، والحاكم (١٤٦/٤)، وضعفه الألباني في "الضعيفة" (١٤٦٣) ولبعض فقراته شواهد.

## باب ما جاء في التنجيم

## باسی ئەستێرەناسی و فەلەکناسی

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (علم التأثير دابەش دەبێت بۆ سێ بەش:

١- باوەڕت وابێت ئەم ئەستێرانە خۆیان کاریگەرن و بکەرن، واتە خۆیان شت دروست دەکەن، ئەمەیان شیرکی گەورەیە، چونکە هەر کەسێک بانگەشەی ئەوە بکات لەگەڵ خوا دروستکراوێکی تر هەیە ئەوا موشریکە بەخوا بە شیرکی گەورە.

٢- ئەستێرە دەکاتە هۆکار بۆ بانگەشە کردنی زانستی غەیب، جووڵە و نقل بوون و گۆڕنکاری ئەستێرە دەکاتە بەڵگە بەوەی کە فلانە شت ڕوودەدات، لە فلانە ئەستێرە فلانە شت دەبێت، ئەم مرۆڤە ژیانی بەدبەخت دەبێت چونکە لە فلانە ئەستێرە لەدایک بووە، ئەوەی تر ژیانی بەختەوەر دەبێت چونکە لەفلانە ئەستێرە لەدایک بووە، ئەمەیان زانستی ئەستێرەناسی کردۆتە وەسیلە بۆ بانگەشە کردنی زانستی غەیب، بانگەشە کردن بۆ زانستی غەیب کوفرە و پێ ی لەدین دەردەچێت، چونکە خوای گەوە دەفەرمووێت: ﴿قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ﴾ [النمل: ٦٥]، ئەمەیان بەهێزترین جۆرەکانی حصرە، چونکە بە نەفی و إثباتە، ئەگەر یەکێک بانگەشەی زانستی غەیب بکات، ئەوە قورئانی بەدرۆ خستۆتەوە.

٣- باوەڕی وایە هۆکارە بۆ ڕوودانی خێر و شەڕ، واتە ئەگەر شتێک ڕوویدا دەیداتە پاڵ ئەستێرە، هیچ شتێک ناداتە پاڵ ئەستێرە ئیلا دوای ڕوودانی و ئەمەیان شیرکی بچووکە)[1].

---

[1] القول المفيد.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (واتە: باسکردنی بەڵگە لەسەر حەڕامی ئەستێرەناسی و نەهی لێکردنی.

ئەستێرەناسی مەبەست پێی ئەوەیە باوەڕت وابێت ئەستێرە کاریگەری هەیە لەسەر زەوی و ڕووداوەکان، هەندێک جار مەبەست بە ئەستێرەناسی مانای ترە، دواتر باسی دەکەین بە تەفسیلی.

ئەمەیان بیروباوەڕی کۆن بووە لەناو قەومی نەمرود، ئەو قەومەی کە ئیبراهیم یان بۆ نێردرا (علیە السلام)، ئەوان صابیئە بوون ئەوانەی کە کەوکەبیان دەپەرست، هەیکەل وماڵی عیبادەتیان دروست دەکرد و باوەڕیان وابوو کاروباری عالەم بەڕێوە دەبەن، هەمیشە ئەم شەڕە هەبووە لە عالەم)[1].

[1] إعانة المستفيد (١٩/٢).

**قال البخاري في (صحيحه): قال قتادة: خلق الله هذه النجوم لثلاث: زينة للسماء ورجوما للشياطين، وعلامات يهتدى بها. فمن تأول فيها غير ذلك اخطأ، وأضاع نصيبه، وتكلف ما لا علم له به. أ.هـ**

واتە: قەتادە دەفەرمووێت: خوا ئەم ئەستێرانەی بۆ سێ حیکمەت دروست کردووە:

یەکەم: بۆ ڕازاندنەوەی ئاسمانی دونیا.

دووەم: بۆ ڕەجمی شەیتانەکان، ئەوانەی نهێنی ئاسمانەکان دەفڕێنن.

سێیەم: بۆ ئەوەی بکرێت بە نیشانە بەجۆرێک کاروانچی و موسافیرەکان ڕێگەی خۆیانیانی پێ بدۆزنەوە، جا هەر کەس بانگەشەی ئەوە بکات کە بێجگە لە ئەمانە بەکاردێن ئەوا تاوانێکی گەورەی کردووە و بەشی خۆی لە بەهەشت نەهێلاوە و بارێکی لەخۆی ناوە (کە زانستی غەیبە) و هیچی لێ نازانێت.

زانستی ئەستێرە ناسی دابەش دەبێت بۆ دوو جۆر:

یەکەم: (علم التأثير): زانستی کاریگەر، باوەڕت وابێت ئەستێرە کاریگەری هەیە لەسەر زەوی و ڕووداوەکان، کە ئەم سێ حاڵەتانەن:

أ- هەر کەسێک باوەڕی وابێت ئەستێرە فاعلە (بکەرە یان کارایە)، ئەمە شیرکی گەورەیە و شیرکە لە پەروەردگاریەتیدا، نموونە: دەڵێت ئەستێرە خۆی بارانی باراند یان ئەستێرە فڵانە شتی بەسەر فڵانە کەسدا هێنا.

ب- ئەگەر ئەستێرە بکاتە هۆکار بۆ بانگەوازی کردنی زانستی شاراوە (غیب)، ئەمە شیرکی گەورەیە، نموونە: فلانە کەس لە فلانە ئەستێرەدا لەدایک بووە، بەختەوەر دەبێت یان تووشی نەخۆشی دەبێت.

ج- ئەگەر باوەڕی وابێت فلانە ئەستێرە هۆکارە بۆ خێر و شەڕ، ئەگەر چی باوەڕی وابێت هەموو شتێکیش بەدەست خوایە ئەمە شیرکی بچووکە.

دووەم: (علم التسییر): ئەم زانستە دروستە کاری پێ بکەی بۆ دین و دونیا:

أ- بۆ دین: بە نموونە ئەستێرە دەکەیتە بەڵگە بۆ زانینی قیبلە و زانینی سێ یەکی شەو.

ب- بۆ دونیا: بۆ نموونە بۆ زانینی ڕێگاو شوێن و زانینی وەرزەکانی ساڵ، خەڵکانێک کشتوکاڵیان دەکرد لەکاتی هەڵاتنی فلانە ئەستێرە، هەندێک دەڵێن باش نیە بۆ ئەم مەبەستە بەکاربێت بۆ ئەوەی خەڵکانێک گومانیان بۆ ئەوە نەچێت ئەستێرەیە ساردی و گەرمی و هەوا دێنێت.

ابن ڕەجەب دەفەرموێت: (زانایانیش لەسەر زەوی ئەم سێ نیشانەیان تێدایە:

١- لە تاریکستانی دا خەڵک هیدایەت دەدەن.

٢- ئەوان مایەی جوانی و ڕازانەوەی دونیان.

٣- ئەوان ڕەجمی ئەو شەیتانانە دەکەن کە حەق و ناحەق تێکەڵ دەکەن)[1]

---

(1) فضل علم السلف علی علم الخلف.

**وكره قتادة تعلم منازل القمر، ولم يرخص ابن عيينة فيه، ذكره حرب عنهما، ورخص في تعلم المنازل أحمد وإسحاق.**

واتە: قەتادە فێربوونی مەنازلی مانگی بە مەكروهـ داناوە واتە: (بە حەرامی داناوە)، سفیان بن عیینە ڕوخسەتی پێ نەداوە، ئەمەش حەربی كوڕی ئیسماعیل لەوانەوە گێڕاویەتەوە، بەڵام ئیمام ئەحمەد و ئیسحاق ڕوخسەتیان پێداوە (بۆ زانینی كاتەكان).

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئایا دروستە فێری عیلمی منازلی قمر ببیت بۆ زانینی حیساب؟ دوو وتە هەیە:

وتەی یەكەم: هەندێک زانا بۆ ئەوە چوون نابێت، كە ئەمە وتەی سفیان بن عیینەیە، ئەگەر چی هیچی تێدا نییە بەڵام وەسیلەیە .

وتەی دووەم: هیچی تێدا نییە فێری منازلی مانگ ببیت، ئەمەیان پێی دەڵێن علمی تسییر، ئەمە مەزهەبی ئیمام ئەحمەد و ئیسحاق بن ڕاهویە و زۆرێک لە ئەهلی عیلمە.

ئەمە وتەی ڕاستە إن شاء الله، لەبەر ئەوە سوودی تێدایە و هیچی قەدەغە كراوی تێدا نییە، ئەوەی ڕێگری كراو بێت عیلمی تأثیرە، ئەویش ئەوەیە باوەڕی وابێت ئەستێرە كاریگەری لەسەر كەون هەیە، ئەمەیان قەدەغە كراوە، سەبارەت بە زانینی حسابات بۆ سوود بێ ئەوەی باوەڕی وابێت كاریگەری لەسەر كەون هەیە ئەمەیان هیچی تێدا نیە، هەمیشە زانایان خۆیان فێركردووە و خەڵكیشیان فێركردووە لەبەر چەندین سوودی گەورە)[1].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەوەی ڕاست بێت فێری بوونی منازلی قمر هیچی تێدا نییە، چونكە شیركی تێدا نییە، ئیلا ئەگەر باران بارین و ساردی

[1] إعانة المستفيد (٢/٢٢-٢٣).

بدەیتە پاڵی، ئەمەیان جۆرێکە لە جۆرەکانی شیرک، بەڵام تەنها زانینی کاتی بەهۆی منازل القمر بەوەی ئایا بەهارە یان پایزە یان زستانە، ئەمەیان هیچی تێدا نیە)[١].

---

[١] القول المفید.

**وعن أبي موسى قال: قال رسول الله (ﷺ): (ثلاثة لا يدخلون الجنة: مدمن الخمر، وقاطع الرحم، ومصدق بالسحر) رواه أحمد وابن حبان في صحيحه.**

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەری دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (سێ کەس ناچنە بەهەشتەوە:

١- ئەو کەسەی بەردەوام مەی دەخواتەوە.

٢- ئەو کەسەی کە باوەڕ بە ساحیر دەکات (جۆرێکیان ئەستێرەناسی یە).

٣- ئەو کەسەش کە پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕێنێت).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(ثلاثة لا يدخلون الجنة):** واتە: سێ کەس ناچنە بەهەشتەوە، مەبەستی فەرموودەکە حصر نییە، چونکە کەسی تریش هەن ناچنە بەهەشت هەروەک لە فەرموودەکان باسکراوە.

**(مدمن خمر):** واتە: ئەو کەسەی زۆر عەرەق دەخواتەوە بە بەرەوامی.

**(ومصدق بالسحر):** ئەو کەسەی کە باوەڕ بە ساحیر دەکات، زانستی ئەستێرەناسیش جۆرێکە لە جۆرەکانی سیحر.

**(قاطع الرحم):** واتە: ئەو کەسەی پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕێنێت.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە چونکە زانستی ئەستێرەناسی جۆرێکە لە سیحر، هەرکەسێک بەڕاستی دابنێت ئەوە جۆرێکی سیحری بەڕاست داناوە.

**سـوودەكانی فەرموودەكە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بەڕاست دانەری سیحر ناچێتە بەهەشت، هەروەها زانستی ئەستێرەناسی جۆرێكە لە جۆرەكانی سیحر، بەڕاست زانین یان باوەڕكردن بە ئەستێرەناسی سێ جۆری هەیە:

١- (تصديق بالقلب): بەڕاست دانان بە دڵ: ئەویش ئەوەیە باوەڕی وابێت كە ئەسێرەناسەكە ڕاست دەكات.

٢- (تصديق اللسان): بەڕاست دانان بە زمان: ئەویش ئەوەیە كە ئەستێرەناسەكە بڵێت لەمەودوا فلانە شت و فلانە شت ڕوودەدات، ئەمیش بە زمان شتێك بڵێت كە مانای ئەوە بدات كە باوەڕی كردووە بە ئەستێرە ناسەكە، ئەمەش هەر كافر دەبێت.

٣- (تصديق الجوارح): بەڕاست دانان بە ئەندامەكانی لاشە: ئەمەش ئەوە دەگرێتەوە كە بە پێی وتەی ئەستێرەناسەكە بجووڵێتەوە.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر كەسێك یەكێك لەم سێ شتانە بكات ناچێتە بەهەشت، بەڵام ئەگەر عەرەقی خواردەوە و پەیوەندی خزمایەتی بڕی بەم كردەوەیە كافر نابێت، لەوانەیە مەبەست پێی ئەوە بێت یەكسەر ناچێتە بەهەشت تا بە گوێرەی تاوانی خۆی سزا دەدرێت، پاشان دەچێتە بەهەشت.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بەم فەرموودەیە و فەرموودەی تری وەك ئەمانە:

وتەی یەكەم: موعتەزیلە و خەوارج مەزهەبیان ئەوەیە بەم تاوانە لە ئیمان دەرچووە، بەڵام خەوارج دەڵێن كافرە و موعتەزیلەش دەڵێن لەنێوان دوو پلە دایە، هەردووكیان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی لە دۆزەخ هەتا هەتایی دەبێت.

وتەی دووەم: ئەم وەعیدە بۆ ئەو کەسەیە کە ئەم کردەوەیە حەڵاڵ دەکات، بەڵگە: زۆر دەق هاتوون بەڵگەن لەسەر ئەوەی هەر کەسێک ئیمانی لە دڵدا بێت ئەگەر چی کەمیش بێت دەبێت هەر بچێتە بەهەشت، ئەم وتەیە ڕاست نییە، چونکە ئەوەی حەڵاڵی دەکات کافرە ئەگەر چی بە کردەوەش نەیکات، هەر کەسێک پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی و خواردنەوەی عەرەق بە حەڵاڵ بزانێت ئەوا کافرە ئەگەر چی پەیوەندی خزمایەتیش بەجێبێنێت وعەرەقیش نەخواتەوە.

وتەی سێیەم: ئەمەیان لە بابەتی فەرموودەی وەعیدن، لەسەری دەڕۆین هەروەک چۆن هاتووە، بەم شێوەیەی خوا و پێغەمبەر فەرموویانە، ئێمەش بێ دەنگ دەبین.

وتەی چوارەم: ئەم نەفی یە مطلقە، نفی مطلق يحمل على المقيد، دەوترێ: واتە ناچنە بەهەشت بە چوونی مطلق، واتە دەچنە بەهەشت بەڵام سەرەتا تووشی سزا دەبن بە گوێرەی تاوانی خۆیان، پاشان دوا شوێنیان بەهەشتە.

ئیحتیمالێکی تریش هەیە: هەر کەسێک ئەمە حاڵی بێت خاتیمەی خراپ دەبێت و بەکافری دەمرێت)[١].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بڕینی پەیوەندی خزمایەتی تاوانێکە لە تاوانە گەورەکان، چونکە وەعیدێکی توندی لەسەر هاتووە.

هەموو زانایان یەک دەنگن کە گەیاندنی سیلەی ڕەحم واجبە، بەڵکو جیاوازی لەوەدایە ئایا ئەوانە کێن کە واجبە سیلەی ڕەحمیان بگەیەنی، سێ وتە هەیە:

---

[١] القول المفيد.

یەکەم: هەندێ زانا دەڵێن ئەوانەی واجبە سیلەی ڕەحمیان بگەیەنی مەحرەمن، وەک: باوک و دایک، خوشک و برا، باپیر و داپیر، مناڵ و مناڵی مناڵ، مام و پور، خاڵ و خاڵەت (پوور)، کە ئەمە وتەی بەناوبانگی حەنەفی و مالکی یە، بەڵگە:

١- عن أبي هريرة أن رسول الله (ﷺ) قال: (لا يجمع بين المرأة و عمتها، ولا بين المرأة و خالتها)[1].

واتە: (ژن و پورەکەی پێکەوە کۆناکرێتەوە جا خوشکی دایکی بێت یان باوکی واتە: کاتێک لە ژیاندا بن پێکەوە خێزانی یەک پیاو بن حەڕامە بەڵام پاش مردنی حەڵاڵە).

لەم فەرموودەیە ڕێگری کراوە ئافرەتێک بهێنی لەگەل پووری بۆ ئەوەی پەیوەندی نیوانیان نە پچڕێت، ئەمە بەڵگەیە کە واجبە سیلەی ڕەحم بگەیەنێت، بەڵام بێجگە لە مەحرەمەکان گەیاندنی سیلەی ڕەحم واجب نییە، چونکە دروستە پێکەوە کۆیان بکەیتەوە و خێزانی یەک پیاو بن، وەک: مناڵی خاڵ و خاڵەت (پوور).

دووەم: هەندێ زانای تر دەڵێن ئەوانەی کە واجبە سیلەی ڕەحمیان بگەیەنی ئەوانەن کە میرات وەردەگرن بێجگە لەمانە واجب نیە، کە ئەمە وتەی قاضي عياض و ئیمام النووي یە، بەڵگە:

٢- ابو هريرة دەفەرمووێت: پیاوێک وتی ئەی نێردراوی خوا کێ لە هەمووان لە پێشترە چاکەی لەگەڵ بکەم، وتی: (دایکت، پاشان دایکت، پاشان دایکت، پاشان باوکت، پاشان ئەوانەی دواتر)[2].

---

[1] رواه البخاري (٥١٠٩)، مسلم (١٤٠٨).
[2] رواه البخاري (٥٨٧١)، مسلم (٢٥٤٨).

سێیەم: هەندێ زانای تر دەڵێن ئەوانەی کە واجبە سیلەی ڕەحمیان بگەیەنیت نزیکەکانن جا میراتی وەربگرێت یان وەرنەگرێت، مەحرەم بێت یان مەحرەم نەبێت، کە ئەمە وتەی بەناوبانگی مالکی و وتەیەکە لە وتەکانی حەنەفی، هەروەها ڕوکەشی وتەی شافعی یە و وتەیەکە لە وتەکانی ئەحمد، بەڵگە:

١- ئەو بەڵگانەی هاتوون باسی سیلەی رەحم دەکەن گشتین، کەواتە هەموو نزیکەکان دەگرێتەوە.

وتەی ڕاست وتەی یەکەمە واجبە سیلەی ڕەحم بۆ مەحرەمەکان بگەینیت و بێجگە لە مەحرەمەکان سوننەتە، چونکە:

١- زانایان دەڵێن شەرع نایەوێت سیلەی ڕەحم بگەیەنێت بۆ هەموو نزیکەکان، چونکە ئەگەر وابێت دەبێت سیلەی ڕەحم بگەیەنیت بۆ هەموو نەوەی ئادەم، کەواتە دەبێت ڕێگایەک هەبێت بۆ دیارکردنی پلەی خزمایەتی و پلەشیان جیاواز بێت.

٢- ئەگەر بڵێیت تەنها سیلەی ڕەحمی میراتگر واجبە بیگەیەنیت ئەمەیان ڕاست نییە، چونکە ئەگەر وابێت گەیاندنی سیلەی ڕەحم بۆ خاڵ و خالەت "پور" واجب نیە، کەچی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (خالەت "پور" لە جێگای دایکە).

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بەردەوام خواردنەوەی عەرەق یەکێکە لە تاوانە گەورەکان و چەندین وەعید هاتوون لەسەر ترسناکی عەرەق خواردنەوە.

## باب ما جاء في الاستسقاء بالأنواء

وقول الله تعالى: ﴿وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ﴾ {الواقعة:٨٢}.

عن أبي مالك الأشعري رضي الله عنه أن رسول الله (ﷺ) قال: (أربعة في أمتي من أمر الجاهلية لا يتركوهن: الفخر بالأحساب، والطعن في الأنساب، والاستسقاء بالنجوم، والنياحة) وقال: (النائحة إذا لم تتب قبل موتها تقام يوم القيامة وعليها سربال من قطران ودرع من جرب). رواه مسلم[(١)].

ولهما عن زيد بن خالد رضي الله عنه قال: صلى لنا رسول الله (ﷺ) صلاة الصبح بالحديبية على إثر سماء كانت من الليل، فلما انصرف أقبل على الناس فقال: (هل تدرون ماذا قال ربكم؟) قالوا: الله ورسوله أعلم. قال: (قال: أصبح من عبادي مؤمن بي وكافر، فأما من قال: مطرنا بفضل الله ورحمته، فذلك مؤمن بي كافر بالكوكب، وأما من قال: مطرنا بنوء كذا وكذا، فذلك كافر بي مؤمن بالكواكب)[(٢)].

ولهما من حديث ابن عباس بمعناه وفيه قال بعضهم: لقد صدق نوء كذا وكذا، فأنزل الله هذه الآيات: ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ﴾ إلى قوله: ﴿وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ﴾ [(٣)]

### فيه مسائل:

---

(١) أخرجه مسلم (٩٣٤).

(٢) أخرجه البخاري (٨٤٦)، ومسلم (٧١).

(٣) أخرجه مسلم (٧٣)، ولم نقف على تخريج البخاري.

**الأولى:** تفسير آية الواقعة.

**الثانية:** ذكر الأربع من أمر الجاهلية.

**الثالثة:** ذكر الكفر في بعضها.

**الرابعة:** أن من الكفر ما لا يخرج عن الملة.

**الخامسة:** قوله: (أصبح من عبادي مؤمن بي وكافر) بسبب نزول النعمة.

**السادسة:** التفطن للإيمان في هذا الموضع.

**السابعة:** التفطن للكفر في هذا الموضع.

**الثامنة:** التفطن لقوله: (لقد صدق نوء كذا وكذا).

**التاسعة:** إخراج العالم للمتعلم المسألة بالاستفهام عنها، لقوله: (أتدرون ماذا قال ربكم؟).

**العاشرة:** وعيد النائحة.

## باب ما جاء في الاستسقاء بالأنواء

## باسی هەر كەسێ باوەڕی وابێت كە ئەستێرە و جوولەی ئەستێرەكان هۆكاری باران بارینن

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (مناسبەی هێنانەوەی ئەم بابە لەگەڵ بابی پێشوو: (استسقاء) بە ئەستێرەكان جۆرێكە لە ئەستێرەناسی، چونكە بارانی داوەتە پاڵ ئەستێرە, هەروەها سیحریشە، چونكە ئەستێرەناسی سیحرە بە مانای گشتی.

مناسبەی هێنانەوەی ئەم بابە لە كتابی تەوحید ئەوەیە: ئەوەی باران و نیعمەت دەداتە پاڵ ئەستێرە لە كاتی بارینی باران، ئەوا دڵی ڕووی لە خوا لاداوە بۆ لایەكی تر، پەیوەستە بە بێجگە لەخوا، نیعمەت دانە پاڵ بێجگە لەخوا و باوەڕت وابێت ئەستێرە هۆكاری بارینی باران و شتی ترە، ئەمە نەفی تەواوی تەوحید دەكات)[1].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: ((استسقاء) بە ئەستێرە دوو بەشە:

بەشی یەكەم: شیركی گەورە:

١- داوا لە ئەستێرە دەكات بۆ باران بارین، وەك ئەوەی بڵێت: ئەی فلانە ئەستێرە بارانمان بۆ ببارێنە، ئەمەیان شیركی گەورەیە، چونكە دوعای لە بێجگە لە خوا كردووە.

٢- بارینی باران دەداتە پاڵ ئەم ئەستێرانە، ئەستێرەی بە فاعل داناوە و باوەڕی وایە خودی ئەستێرەكە بارانی باراندووە، ئەمەیان شیركی گەورەیە لە پەروەردگاریەتی دا، هی یەكەم شیركە لە بەندایەتی كردن دا، چونكە دوعا عیبادەتە.

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٣٣٧).

بەشی دووەم: شیرکی بچووک، باوەڕی وایە ئەم ئەستێرانە هۆکارن بۆ باران بارین، لەگەڵ ئەمەش باوەڕی وایە خوای گەورە خالقە و فاعلە، چونکە هەر شتێک بکاتە هۆکار و خوای گەورەش بە هۆکاری دانەنابێت نە بە وەحی و نە بە قەدەر ئەوا موشریکە بە شیرکی بچووک)[١].

[١] القول المفيد.

**وقول الله تعالى:** ﴿وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ﴾ {الواقعة:٨٢}.

واتە: ئێوە لەجیاتی ئەوەی سوپاسی خوا بكەن كە ڕزقی بۆتان باراندووە، دەڕۆن درۆ دەكەن بەو جۆرەی كە نالێن ئەمە ڕزقی خوایە و دەڵێن بەهۆی جوولەی فلانە ئەستێرەوە بارانمان بۆ باری.

**ڕاڤەی وشەكانی ئایەتەكە:**

﴿رِزْقَكُمْ﴾: رزق لێرە مەبەست پێی بارانە.

﴿تُكَذِّبُونَ﴾: بەدرۆ خستنەوەیە, ئەویش دوو جۆرە:

١- بەدرۆخستنەوە بە زمان، وەک ئەوەی بڵێت ئەمە درۆیە، یان بڵێت باران لە ئەستێرەوەیە.

٢- بەدرۆخستنەوەی حاڵ، وەک ئەوەی ئەستێرە بە گەورە دابنێت و باوەڕی وابێت ئەوە هۆكارە.

**هۆكاری باسكردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری كتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسكردووە تاوەكو ڕوونی بكاتەوە نابێت بارینی باران بدەیتە پاڵ شتی تر بێجگە لەخوا.

**سوودەكانی ئایەتەكە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە حەڕامە نیعمەتی باران بارین بدەیتە پاڵ ئەستێرەكان، ئەگەر باوەڕی وابێت ئەستێرە خۆی باران دەبارێنێت، ئەمەیان كوفری گەورەیە و شیركی گەورەیە و لە دین دەردەچێت.

بەڵام ئەگەر باوەڕی وابێت باران بە فەرمانی خوا و تەقدیری خوا دەبارێت، بەڵام دەیداتە پاڵ ئەستێرە، یان دەیداتە پاڵ هەڵاتن و ئاوابوون لە بابی مجاز یان هۆکار، ئەمەیان کوفری بچووکە و شیرکی بچووکە بەڵام هۆکارە بۆ شیرکی گەورە)[1].

[1] إعانه المستفيد (٣٢/٢).

**عن أبي مالك الأشعري رضي الله عنه أن رسول الله (ﷺ) قال: (أربعة في أمتي من أمر الجاهلية لا يتركوهن: الفخر بالأحساب، والطعن في الأنساب، والاستسقاء بالنجوم، والنياحة) وقال: (النائحة إذا لم تتب قبل موتها تقام يوم القيامة وعليها سربال من قطران ودرع من جرب). رواه مسلم.**

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەری دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (چوار شت هەن لەناو ئوممەتەکەم دا کاری جاهیلی و نەفامین و تەرکیشی ناکەن:

یەکەم: فەخر کردن بە کاری باب و باپیرانەوە و کەسانی نزیک.

دووەم: تانەدان لە نەسەبی خەڵکی.

سێیەم: باوەڕ بوون بەوەی کە ئەستێرەکان و جووڵەیان سەبەبی باران بارینن.

چوارەم: شیوەن کردن بۆ مردوو.

فەرمووی: ژنی شیوەنگێڕ ئەگەر پێش مەرگی تەوبە نەکات ئەوا بەو حاڵە زیندوو دەکرێتەوە کە پۆشاکێکی پڕ بە باڵای لەبەردەکرێت کە مسی تواوەیە لەگەڵ کراسێکی درێژی گەڕ و گول، واتە: گەڕی و گوڵێ هەموو لاشەیان دادەپۆشێت).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(أربع):** ئەم چوار شتە حصر نیە، چونکە شتی تریش هەن کاری جاهیلین.

**(جاهلية):** واتە: پێش ناردنی پێغەمبەر، چونکە لەسەر نەزانین و گومڕایی بوون.

**(الفخر بالأحساب):** واتە: فەخر کردن بە کاری باب و باپیرانەوە و کەسانی نزیک، وەک ئەوەی بڵێت: من لە نەوەی هاشمم و فەخری پێوە بکات، یان لە بەرەبابێک بووە بەناوبانگن بە زیرەکی.

**(والاستسقاء بالنجوم):** واتە: باوەڕبوون بەوەی کە ئەستێرەکان و جووڵەیان سەبەبی باران بارینن.

**(والنياحة):** واتە: شیوەن کردن بۆ مردوو.

**(سربال):** واتە: جلێکە هەموو لاشەی داپۆشیووە.

**(قطران):** واتە: مسی تواوە.

**(جرب):** نەخۆشییەکە لە پێست دێت.

### هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی هێناوەتەوە تاوەکو ڕوونی بکاتەوە باوەڕبوون بەوەی کە ئەستێرەکان و جووڵەیان هۆکاری باران بارینن لە کاری جاهیلی و نەفامی یە.

### سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیر بوونی ڕیسالەی پێغەمبەر (ﷺ)، چونکە خەبەری داوە بە شتی غەیبی و ڕوویداوە هەروەک چۆن گوتوویەتی[1].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ خۆ دورخستنەوە لەم چوار شتە.

---

[1] القول المفيد (٢/١٥٠-١٥٢).

یەکەم: فەخر کردن بە کاری باب و باپیران و کەسانی نزیک.

دووەم: تانەدان لە نەسەبی خەڵکی.

سێیەم: باوەڕبوون بەوەی کە ئەستێرەکان و جووڵەیان سەبەبی باران بارینن.

چوارەم: شیوەن کردن بۆ مردوو[1].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نیاحە لە تاوانە گەورەکانە، زانایان دەڵێن نیاحە: دەنگ بەرز کردن و گریانە بە دەنگی بەرز و هاوار کردن و لەخۆدان و قژ دەرهێنان و وتنی قسەی هەڵە و ئارام نەگرتنە و یەکێکە لە تاوانە گەورەکان.

ئیمام النووی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (نیاحە و لە ڕوومەت دان و جل و بەرگ دڕاندن و دەست لە ڕوخسار دان و قژ دەرهێنان و دوعا کردن بە وەیل و هاوار، هەموویان حەڕامن بەیەک دەنگی هاوەڵان، زۆربەی زانایان بە ڕوونی دەڵێن حەڕامە، هەندێ زانا یەک دەنگی هەموو زانایان نەقل دەکەن کە نیاحە حەڕامە)[2].

زیانەکانی نیاحە:

١- هیچ بۆ نائح (واتە: ئەوەی شیوەن دەکات) زیاد ناکات ئیلا خەم و خەفەت و دڵ تەنگی نەبێت.

٢- ناڕازی یە بە قەدەری خوای گەورە و پشتی تێکردوە و ئارام گرتنی کەمە، هەروەک ئەوە وایە نائحە بڵێت: نابێت ئەو کەسە مردبا یان ئاوای کردبا یان هێشتا کات مابوو ...

---

[1] القول المفيد (٢/١٥٠-١٥٢).

[2] شرح المهذب (٥/٢٨١).

٣- خەڵکی تریش هان دەدات و خەم و خەفەت بڵاو دەکاتەوە.

٤- نائحە مردوو ئازار دەدات، چونکە مردوو هەست بە ئازار دەکات هەروەک فەرموودە هاتووە.

٥- لەگەڵ ئەم هەموو زیانانە ئەوەی بەسەری هاتووە لاناچێت بەم نیاحە کردنە.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نیاحە لە تاوانە گەورەکانە، لەبەر ئەوە وەعیدی لەسەر هاتووە بۆ ئاخیرەت، هەموو تاوانێک وەعیدی لەسەر هاتبێت بۆ ئاخیرەت ئەوا لە تاوانە گەورەکانە)[١].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە تاوانی گەورە بە کردەوەی باش لاناچێت دەبێت تەوبە بکات لەسەر وتەی زۆربەی زانایان.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە تاوانی گەورە بە کردەوەی باش لاناچێت، لەبەر وتەی: (إذا لم تتب قبل موتها))[٢].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە مەرجی تەوبە ئەوەیە دەبێت پێش مردن بێت، لەبەر وتەی: (فإن لم تتب قبل موتها)[٣].

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی پاداشت و زیندووبوونەوە[٤].

---

[١] القول المفيد (٢/١٥٠-١٥٢).
[٢] القول المفيد (٢/١٥٠-١٥٢).
[٣] القول المفيد (٢/١٥٠-١٥٢).
[٤] القول المفيد (٢/١٥٠-١٥٢).

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە پاداشت لە جنسی کردەوەیە[١].

**٨-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کاروباری جاهیلی بە یەکجاری لاناچن، بەڵکو هەندێکیان لەناو موسڵمانان دەمێننەوە[٢].

**٩-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە تەوبە ئەوەی پێشووتر ڕەش دەکاتەوە[٣].

**١٠-** لەم فەرموودەیە باسی ئافرەتی کردووە بەڵام پیاویش دەگرێتەوە، چونکە ئەم سیفەتە لە ئافرەتان زیاترە بۆیە باسی ئافرەتی کردووە.

---

[١] القول المفيد (٢/١٥٠-١٥٢).
[٢] إعانة المستفيد (٢/٣٧).
[٣] إعانة المستفيد (٢/٣٨).

**ولهما عن زيد بن خالد رضي الله عنه قال: صلى لنا رسول الله (ﷺ) صلاة الصبح بالحديبية على إثر سماء كانت من الليل، فلما انصرف أقبل على الناس فقال: (هل تدرون ماذا قال ربكم؟) قالوا: الله ورسوله أعلم. قال: (قال: أصبح من عبادي مؤمن بي وكافر، فأما من قال: مطرنا بفضل الله ورحمته، فذلك مؤمن بي كافر بالكوكب، وأما من قال: مطرنا بنوء كذا وكذا، فذلك كافر بي مؤمن بالكواكب).**

واتە: لە زەیدی کوڕی خالد دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێش نوێژی بەیانی بۆ کردین، ئەمەش لە حودەیبیە بوو لە پاش بارانی شەو، جا کاتێ سەلامی دایەوە ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: (ئایا ئێوە دەزانن پەروەردگارتان چی فەرمووە؟)

ئەوانیش گوتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی دەزانن.

فەرمووی: (خوا فەرمووی هەندێک لە بەندەکانم سپێدەیان بەسەردا هات و ئیمانیان بەمن هێنا و هەندێکیشیان کافر بوون، جا ئەوەی بە دڵ و بە دەم گوتی: بە فەزڵ و ڕەحمەتی خواوە بارانمان بۆ باری، ئەوە ئیمانی بە من هێناوە و کافر بووە بە ئەستێرەکان، بەڵام ئەوەی گوتی بەهۆی هەڵاتن یان ئاوابوونی ئەستێرەکانەوە بارانمان بۆ باری، ئەوا کافر بووە بە من و ئیمانی بە ئەستێرەکان هێناوە).

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(صلى لنا):** واتە: پێش نوێژی بۆ ئێمە کرد.

**(بالحديبية):** واتە: لە حودەیبیە، دوو لغەی هەیە، بە تخفيف و تشديد، ناوی بیرێکە، وتراوە: ئەصلەکەی دارێک بووە لە حدباء پێی دەڵێن حودەیبیە، زۆرینە بۆ ئەوە چوون ناوی بیرێکە.

**(سماء):** واتە: مەبەست پێی بارانە.

**(فأما من قال: مطرنا بفضل الله ورحمته):** واتە: بە دڵ و زمان بڵێت، باء للسببية.

### هۆكاری باسكردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری كتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی هێناوەتەوە تاوەكو ڕوونی بكاتەوە حەڕامە باران بدەیتە پاڵ ئەستێرە و كوفرە بەخوا و شیركە.

### سوودەكانی فەرموودەكە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە ئامۆژگاری بخوێندرێت دوای نوێژ بە تایبەتی ئەگەر مناسبەیەک هەبێت یان ڕوویدا بێت، گومانی تێدا نییە دوای تەواو بوون لە نوێژ سوننەتە استغفار بكرێت سێ جار، وە دەڵێیت: (اللهم أنت السلام و منك السلام، تباركت يا ذا الجلال والإكرام).

پاشان زیكری خوا دەكەیت بەوەی كە سوننەت پێی هاتووە ئەمەیان ئەصلە، بەڵام ئەوانەی قسە دەكەن بەو فەرموودانەی لە كتابەكانی پێشینەكان نووسراون، یان لە پارچە كاغەزێک نووسراوە فەرموودەی بەسوود، دەست پێشخەری دەكەن و قسە دەكەن لەترسی ئەوەی خەڵک دەربچێت، لەم حاڵەتە دەتوانێ ئامۆژگاری بكات، ئەگەر بزانێت خەڵک دەمێنێتەوە باشتر وایە خەڵک زیكری دوای نوێژ بكەن، پاشان ئامۆژگاری خەڵک بكات.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە ئامۆژگاری بخوێندرێت دوای نوێژ بە تایبەتی ئەگەر مناسبەیەک هەبێت یان ڕوویدا بێت)[1].

[1] إعانة المستفيد (٤٢/٢).

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەرامە باران بدەیتە پاڵ ئەستێرە، باران دانە پاڵ ئەستێرە دابەش دەکرێت بۆ سێ بەش:

١- باران دانە پاڵ خودی ئەستێرەکە کە خۆی فاعلە، ئەمەیان شیرکە.

٢- باران دانە پاڵ ئەستێرە وەک سەبەب، ئەمەیان شیرکی بچووکە.

٣- باران دانە پاڵ کات ئەمەیان دروستە، باران باری لەناو فلانە ئەستێرە، واتە کات.

سەبارەت بە گوتنی: (مطرنا بنوء كذا)، زانایان دەڵێن حەرامە ئەمە بڵێیت، دروستە بڵێیت: (مطرنا في نوء كذا وكذا)، جیاوازی نێوانیان (باء للسببية)، وە )في للظرفية)، پاشان ئەهلی عیلم دەڵێن: ئەگەر بڵێیت: (مطرنا بنوء كذا)، وە باء بۆ ظرفية بێت ئەمە دروستە، ئەمەیان ڕووی هەیە بۆ مانا بەڵام لە لفظ ڕووی نییە، لفظي فەرموودەکە: (من قال: مطرنا بنوء كذا)، باء بۆ سەبەب دیارترە لە ظرفي ئەگەر چی بە مانای ظرفیش دێت.

بە هەرحاڵ ئەوەی نزیک بێت نابێت ئەگەر چی مەبەستی ظرفیشی هەبێت، بەڵام ئەگەر ئەوەی قسە دەکات وابزانێت باء تەنها بۆ ظرفية دێت، گومان نەبات کە بە مانای سەبەبیش دێت ئەمە دروستە، لەگەڵ ئەمەش باشتر وایە بڵێیت: (في نوء كذا)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (باران دانە پاڵ ئەستێرە کوفرە بەخوا و شیرکە، وە نیعمەت دانە پاڵ خوا و باران دانە پاڵ خوا ئیمانە و تەوحیدە)[2].

---

[1] القول المفيد.

[2] إعانة المستفيد (٢/٤٢-٤٣).

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ نوێژ کردن بە جەماعەت لە سەفەر هەروەک چۆن لە حضر دەکرێت[١].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فێرکردن بە ڕێگای پرسیار و وەڵام، چونکە باشترە بۆ تێگەیشتن و ئاسانترە بۆ فێربوون.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فێرکردن بە ڕێگای پرسیار و وەڵام، چونکە باشترە بۆ تێگەیشتن و ئاسانترە بۆ فێربوون، پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی کردووە چەندین جار و دووبارەی کردۆتەوە)[٢].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە کاتی باران بارین ئەم وتەیە بڵێیت: (مطرنا بفضل الله وبرحمته)، هەروەک پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی گوتوە و دەیگوت: (اللهم صيبا نافعا))[٣].

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە خوای گەورە قسە دەکات، سیفەتی قسە ثابتە بۆ خوای گەورە.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموێت: (وتەی: "قال" بەڵگەیە خوای گەورە قسە دەکات، سیفەتی قسە ثابتە بۆ خوای گەورە، قسە دەکات هەر کاتێک بیەوێت بەڵام وەک قسەی دروستکراوەکان نیە)[٤].

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە فەزڵ و ڕەحم دوو سیفەتی خوای گەورەن.

---

[١] إعانة المستفيد (٤٢/٢).

[٢] إعانة المستفيد (٤٢/٢).

[٣] إعانة المستفيد (٤٣/٢).

[٤] إعانة المستفيد (٤٢/٢-٤٣).

**٨-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە سوننەتە ئیمام ڕوو لە خەڵک بکات دوای سەلام دانەوە لە نوێژ, زانایان دەڵێن سوننەتە ئیمام کاتێک لە نوێژ دەبێتەوە ڕوو لە خەڵک بکات، بەڵگە:

١- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ رضى الله عنه قَالَ: (كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا صَلَّى صَلاَةً أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ)[١].

٢- عَنِ الْبَرَاءِ رضى الله عنه قَالَ: (كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا خَلْفَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَحْبَبْنَا أَنْ نَكُونَ عَنْ يَمِينِهِ يُقْبِلُ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ)[٢].

ابن القيم ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (پێغەمبەر (ﷺ) کاتێک سەلامی دەداوە سێ جار استغفاری دەکرد، وە دەیگووت: (اللهُمَّ أَنْتَ السَّلاَمُ ومنكَ السلاَمُ تَبَارَكْتَ يَا ذَا الجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ)، ڕووەو قیبلە نەدەماوە مەگەر بەقەد ماوەی ئەم زیکر گوتنە، بەڵکو پەلەی دەکرد ڕوو لە نوێژکەرەکان بکات، ڕووی لە ڕاست و چەپ دەکرد)[٣].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (باشتر وایە ئیمام کەمێک ڕووی لە قیبلە بێت دوای سەلام دانەوە بە قەدەر سێ جار گوتنی استغفر الله و گوتنی: (اللهم أنت السلام، ومنك السلام، تباركت يا ذا الجلال والإكرام)، پاشان بسوڕێتەوە ڕوو لە نوێژکەرەکان بکات)[٤].

---

[١] رواه البخاري (٨٤٥).
[٢] رواه مسلم (٧٠٩).
[٣] زاد المعاد (٢٩٥/١).
[٤] مجموع فتاوى ابن عثيمين (٢٣٩/١٣).

کەواتە سوننەتە ڕوو لە نوێژخوێنان بکرێت جا ڕوو لە لای ڕاست بکەیت یان چەپ یان ناوەڕاست.

**ولهما من حديث ابن عباس بمعناه وفيه قال بعضهم: لقد صدق نوء كذا وكذا، فأنزل الله هذه الآيات:** ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ﴾ إلى قوله: ﴿وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ﴾ [(١)]

واتە: موسلیم لە فەرموودەی ابن عباس دا هێناویەتی کە هەمان مانای هەیە تیایدا هاتووە هەندێک گوتیان: جوولەی فلانە ئەستێرە ڕاست دەرچوو، بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرمووێت: ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ﴾ إلى قوله: ﴿وَتَجْعَلُنَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ﴾.

---

[(١)] أخرجه مسلم (٧٣)، ولم نقف على تخريج البخاري.

## باب قول الله تعالى:
## ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللّهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللّهِ﴾ {البقرة: ١٦٥}.

**وقوله:** ﴿قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ﴾. إلى قوله تعالى: ﴿أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ﴾ {التوبة:٢٤}

**عن أنس رضي الله عنه، أن رسول الله (ﷺ) قال: (لا يؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه من ولده ووالده والناس أجمعين ) أخرجاه[١].**

**ولهما عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (ثلاث من كن فيه وجد بهن حلاوة الإيمان: أن يكون الله رسوله أحب إليه مما سواهما، وأن يحب المرء لا يحبه إلا لله، وأن يكره أن يعود في الكفر بعد إذ أنقذه الله منه كما يكره أن يقذف في النار)[٢].**

**وفي رواية: (لا يجد أحد حلاوة الإيمان حتى .. ) إلى آخره[٣].**

**وعن ابن عباس رضي الله عنهما قال: من أحب في الله، وأبغض في الله، ووالى في الله، وعادى في الله، فإنما تنال ولاية الله بذلك، ولن يجد عبد طعم الإيمان وإن كثرت صلاته**

---

[١] متفق عليه: أخرجه البخاري (١٥)، ومسلم (٤٤).
[٢] متفق عليه: أخرجه البخاري (١٦)، ومسلم (٤٣).
[٣] عند البخاري (٦٠٤١).

**وصومه حتى يكون كذلك. وقد صارت عامة مؤاخاة الناس على أمر الدنيا، وذلك لا يجدي على أهله شيئا. رواه بن جرير[1].**

**وقال ابن عباس في قوله تعالى: ﴿وتقطعت بهم الأسباب﴾ قال: المودة[2].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير آية البقرة.

**الثانية:** تفسير آية براءة.

**الثالثة:** وجوب محبته صلى الله عليه وسلم على النفس والأهل والمال.

**الرابعة:** أن نفي الإيمان لا يدل على الخروج من الإسلام.

**الخامسة:** أن للإيمان حلاوة قد يجدها الإنسان وقد لا يجدها.

**السادسة:** أعمال القلب الأربعة التي لا تنال ولاية الله إلا بها، ولا يجد أحد طعم الإيمان إلا بها.

**السابعة:** فهم الصحابي للواقع: أن عامة المؤاخاة على أمر الدنيا.

**الثامنة:** تفسير: ﴿وتقطعت بهم الأسباب﴾.

---

[1] أخرجه ابن المبارك في "الزهد" (١٢٠/١)، وابن أبي الدنيا في "الإخوان" (ص٦٩ رقم ٢٢)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد أهل السنة" (٩٣٦/٥ رقم ١٦٩١) ولم نقف عليه عند ابن جرير.

[2] أخرجه ابن جرير في "التفسير" (٧١/٢)، والحاكم (٢٧٢/٢)، وابن أبي حاتم (٢٧٨/١ رقم ١٤٩٢).

**التاسعة:** أن من المشركين من يحب الله حبا شديدا.

**العاشرة:** الوعيد على من كانت الثمانية أحب إليه من دينه.

**الحادية عشرة:** أن من اتخذ ندا تساوي محبته محبة الله فهو الشرك الأكبر.

## باب قول الله تعالى:
## ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللّهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللّهِ﴾ {البقرة:١٦٥}.

باسی خۆشەویستی کە عیبادەتە: (هەندێک لە خەڵکی جگە لە خوا دەپەرستن و هاوتای بۆ بڕیار دەدەن، پەرستنەکەشیان لەوەدایە کە چەندە خوایان خۆش دەوێت ئەوەندەش هاوتاکانیان خۆش دەوێت، بەڵام ئیمانداران بەو جۆرە نین بەڵکو خۆشەویستیان بۆ خوا زۆرە و سەرووی هەمووانە).

سلیمان ال الشیخ ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (لەبەر ئەوە خۆشەویستی ئەصلی دینە چونکە شتەکانی تر بەدەوریدا دەخولێنەوە، بە تەواو بوونی ئیمان تەواو دەبێت و بە کەم بوونی تەوحیدیش کەم دەبێت، دانەری کتاب ئاگاداری کردەوە واجبە لەسەر هەموو کەسێک)[1].

زانایان دەڵێن چێژی تەواوی خۆشی و شادی و کامەرانی دڵ و دەروون بەندە لەسەر دوو بنەمای سەرەکی:

یەکەم: خۆشەویستەکەت لەوپەڕی لوتەکەی جوانی و بێ کەم کوڕی و تەواوی پڕ و پوختی دابێت، کە شایەنی هەموو قوربانی و خۆشەویستییێک دا بێت.

---

[1] تیسیر العزیز الحمید لاپەڕە (٣٤٦-٣٤٧).

دووەم: بەهێزی و بێ پایانی و بێ وێنەیی ئەو خۆشەویستی یە کە لە نێوانیاندایە، واتە: هەرچەندە ئەندازە و ڕێژەی ئەو خۆشەویستی یە بەرز و زۆر بێت ئەوەندە زیاتر هەست بە تام و چێژی خۆشی و شادی و کامەرانی دەکەیت.

جا پاش زانینی ئەو دوو بناغە سەرەکییە ئەوە ماوەتەوە بڵێین کە هەموو کەسێکی ژیر و هۆشیار هەمیشە لە هەوڵی بە دەست خستنی گەورەترین و مەزنترین شادی و خۆشەویستی یە هەروەها ئامادەیە قوربانی بە زۆر شتی لاوەکی و سادە بدات لە پێناوی بە دەست هێنانی ئەو خۆشی یەدا، جا چۆن حەق و ڕەوایە ئێمەی مرۆڤ لە پێناوی خۆشی یەکی کەم و کورت و سنوورداردا خۆشی یەکانی قیامەتی هەتا هەتایمان لە دەست بچێت! بەڵام بەداخەوە خەڵکی سەرقاڵی دونیان و دونیا نێو دڵیانی داگیر کردووە و خۆیان ناکەن بە خاوەنی بانگەواز کردن بۆ لای خوا و سەرقاڵی بازرگانی دونیان و قیامەت و گرینگترین پێوەر لایان سەروەت و سامانە، خوای گەورە دەفەرمووێت: (بەڵام ئێوە هەر ژیانی دونیاتان بە دەستە و هەڵیدەبژێرن، بەڵام ژیانی کۆتایی و قیامەت نەبڕاوە و پڕ خێر و بەرەکەت ترە) [الأعلى: ١٦ ـ ١٧].

هەر بۆیە ئەگەر لە شەیدایان بپرسین: خۆشترین نیعمەت چی یە؟ بەڵێ بێ گومان دەڵێت: دیداری خۆشەویستەکەمە، بەڵێ زۆر ڕاستە هەر بۆیە گەورەترین و بەنرخترین نیعمەت لە نیعمەتەکانی بەهەشت و قیامەت بریتی یە لە شاد و شوکر و بەهرەمەند بوون بە دیداری لوتکەی خۆشەویستان کە بینینی خوای گەورەیە، هەروەک پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (سوێند بەخوا هیچ نیعمەتێ بە ئەندازەی بینین و تەماشاکردنی خوا لایان خۆشتر نییە)[١].

کەواتە باشترین هۆکاری گەیشتن بە چێژ و خۆشی یەکانی بەهەشت بریتی یە لە ناسین و خۆشویستنی خوای گەورە و ئەو بەهەشتەی کە هەر لە بنەڕەتدا نیشتمانی سەرەکی

---

[١] رواه مسلم.

گیان و جەستەی ئێمە بووە، واتە: خۆشترین و شیرینترین شت لەم دونیایەدا بریتی یە لە ناسینی خوا و خۆشویستنی، هەروەها خۆشترین و شیرینترین شت لە بەهەشت بریتی یە لە تەماشاکردن و گەیشتن بە دیداری خوای گەورە، چ نیعمەتێک هەیە لە ژیاندا بگاتە نیعمەتی خۆسازاندن بەو پەڕی تامەزرۆییەوە بۆ گەیشتن بە ژوان و دیداری گەورەترین خۆشەویست کە سەرجەم دڵ و دەروونی داگیر کردبێت؟! تەنانەت هەندێ لە خۆشەویستان دەڵێن: هەندێ کاتمان بەسەردا تێ دەپەڕێت ئەوەندە هەست بەخۆشی و دڵنیایی دەکەین، ئەگەر بەهەشتی یەکان لەو جۆرە ژیانەی ئێمەدا بن ئەوە ژیانیان خۆشە.

هەروەها دەڵێن ئەگەر پادشاکان و دار و دەستەکانیان بە خۆشی و شیرینی ژیانی ئێمەیان بزانیایە، ئەوا شەڕیان لەسەر دەکرد.

خۆشەویستی چارەسەر و خۆراکی ڕووحە، هەر کاتێک دڵ لەم خۆراکە دابڕێت ئیتر تووشی نەهامەتی دەبێت، بگرە زۆر ئەستەمترە لە ناخۆشی یەکانی لە دەست دانی ڕووناکی بۆ چاوەکان یاخود لە دەست دانی هەستی بیستن یان بۆن کردن.

دڵی مرۆڤ ژوانگەی خۆشەویستی خوای تاک و تەنهایە، بەبێ ئەم وزەیە دڵ تووشی گەورەترین دەرد و نەهامەتی دەبێت ئیتر لە جەستەیەکی ئاژەڵی بەولاوە هیچی تر نامێنێتەوە کە ئامادەیە وەک دڕندەیەک هەموو شتێک لە پێناو ئارەزووەکانیدا تێک بشکێنێت.

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿وَمِنَ النَّاسِ﴾: پیتی (من) (للتبعیض)، واتە: هەندێک لە خەڵکی.

﴿أَنْدَادًا﴾: کۆی (ند)ە، واتە: شەریک و هاوتا.

﴿يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ﴾: دوو وتە هەیە لەسەر مانای ئەم ئایەتە:

یەکەم: موشریکەکان هاوبەشەکانیان خۆش دەویست وەک خۆشەویستی خوا.

دووەم: موشریکەکان هاوبەشەکانیان خۆش دەویست وەک خۆشەویستی ئیمانداران بۆ خوا، وتەی ڕاست وتەیە یەکەمە، والله أعلم[(١)].

عبدالرحمن بن ناصر السعدی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (بزانە جۆرەکانی خۆشەویستی سێ جۆرن:

یەکەم: خۆشەویستی خوا کە بنچینەی ئیمان و تەوحیدە.

دووەم: خۆشەویستی لە ڕێگای خوا، وەک خۆشەویستی پێغەمبەرانی خوا و نێردراوەکانی و شوێن کەوتووەکانی، هەروەها خۆشویستنی ئەو شتانەی خوای گەورە خۆشی دەوێن لە کردەوە و کات و شوێن و شتی تر، ئەمانە تابعی خۆشەویستی خوان.

سێیەم: خۆشەویستی لەگەڵ خوا، کە خۆشەویستی موشریکەکان بۆ خواکانی خۆیان لە دار و بەرد و مرۆڤ و فریشتە و شتی تر، کە ئەمەش بنچینەی شیرکە.

پاشان دەڵێت جۆری چوارەمیش هەیە ئەویش خۆشەویستی سروشتی یە، وەک خۆشەویستی خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگ و ژن هێنان و شتی تر)[(٢)].

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (مناسبەی هێنانەوەی ئەم ئایەتە لە بابی خۆشەویستی: ڕێگری لە مرۆڤ کراوە یەکێکی خۆش بوێت وەک خۆشەویستی بۆ خوا، چونکە ئەمە شیرکی گەورەیە و لەدین دەردەچێت، ئەم سیفەتەش لە هەندێک لە بەندەکان

(١) بدائع التفسیر (٣٧٢/١).
(٢) القول السدید لاپەڕە (٨٨).

و خزمەتكارەكان دا هەيە، هەندێک لە بەندەكان هەندێک گۆڕ و وەلی بە گەورە دادەنێن و خۆشیان دەوێن وەک خۆشەویستی بۆ خوا، هەروەها هەندێک خزمەتكار هەن هەستیان پێ دەكەیت کە سەرکردەکانی خۆیان خۆش دەوێت زیاتر لە خۆشەویستی بۆ خوا، هەروەها زیاتر لە خوا بەگەورەیان دادەنێن، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ۞ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا ۞﴾ [الأحزاب: ٦٧-٦٨])[١].

**سوودەكانی ئایەتەكە:**

**١-** هەر کەسێک شەریک بۆ خوا بڕیار بدات لە خۆشەویستیدا، ئەوا ستەمكارە.

**٢-** ئیماندار خۆشەویستی یەکەی بۆ خوا زیاترە لە خۆشەویستی ئەوان بۆ پەیكەرەكانیان، لەبەر وتەی: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ﴾.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (خۆشەویستی خوا عیبادەتە، چونكە خوای گەورە وای داناوە هەر کەسێک کەسێک بهێنێتە ئاست خوای گەورە لە خۆشەویستی دا ئەوا هاوتای بۆ خوا بڕیارداوە، خۆشەویستی عیبادەتە و بەڵكو ئەساسی عیبادەتیشە، چونكە ئەساسی عیبادەت بنیات نراوە لەسەر خۆشەویستی و بەگەورە دانان، بە خۆشەویستی فەرمانەكان جێ بەجێ دەكات و بە گەورە دانانیش خۆی بە دووردەخاتەوە لە قەدەغەكراوەكان)[٢].

---

[١] القول المفيد.

[٢] تفسير ابن عثيمين (٢/٢٣٧).

٣- بەندە چەند ئیمانی زیاد بێت خۆشەویستی یەکەی زیاتر دەبێت، چونکە زۆر خۆشویستنی خوای گەورەی پەیوەست کردووە بە ئیمان، لەبەر وتەی: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ﴾.

٤- واجبی پێش خستنی خۆشەویستی خوای گەورە بەسەر هەموو خۆشەویستەکان، چونکە خوای گەورە زەمی ئەوانەی کردووە کە هاوتاکانیان خۆش دەوێت وەک خوا، بە ستەم و شیرک وەسف کردووە.

٥- هەر کەسێک هاوتا بۆ خوا بڕیار بدات لە خۆشەویستیدا ئەوە ستەمکارە، لەبەر وتەی: ﴿وَلَوْ يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُوا إِذْ يَرَوْنَ الْعَذَابَ﴾، ستەمترین ستەم شەریک بۆ خوا بڕیاردانە.

٦- جێگیرکردنی زیندووبوونەوە و سزا و پاداشت، لەبەر وتەی: ﴿وَلَوْ يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُوا إِذْ يَرَوْنَ الْعَذَابَ﴾.

٧- جێگیرکردنی هێز بۆ خوای گەورە، هێز و توانا و دەسەڵات هەموو بە دەست خوایە، لەبەر وتەی: ﴿أَنَّ الْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾.

٨- توندی سزای خوای گەورە بۆ ستەمکارەکان و موشریکەکان و کەسانی تری هاوشێوەی ئەوان، لەبەر وتەی: ﴿وَأَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعَذَابِ﴾.

٩- ئاگادارکردنەوە و هۆشداری وەرگرتن لە سزای خوای گەورە، چونکە خاوەنی توانا و دەسەڵاتی تەواوە و سزاکەی توندە.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (خۆشەویستی و ترس و ئومێد بنچینە و بناغەی عیبادەتن، ئەگەر ئەم سێ یە کۆبوونەوە ئەوا عیبادەتەکە دروستە، وەک: نوێژ و

حەج و عیبادەتەکانی تر، بەڵام ئەگەر ئەم سێ یە نەبوون ئەوا مرۆڤ ئەگەر بەڕۆژوو بێت و نوێژ و حەجیش بکات، ئەوا عیبادەتی دروست نییە.

زانایان دەڵێن: (من عبد الله بالمحبة فقط فهو صوفي)، چونکە سۆفی دەڵێن ئێمە خوا دەپەرستین لەبەر ئەوەی تەنها خۆشمان دەوێت، هەروەها دەڵێن: ئێمە ناپەرستین لە ترسی ئاگر و ئومێد بە بەهەشتەکەی، بەڵکو دەیپەرستین چونکە خۆشمان دەوێت، ئەمەش گومڕاییە.

(ومن عبد الله بالرجاء فقط فهو مرجئ) چونکە مورجیئە کردەوە دەردەهێنن لە ئیمان.

(ومن عبد الله بالخوف فقط فهو خارجي)، چونکە خەوارج ئیمانداران کافر دەکەن لەسەر تاوان.

مورجیئە تەنها لایەنی ڕەجایان گرتووە، سۆفی تەنها لایەنی خۆشەویستیان گرتووە، خەوارجیش تەنها لایەنی ترسیان گرتووە.

ئەهلی سوننە ئەم سێ شتانەیان تێدایە سوپاس بۆ خوا، خۆشەویستی و ترس و ڕەجا و ذل و ملکەچ بوون و گوێڕایەلی)[١].

**١٠-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە هەر کەسێک شەریک بۆ خوا بڕیار بدات لە خۆشەویستی ئەوا ستەمکارە.[٢].

---

[١] إعانة المستفيد (٤٨/٢).

[٢] تفسير ابن عثيمين (٢٣٧/٢).

**وقوله:** ﴿قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ [التوبة:٢٤].

واتە : خوای گەورە دەفەرموویێت: (ئەی پێغەمبەر بڵێ ئەگەر:

(١) باوانتان. (٢) وە منالەکانتان. (٣) وە براکانتان. (٤) وە هاوسەرەکانتان. (٥) وە کەسەکانتان بە گشتی. (٦) وە سەروەت و سامانێک کە کۆتان کردۆتەوە و تیایدا ماندوو بوون. (٧) وە بازرگانیەک کە دەترسن بازاڕی بشکێت. (٨) وە خانووەکانتان کە لێی ڕازین، یان خانووی وڵات و نیشتمان و شارەکانتان.

جا ئەگەر هەریەکێ لەو شتانە لاتان خۆشەویستربێ لە شوێنی کەوتنی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەیی و هیجرەت و جیهاد کردن لە ڕێگەی خوادا، ئەوا چاوەڕێ بکەن هەتا خوا فەرمانی خۆی دەنێرێت، خواش هیدایەتی ئەو قەومە فاسقە نادات).

### هۆکاری دابەزینی ئایەتەکە:

ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن ئەم ئایەتە: ﴿قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾، سەبارەت بە قەومێکی موسڵمان کە لە مەککە بوون دابەزی، کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی هیجرەتیان کرد بۆ مەدینە ئەوان هیجرەتیان نەکرد، لەبەر ئەوە مانەوە بۆ ئەوەی پارێزگاری لە ماڵ و خانوو و نزیکەکانیان بکەن، ئەوان خۆشەویستی

ئەو شتانەیان پێش خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەیان خست، خوای گەورە ئەوانی ترساند بەم کردەوەیەی کە کردیان[١].

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا﴾: واتە: وە سەروەت و سامانێک کە کۆتان کردۆتەوە و تیایدا ماندوو بوون.

﴿وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا﴾: واتە: بازرگانیەک کە دەترسن بازاڕی بشکێت.

﴿وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا﴾: واتە: خانووەکانتان کە لێی ڕازین، یان خانووی وڵات و نیشتمان و شارەکانتان.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردوە تاوەکو ڕوونی بکاتەوە کە خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر واجبە.

عبدالله بن جار الله دەفەرموویێت: (وەعیدێکی توونده لەسەر ئەوەی ئەگەر ئەم هەشت شتانە پێش دینی خوا بخەیت)[٢].

قەرعاوی دەفەرموویێت: (ئایەتەکە بەڵگەیە حەڕامە خۆشەویستی ئەم هەشت شتانە پێش خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر بخەیت.)[٣].

(١) إعانة المستفيد (٥٢/٢).

(٢) الجامع الفريد لاپەڕە (١٢٦).

(٣) الجديد (٢٨٠).

**سوودەكانی ئایەتەكە:**

**١-** واجبی پێش خستنی خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) و جیهاد كردن لە ڕێگەی خوا و سەر خستنی دینەكەی بەسەر هەموو خۆشویستراوێك، لەبەر وتەی: ﴿قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾.

**٢-** واجبی پێش خستنی خۆشەویستی خوا بەسەر هەموو شتێك، لەبەر وتەی: ﴿أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ﴾.

**٣-** واجبی پێش خستنی خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) بەسەر خۆشەویستی هەموو دروستكراوكان، لەبەر وتەی: ﴿وَرَسُولِهِ﴾، خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) واجبە و پێش خستنی خۆشەویستی خوا بەسەر هەموو شتێك دا مەرجی دروستی ئیمانە، بەڵام پێش خستنی خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) مەرجی تەواوی ئیمانە.

عن أنس رضي الله عنه، أن رسول الله (ﷺ) قال: (لا يؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه من ولده ووالده والناس أجمعين)[١].

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالك دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (هیچ كەسێكتان ئیمان ناهێنێت هەتا منی زیاتر خۆش دەوێت لە منداڵەكانی و باب و دایك و هەموو خەڵكی).

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (١٥)، ومسلم (٤٤).

عومەر خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: (ئەی نێردراوی خوا تۆ لای من لە هەمووان خۆشەویست تری جگە لە نەفسی خۆم)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە ئیمانت تەواو نییە هەتا منت لە نەفسی خۆت خۆشتر نەوێت)، عومەر پێی گوت: ئێستا تۆم لە نەفسی خۆشم زیاتر خۆش دەوێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئێستا ئیمانت تەواوە ئەی عومەر)[1].

٤- واجبی پێش خستنی خۆشەویستی جیهاد لە ڕێگەی خوا و سەرخستنی دینەکە بەسەر هەموو خۆشەویستییەکانی دونیا، لە نزیکەکان و ماڵ و بازرگانی و شوێنی نیشتەجێ بوون، لەبەر وتەی: ﴿وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ﴾.

٥- هەڕەشە بۆ ئەوانەی خۆشەویستی ئەم شتانە پێش خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی و جیهاد کرد دەخەن، لەبەر وتەی: ﴿فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ﴾.

٦- نەفی کردنی هیدایەت لە فاسقەکان، لەبەر وتەی: ﴿وَاللَّهُ لَا يَهْدِى الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾.

٧- هەر کەسێک خۆشەویستی ئەم شتانە پێش خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی و جیهاد کردن بخات، ئەوە فاسقە، لەبەر وتەی: ﴿وَاللَّهُ لَا يَهْدِى الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾.

٨- خۆشەویستی ئەم هەشت شتانە ئەسڵ وایە هیچی تێدا نییە، ئەو کاتە زەمکراوە ئەگەر خۆشەویستی ئەم شتانە پێش خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) بخەیت.

٩- جیهاد کردن لە باشترینی کردەوەکانە، لەبەر ئەوە خوای گەورە لەگەڵ خۆشەویستی خۆی و پێغەمبەرەکەی باسیکردووە.

---

(١) رواه البخاري (٦٦٣٢).

**١٠-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ هاندان بۆ جیهاد كردن و زوهد لە دونیا دا، چونكە ماڵ و مناڵ و خانوو و بازرگانی خۆشی دونیان و دەڕۆن و نامێنن.

**١١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە خۆشەویستی ئەم هەشت شتانە ئەصل وایە هیچی تێدا نییە، ئەو كاتە زەمكراوە ئەگەر خۆشەویستی ئەم شتانە پێش خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر بخەیت.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (وتەی (أحب) بەڵگەیە خۆشەویستی ئەم هەشت شتانە لە ئەصڵ دا هیچی تێدا نیە، مرۆڤ باوك و منال و برا و قەبیلەكەی خۆی خۆش دەوێت، هەروەها ماڵ و بازرگانی و خانووی خۆش دەوێت، ئەصڵ لە خۆشەویستی ئەم شتانە ڕێگەپێدراوە چونكە خۆشەویستی سروشتین، بەڵام ئەو كاتە زەمكراوە ئەگەرخۆشەویستی ئەم شتانە پێش خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر بخەیت)[1].

---

[1] إعانة المستفيد (٥٣/٢).

**عن أنس رضي الله عنه، أن رسول الله (ﷺ) قال: (لا يؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه من ولده ووالده والناس أجمعين) أخرجاه.**

واته: له ئەنەسی کوڕی مالک دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (هیچ کەسێکتان ئیمان ناهێنێت هەتا منی زیاتر خۆش دەوێت لە مناڵەکانی و باب ودایک و هەموو خەڵکی).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(لا يؤمن أحدكم):** واته: هیچ کەسێکتان ئیمان ناهێنێت، ئەم نەفی یە هەندێک جار بەمانای نەفی کمال دێت و هەندێک جار نەفی وجود، لێرە مەبەست پێی نەفی کماله.

**(من ولده):** واته منال، کوڕ و کچ دەگرێتەوە، لەم فەرموودەیە بە خۆشەویستی منال دەستی پێکردووە پاشان باوک، چونکە بەزۆری مرۆڤ منالی زیاتر خۆش دەوێت لە باوک و زیاتر بە منالەوە پەیوەستە، ڕیوایەت هاتووە بە والد دەستی پێکردوە پاشان ولد.

ابن حجر ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (وتەی: (من والده و ولده)، (والد)ی پێش خستووە چونکە هەموو کەسێک (والد)ی هەیە بەڵام پێچەوانە وا نییە, ڕیوایەتی نسائی فەرموودەی ئەنەس (ولد)ی پێش (والد) خستووە لەبەر زۆری خۆشەویستی و بەزەیی)[1].

**(ووالده):** باوک و باپیر بەرەو سەرەوە دەگرێتەوە، هەروەها دایک و داپیریش بەرەو سەرەوە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

---

[1] فتح الباری (١/٧٥-٧٦).

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەگەر ئیمان تەواو نەبێت تاوەکو پێغەمبەرت لە هەمووان زیاتر خۆش بویێت تەنانەت لەنەفسی خۆت و لە هەموو خەڵکی، ئەوا خۆشەویستی خوا لەپێشترە و گەورەترە)[١].

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دەبێت خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) بە پێش خۆشەویستی نەفس بخەیت[٢].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک نەفسی خۆی یان کەسێکی تری زیاتر خۆش بویێت لە پێغەمبەر، ئەوا ئیمانی تەواو نییە نەک کافر بووە.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (وتەی: (لا یؤمن أحدکم)، نەفی ئەصلی ئیمان ناکات، بەڵکو نەفی تەواوی ئیمان دەکات، واتە: ئیمانی یەکێک لە ئێوە تەواو نیە...)[٣].

**٣-** ئەم فەرموودەیە ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەگەر خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) لە تەواوی ئیمان بێت ئەوا نەبوونی خۆشەویستیەکە و ڕق لێ بوونەوەشی کوفرە.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (سەبارەت بەوەی ئەگەر مرۆڤ پێغەمبەری خۆش نەویست و ڕقی لێ بووەوە ئەوە کافرە)[٤].

---

[١] القول المفید (١٨٦/٢).
[٢] القول المفید (٢/١٨٣).
[٣] إعانة المستفید (٥٤/٢).
[٤] إعانة المستفید (٥٤/٢).

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە وتەی پێغەمبەر (ﷺ) پێش وتەی هەموو خەڵک بخەیت، چونکە ئەوەی کەسێکی خۆش بوێت لە هەموو کەسێ زیاتر دەبێت وتەشی پێش هەموان بخات، تەنانەت پێش نەفسی خۆیشی بخات[1].

[1] القول المفيد (١٨٥/٢).

**ولهما عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (ثلاث من كن فيه وجد بهن حلاوة الإيمان: أن يكون الله رسوله أحب إليه مما سواهما، وأن يحب المرء لا يحبه إلا لله، وأن يكره أن يعود في الكفر بعد إذ أنقذه الله منه كما يكره أن يقذف في النار)، وفي رواية: (لا يجد أحد حلاوة الإيمان حتى) إلى آخره.**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالک دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (سێ سیفەت هەن هەر کەسێک ئەوانەی تێدا بێت ئەوا بەهۆی ئەوانەوە هەست بە شیرینی ئیمان دەکات:

١- دەبێت خوا و پێغەمبەرەکەی لەلا خۆشەویستتر بێت لە غەیری ئەوان.

٢- ئەگەر کەسێکی خۆش ویست تەنها لەبەر خوا خۆشی بوێت.

٣- دەبێت پێی ناخۆش بێت بپێتەوە بە کافر، پاش ئەوەی کە خوای گەورە لە کافری نەجاتی دا، هەروەک چۆن پێی ناخۆشە هەڵبدرێتە ناو ئاگرەوە).

ڕیوایەتی تر هاتووە دەفەرموویێت: (شیرینی ئیمان ناچێژێت تاوەکو ...)

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(ثلاث من كن فيه):** واتە: سێ سیفەت هەن هەر کەسێک ئەوانەی تێدا بێت.

**(أن يكون الله رسوله أحب إليه مما سواهما):** واتە: دەبێت خوا و پێغەمبەرەکەی لەلا خۆشەویستتر بێت لە غەیری ئەوان.

**(وأن يحب المرء لا يحبه إلا لله):** واتە: ئەگەر کەسێکی خۆش ویست تەنها لەبەر خوا خۆشی بوێت.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (کردنە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە دیارە بەوەی خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر دەبێت پێش خۆشەویستی تر بخرێت، ئەمەش لە تەواوی ئیمانە و بەندەش ناگات بە تەواوی ئیمان ئیلا بەمە نەبێت)[1].

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر دەبێت پێش خۆشەویستی هەموو شتێک بخرێت.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەزڵی خۆشویستنی کەسێک تەنها لەبەر خوا.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە موسڵمان دەبێت پێی ناخۆش بێت بێتەوە بە کافر، پاش ئەوەی کە خوای گەورە لە کافری نەجاتی دا، هەروەک چۆن پێی ناخۆشە هەڵبدرێتەوە ناو ئاگرەوە.

**٤-** هەندێک زانا ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە هەر کەسێک لەناو ئیسلام لەدایک بووبێت باشترە لەوەی موسڵمان بوە دوای کوفر.

عبدالله بن حمید ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (هەندێ زانا ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە هەر کەسێک لەناو ئیسلام لەدایک بووبێت باشترە لەوەی موسڵمان بووە دوای کوفر، چونکە دەفەرمووێت: (یکره أن یعود في الکفر بعد إذ أنقذه الله منه)، لەڕاستیدا ئەمە بەڵگە نییە لەسەر ئەمە، هەندێک لە خەڵکی موسڵمان دەبن باشترن لە زۆرێک لەوانەی کە لەناو ئیسلام لەدایک بوونە بەتایبەت کاتێک دڵیان پڕ دەبێت لە

---

[1] التمهید لاپەڕە (٣٤٩).

ئیمان، هەروەک چۆن تاوانبار سەرپێچی خوا دەکات پاشان تەوبە دەکات باشترە لە حاڵەتی پێش تاوان کردنەکە، چونکە تاوان دڵی شکاندووە و وای لێکردوە زەلیل بێت بۆ خوا، حاڵی دوای تاوان باشترە لە پێش تاوان)[١].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە باش نییە ناوی خوا و پێغەمبەر پێکەوە بە یەک ضمير کۆبکرێتەوە، نەوەک حەڕام بێت.

عبدالله بن حميد ڕەحمەتی دەفەرمووێت: (پێغەمبەر (ﷺ) ئینکاری وتار خوێنی کرد ئەوەی گوتی: (من يطع الله ورسوله فقد رشد، ومن يعصهما فقد غوى" وقال: "بئس الخطيب أنت! قل: ومن يعص الله ورسوله فقد غوى)، ناوی خوا و پێغەمبەر پێکەوە بە یەک ضمير کۆناکرێتەوە، لەم فەرموودەیە (أن يكون الله رسوله أحب إليه مما سواهما)، نەیفەرموو: (أحب إليه مما سوى الله ورسوله)، بەڵکو بە ضمير مثنى هاتووە وەک وتار خوێن، وەڵام چیە؟

١- وتراوە: لەم فەرموودەیە خۆشەویستی خوا و پێغەمبەری جمع کردووە، وەک یەک شت وان، ...

٢- بەڵام ئەوەی دیار بێت لای زۆر لە زانایان وتەی وتارخوێن: (ومن يعص الله ورسوله)، ئەم وتەیەی وتار خوێن وتەی کەسی ترە، وتار خوێن ناقلە، پێغەمبەر قسە دەکات سەبارەت بە نەفسی خۆی، ئەوەی بۆ پێغەمبەر دروستە بۆ کەسی تر دروست نییە.

- وتراوە: ئەمە لە بابی تأديبە، ئەمە فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە و فەرموودەی تر بۆ کەڕاهەتە، وتەی تریش وتراوە)[٢].

---

[١] شرح كتاب التوحيد لاپەڕە (٤٨٠).

[٢] شرح كتاب التوحيد لاپەڕە (٤٧٨-٤٧٩).

**وعن ابن عباس رضي الله عنهما قال: من أحب في الله، وأبغض في الله، ووالى في الله، وعادى في الله، فإنما تنال ولاية الله بذلك، ولن يجد عبد طعم الإيمان وإن كثرت صلاته وصومه حتى يكون كذلك. وقد صارت عامة مؤاخاة الناس على أمر الدنيا، وذلك لا يجدي على أهله شيئا. رواه بن جرير.**

واته: له ابن عباس دەگێڕنەوە خوا له هەردووکیان ڕازی بێت دەفەرمووێت: (هەر کەسێک چوار سیفەتی تێدا بێت:

(١) ئەهلی ئیمان و تاعەتی خۆش بووێت لەبەر خوا.

(٢) ڕق و کینەی لەبەر خوا بێت.

(٣) لەبەر خوا دۆستایەتی بکات.

(٤) لەبەر خوا دوژمنایەتی بکات.

ئەوە بەم کارەی دەبێت بە دۆست و وەلی خوا، خواش سەرکەوتووی دەکات، جا هیچ بەندەیەک تامی ئیمان ناچێژێت با نوێژ و ڕۆژووشی زۆر بێت، هەتا بەو جۆرە نەبێت، ئەوەتا برایەتی زۆربەی خەڵکی ئەم سەردەمە لەسەر کاروباری دونیایە، ئەمەش هیچ سوودێکی بۆی نیە، بەڵکو زەرەریشی بۆیان هەیە).

**وقال ابن عباس في قوله تعالى: (وتقطعت بهم الأسباب) قال: المودة.**

واته: ابن عباس سەبارەت بە وتەی خوای گەورە: (وتقطعت بهم الأسباب) دەفەرمووێت: ئەوە خۆشەویستی یە، "کە بۆ غەیری خوا بوەو لە نێوانیان دا نامێنێت لە ڕۆژی قیامەت دا" واته: لە بەینی سەرکردە و شوێن کەوتووەکانیاندا نامێنێت.

## باب قول الله تعالى: ﴿إِنَّمَا ذَلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلاَ تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ [آل عمران: ١٧٥]

**وقوله:** ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللّهِ مَنْ آمَنَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَأَقَامَ الصَّلاَةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلاَّ اللّهَ﴾ [التوبة: ١٨]

**وقوله:** ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ﴾ [العنكبوت: ١٠]

**عن أبي سعيد رضي الله عنه مرفوعا: (إن من ضعف اليقين أن ترضى الناس بسخط الله، وأن تحمدهم على رزق الله، وأن تذمهم على مالم يؤتك الله، إن رزق الله لا يجره حرص حريص، ولا يرده كراهية كاره)[(١)] .**

**وعن عائشة رضي الله عنها: أن رسول الله (ﷺ) قال: (من التمس رضى الله بسخط الناس رضي الله عنه وأرضى عنه الناس، ومن التمس رضى الناس بسخط الله سخط الله عليه وأسخط عليه الناس) رواه ابن حبان في صحيحه[(٢)].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير آية آل عمران.

**الثانية:** تفسير آية براءة.

---

[(١)] أخرجه أبو نعيم في (الحلية) (٥/١٠٦) و (١٠/٤١)، والبيهقي في (شعب الإيمان) (١/٢٢١ رقم ٢٠٧).

[(٢)] أخرجه ابن حبان (١/٥١٠ رقم ٢٧٦)، والترمذي (٢٤١٤)، والقضاعي في (مسند الشهاب) (١/٣٠٠ رقم ٤٩٩).

**الثالثة:** تفسير آية العنكبوت.

**الرابعة:** أن اليقين يضعف ويقوى. الخامسة: علامة ضعفه، ومن ذلك هذه الثلاث.

**السادسة:** أن إخلاص الخوف لله من الفرائض.

**السابعة:** ذكر ثواب من فعله. الثامنة: ذكر عقاب من تركه.

# باب قول الله تعالى: ﴿إِنَّمَا ذَلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءهُ فَلاَ تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ [آل عمران: ١٧٥]

**بابی باسکردنی وتەی خوای گەورە کە دەفەرموویێت:** ﴿إِنَّمَا ذَلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءهُ فَلاَ تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ [آل عمران: ١٧٥].

واتە: خوای گەورە دەفەرموویێت: (ئەوە شەیتانە ئێوە دەترسێنێت بە دۆستەکانی خۆی، دەی مەترسن لەوان و تەنها لە من بترسن ئەگەر ئیماندارن).

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (مناسبەی ئەم بابە لەگەڵ بابی پێشوو: دانەری کتاب ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە دوای خۆشەویستی باسی ترسان لەخوای کرد، چونکە عیبادەت جەخت لەسەر دوو شت دەکات: خۆشەویستی و ترس.

بە خۆشەویستی فەرمانەکانی خوای گەورە جێ بەجێ دەکرێت و بەترسیش خۆ لە نەهی یەکان بەدوور دەگیرێت، ئەگەر تاوانی تەرک کردبێت داوا دەکات بگات بەخوا، بەڵام ئەمە لازمی تەرک کردنی تاوانە نەک بنچینە بێت.

ئەگەر پرسیار بکەیت بۆچی زینا ناکەیت؟ دەڵێیت: لە ترسی خوا. ئەگەر پرسیار لەو کەسە بکەیت کە نوێژ دەکات، دەڵێت: لەبەر پاداشتی خوای گەورە و خۆشەویستیەکەی نوێژ دەکەم)[1].

---

[1] القول المفيد.

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (مناسبەی ئەم بابە لە کتابی تەوحید دیارە ئەویش ئەوەیە: ترسان لە خوا عیبادەتێکە لە عیبادەتەکان کە خوای گەورە واجبی کردووە، (خوف و رجاء و محبة) عیبادەتی دڵن واجبن، بە تەواو بوونی تەواو بوونی تەوحیدە و بە کەم بوونیشی کەم بوونی تەواوی تەوحیدە.

ترسان لە بێجگە لەخوا دابەش دەکرێت بۆ شیرک و حەڕام و ڕێگەپێدراو، ئەمە سێ بەشە:

بەشی یەکەم: ترسانی شیرکی، واتە لە ناخی خۆی لە ترس لێکراوەکە دەترسێت، ترسەکەی لە پێناو ئەوەیە ئومێدی پێی هەیە و لێی دەترسێت بە ترسی نهێنی، یان باوەڕی وایە لە ئاخیرەت شتی بەدەستە لە سوود و زیان، ترسی شیرکی پەیوەستە بە دونیاوە بە ترسی نهێنی بەوەی دەترسێت تووشی شەڕێکی بکات، ئەمەش شیرکە.

هەروەها ترسی شیرکی پەیوەستە بە ئاخیرەتیشەوە: دەترسێت لە بێجگە لەخوا و پەیوەست دەبێت پێی نەوەک ئەوەی لێی دەترسێت سوودی بۆی نەبێت لە ئاخیرەت و شەفاعەتی بۆ نەکات!

بەشی دووەم: ترسی حەڕام، ئەویش ئەوەیە لە دروستکراوێک دەترسێت لە جێ بەجێکردنی واجبێک، یان خۆ دوورخستنەوە لە حەڕامێک، یان لە شتێک کە خوای گەورە واجبی کردووە یا حەڕامی کردووە، وەک ئەوەی لە دروستکراوێک بترسێت لە جێ بەجێکردنی واجبێک لە واجبەکانی خوا، نوێژ ناکات لە ترسی دروستکراوێک، ئامادەی نوێژی بە کۆمەڵ نابێت لە ترسی ئەوەی دروستکراوەکان زەمی بکەن، ئەمەیان حەڕامە، هەندێ زانا دەڵێن: ئەمە جۆرێکە لە جۆرەکانی شیرک، چونکە فەرمان و نەهی واجبی تەرک کردووە لە ترسی زەم کردنی خەڵک، یان لەبەر تەرک کردنی مەدح کردنیان بۆی، ئەمەیان پێش خستنی ترسی خەڵکی بەسەر ترسی خوا تێدایە و حەڕامە.

بەشی سێیەم: ترسی سروشتی، ئەمەیان ڕێگەپێدراوە و شتێکی سروشتی یە، وەک: ترسان لە دوژمن، یان ترسان لە دڕندە، یان ترسان لە ئاگر، یان ترسان لە شتێک بە هیلاکت ببات و ئازارت بدات، وە شتی تری وەک ئەمانە)[1].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ترس چەند بەشێکە:

بەشی یەکەم: ترسی عیبادەت کە زەلیلی و بەگەورە دانانی لەگەڵە، ئەمەیان پێی دەڵێن: ترسی نهێنی. ئەمە بۆ کەس ناگونجێت ئیلا بۆ خوا نەبێت، هەر کەسێک کەسێکی تر بکات بە شەریک لەگەڵ خوا ئەوا تووشی شیرکی گەورە بووە، وەک: لە پەیکەرەکان یان لە مردووەکان دەترسێت، یان لە وەلی یەکانی خۆیان دەترسن و باوەڕیان وایە سوود و زیانیان پێ دەگەیێنن هەروەک هەندێک لە گۆڕ پەرستان ئەمە دەکەن و لە خاوەنی گۆڕ دەترسن زیاتر لەخوا.

بەشی دووەم: ترسی سروشتی، ئەمەیان ئەصڵ وایە ڕێگەپێدراوە، لەبەر وتەی خوای گەورە سەبارەت بە موسا: ﴿فَخَرَجَ مِنْهَا خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ﴾ [القصص: ٢١]، هەروەها دەفەرموویێت: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ﴿٣٣﴾﴾ [القصص: ٣٣]، بەڵام ئەگەر ترسەکە بووە هۆی تەرک کردنی واجب یان کردنی حەرام ئەوا حەڕامە)[2].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (جۆری دووەم لە جۆرەکانی ترسی زەمکراو ئەوەیە: مرۆڤ بانگەوازی کردن بۆ لای خوا تەرک بکات لە فەرمان کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە لە ترسی خەڵک نەوەک ئازاری بدەن، فەرمان کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە تەرک دەکات لە ترسی خەڵک، ئەمە شیرکی بچووکە و حەڕامە،

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٣٥٤).

[2] القول المفيد.

فەرمووده هاتووه: (أن الله يحاسب العبد يوم القيامة: لم تأمر بالمعروف وتنهى عن المنكر؟ فيقول: يا رب خشيت الناس، فيقول: إياي أحق أن تخشى))[١].

## ڕاڤەی وشەكانی ئایەتەكە:

﴿يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ﴾: واتە: دەتان ترسێنێت بە وەلی یەكانی خۆی.

﴿أَوْلِيَاءَهُ﴾: وەلی یەكانی شەیتان هەموو كافر و بێ دین و موجرمێک دەگرێتەوە، ئەمانە وەلی یەكانی شەیتانن.

﴿فَلَا تَخَافُوهُمْ﴾: واتە: لە وەلی یەكانی شەیتان مەترسن، (ضمیر) بۆ وەلی یەكانی شەیتان دەگەڕێتەوە.

## هۆكاری باسكردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (تێگەیشتنی ئەم ئایەتە لەوەدایە: ترسان لە شەیتان و وەلی یەكانی نەفی ئیمان دەكات، ئەگەر ترسانەكە سەربكێشێت بۆ شیرک ئەوا نەفی ئەصڵی ئیمان دەكات، ئەگەر نا نەفی تەواوی ئیمان دەكات)[٢].

## سوودەكانی ئایەتەكە:

١- ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ ڕوونكردنەوەی توندی دوژمنایەتی شەیتان بۆ نەوەی ئادەم بە جۆرێک دەیان ترسێنێت بە وەلی یەكانی خۆی[٣].

---

[١] إعانة المستفيد (٢/٦٧-٦٨).

[٢] القول المفيد.

[٣] تفسير سورة آل عمران (٢/٤٥٦).

**٢-** شەیتان بەرگری لە وەلی یەکانی خۆی دەکات، بەڵکو هێرشی پێ دەبات، لەبەر وتەی ﴿يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ﴾، واتە: دەتان ترسێنێت بە وەلی یەکانی خۆی[1].

**٣-** نابێت ئیماندار لە وەلی یەکانی شەیتان بترسێت، لەبەر لاوازی پیلانیان، دەبێت تەنها لەخوای گەورە بترسێت، لەبەر وتەی: ﴿فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ﴾، هەروەک خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾﴾ [النساء: ٧٦].

**٤-** مەرجی دروستی ئیمان ئەوەیە مرۆڤ لە کەس نەترسێت جگە لەخوا نەبێت، لەبەر وتەی: ﴿إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾.

**٥-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە چەندە ئیمانی مرۆڤ بەخوا بەهێزتر بێت ترسان لێی بەهێزتر دەبێت، لەبەر وتەی: ﴿إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾[2].

**٦-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە چەندە ئیمانی مرۆڤ بەخوا بەهێز بێت ترسان لێی بەهێزتر دەبێت، وە ترسان لە وەلی یەکانی شەیتانیش لاواز دەبێت[3].

**٧-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە ترسان لەخوا لە داواکراوەکانی ئیمانە؛ لەبەر وتەی: ﴿إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾[4].

---

[1] تفيسر سورة آل عمران (٢/٤٥٦).

[2] تفيسر سورة آل عمران (٢/٤٥٧).

[3] تفيسر سورة آل عمران (٢/٤٥٧).

[4] تفيسر سورة آل عمران (٢/٤٥٧).

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (فەرمانی کردووە بە لە خوا ترسان، ئەمەش بەڵگەیە ترسان لەخوا عیبادەتێکە لە عیبادەتەکان، خوا بە تەنیا دانان لەم عیبادەتە تەوحیدە و شەریک بۆ خوا دانانیش لەم عیبادەتە شیرکە)[1].

---

[1] التمهید لاپەڕە (٣٥٤-٣٥٥).

**وقوله:** ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللهِ مَنْ آمَنَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَأَقَامَ الصَّلاَةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلاَّ اللهَ﴾ [التوبة: ١٨]

واتە: بەڕاستی تەنها ئەو کەسە (بەدڵ و بەگیان) مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان دەکاتەوە (بە خواپەرستی و نوێکردنەوەی) کە باوەڕی پتەوی بەخواو بەرۆژی دوایی هێناوە و نوێژەکانی بەچاکی ئەنجام داوە و زەکاتیشی (لە ماڵ و سامانی) دەرکردووە و لە کەسیش نەترساوە جگە لە خوای باڵادەست، جا ئومێدە ئەو جۆرە کەسانە لە ڕیزی ڕێنموویی کراواندا بن.

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ﴾: (يعمر) مەبەست پێی ئاوەدان کردنەوەی نابەرجەستەیە، کە نوێژ و زیکر و قورئان خوێندن و عیبادەتەکانی تر دەگرێتەوە.

﴿مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ﴾: واتە: ئەوەی باوەڕی پتەوی بەخوایە، ئیمان بە خوا چوار شت لەخۆ دەگرێت:

١- ئیمان بە بوونی خوا.

٢- ئیمان بە پەروەردگاریەتی.

٣- ئیمان بە بەندایەتی کردن.

٤- ئیمان بە ناو و سیفەتەکانی.

﴿وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾: لەبەر ئەوە پێی دەڵێن ڕۆژی دوایی چونکە دوا ڕۆژە.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە نیشانەی ڕاستی ئیمان ئەوەیە لە کەس نەترسێت تەنها لە خوا نەبێت.

### سوودەکانی ئایەتەکە:

**١-** ڕوونکردنەوەی ئەوە ئەوانە ماڵەکانی خوا ئاوەدان دەکەنەوە کە ئیمان بەخوا و ڕۆژی دوای دەهێنن و نوێژ ئەنجام دەدەن و زەکات دەدەن و لە کەس ناترسن جگە لە خوا، لەبەر وتەی: ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا اللَّهَ﴾.

هەندێک لە پێشینەکان دەڵێن: (ئەگەر بینیت پیاو مزگەوت ئاوەدان دەکات و عیبادەت دەکات، ئەوە گومانی باشی پێ ببەن)، ئاوەدان کردنەوەی مزگەوت بە نوێژ و زەکات وەک ئەوە وایە بەڵگە بێت لەسەر ئەوە مەبەست لە ئاوەدان کردنەوە ئامادەبوونە تێیدا (واتە: ئامادەبوونە لە مزگەوت)، چونکە ئەگەر مرۆڤ نوێژ بکات ئەوە لە مزگەوت ئامادە دەبێت، بەمە ئاوەدان کردنەوەی مزگەوت دێتەدی، ئەگەر زەکات بدات، ئەوە دەستەی هەژارەکان ئامادەی مزگەوت دەبن بۆ داواکردن و وەرگرتنی زەکات، بەمە ئاوەدان کردنی مزگەوت دێتەدی.

**٢-** گرینگترین شت لە ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتەکان ئاوەدان کردنی نابەرجەستەیە (معنوي)یە بە ئیمان هێنان و نوێژکردن و عیبادەتەکانی تر.

**٣-** لە گەورەترین ڕوکنەکانی ئیمان هێنان بەخوا ئیمان هێنانە بە پەروەردگاریەتی و بەندایەتی و ناو و سیفەتەکانە، لەبەر وتەی: ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ﴾،

بەڵگەیە کافر ڕێگری لێی کراوە مزگەوتەکانی موسڵمانان ئاوەدان بکاتەوە، ئەگەر وەسیەتیش بکات قبوڵ نییە، وە ڕێگری لێی دەکرێت لە هاتنە ناو مزگەوت.

**٤-** لە گەورەترین ڕوکنەکانی ئیمان، ئیمان هێنانە بە ڕۆژی دوای، لەبەر وتەی: ﴿وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾.

**٥-** ئیمان دروست نییە بێ کردەوە، دەبێت ئیمان و کردەوە پێکەوە کۆببنەوە.

**٦-** گەورەیی پلە و پایەی نوێژ بەجۆرێک بە شێوەیەکی تایبەت باسیکردووە لەناو هەموو عیبادەتەکان، لەبەر وتەی: ﴿وَأَقَامَ الصَّلَاةَ﴾.

**٧-** مەبەست لە ئەنجام دانی نوێژ ئەوەیە بە ڕوکن و واجب و مەرج و سوننەتەکانەوە ئەنجام بدەیت، لەبەر وتەی: ﴿وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ﴾، مناسبەی باسکردن زەکات لەگەڵ ئاوەدان کردنەوەی مزگەوت، لەبەر ئەوە مزگەوت شوێنی کۆبوونەوەی خەڵکە، کاری دەوڵەمەند و هەژاری ڕوونکردۆتەوە، بەمە حاڵی ئەوە دەزانرێت کە زەکات دەدات و ئەوەی وەریش دەگرێت[١]

**٨-** گرینگی زەکات دان کە گەورەترین عیبادەتە دوای نوێژ، لەبەر وتەی: ﴿وَآتَى الزَّكَاةَ﴾.

**٩-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە ترسان لە خوا واجبە، خوای گەورە مەدحی ئەوانەی کردووە لەبەرئەوەی تەنها لەخوا دەترسن، خشية تایبەت ترە لە خوف[٢].

---

(١) (تفسير أبي حيان) (٣٨٧/٥).

[٢] التمهيد لاپەڕە (٣٥٥).

**وقوله:** ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ﴾ [العنكبوت: ١٠]

واته: هەندێك لەخەڵكی هەن كە دەڵێن: باوەڕمان بەخوا هێناوە، جا كاتێك یەكێك لەوانە لە بەر خواو لە پێناوی خوا تووشی ئازار و ناخۆشی كرا، وادەزانێت سزاو ئەشكەنجەی خەڵكی وەك سزای خوا وایە (وەك چۆن لە دۆزەخدا پەشیمانە لێرەش بەهۆی ئەشكەنجەی خەڵكیەوە لە دین پەشیمان دەبێتەوە)، بەڕاستی ئەگەر پەروەردگارت سەركەوتنێكی بەخشی، دووڕووەكان بەگەرمی دەڵێن خۆ ئێمەش بێگومان هاوكارتان بووین، مەگەر خوا خۆی نازانێت چی حەشاردراوە لە دەروونی هەموو خەڵكیدا (بەتایبەت لە دڵی ئەو جۆرە كەسانەدا)؟

### ڕاڤەی وشەكانی ئایەتەكە:

﴿فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ﴾: واتە: جا كاتێك یەكێك لەوانە لە بەر خواو لە پێناوی خوا تووشی ئازار و ناخۆشی كرا، (في) ئەگەر دوو مانای هەیە:

١- (للسببية): واتە: بە سەبەبی ئیمان هێنان بەخوا و بەردەوام بوون لەسەر دین.

٢- (للظرفية): واتە: ئەگەر ئازار درا لەناو شەرعی خوا، ئازاردان لە شەرع دەست گرتنە بە شەرعەوە.

### هۆكاری باسكردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

دانەری كتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسكردووە تاوەكو ڕوونی بكاتەوە ترسان لە دروستكراوەكان وەك ترسان لە خوا سیفەتێكی زەمكراوە.

### سوودەكانی ئایەتەكە:

**١-** سەبارەت بە هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە چوار وتە هەیە.

یەکەمیان: سەبارەت بەو ئیماندارانە دابەزی کە موشریکەکان دەریان کردن بۆ بەدر (واتە: لەگەڵ خۆیان برد بۆ بەدر) و هەڵگەڕانەوە، رواه عکرمه عن ابن عباس.

دووەم: دابەزی سەبارەت بە قەومێک کە ئیمانیان هێنابوو بە زمان، کاتێک ناخۆشی یەکان بۆ هاتبوایا لە لایەن خواوە، یان لە نەفسی خۆیان، یان لە ماڵی خۆیان، تووشی فیتنە دەبوون، موجاهد ئەمەی گوتووە.

سێیەم: دابەزی سەبارەت بە خەڵکێکی دووڕوو، ئیمانیان هێنابوو، کاتێک ئازار دران و تووشی ناخۆشی بوون لە لایەن موشریکەکانەوە، هەڵگەڕانەوە بۆ شیرک، ضەحاک ئەمەی گوتووە.

چوارەم: دابەزی سەبارەت بە عیاش بن ربیعة، موسڵمان بوو، ترسا لە ماڵ و نەفس و قەومی خۆی، دایکی دەڵێت: من خواردن ناخۆم و خواردنەوەش ناخۆمەوە و لە ماڵەوە نابم هەتا کوڕەکەم دەگەڕێتەوە و کوفر بە محمد دەکات لەبەر لێدانی لە لایەن براکانی دایکی، دوای موسڵمان دەبێتەوە، ئەمە وتەی ابن سائیبە[1].

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر نەزانینی کافرەکان، چونکە ئازاردانی خوایان یەکسان کردووە بە ئازاردانی خەڵک.

**٣-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە مرۆڤ تاقی دەکرێتەوە بۆ ئەوەی بەدیار بکەوێت کێ ئیمانداره و کێ کافر و دووڕووە، هەروەها بۆ ئەوەی بەدیاربکەوێت کێ ڕاستگۆیە و کێ درۆزنە.

---

[1] زاد المسير (١٢٨/٦).

**٤-** کەشف کردن و ڕیسوا کردنی دەستەیەک لە خەڵک کە دەڵێن: ئیمانمان هێناوە، کاتێک تووشی ناخۆشی دەبن دەڵێن سزای خەڵک وەک سزای خوا وایە، هەڵدەگەڕێنەوە و واز لە کردەوەی باش دێنن، لەبەر وتەی: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ﴾.

**٥-** حیکمەتی خوای گەورە لە تاقیکردنەوەی بەندەکان، چونکە بە تاقیکردنەوە کەسی ڕاستگۆ و درۆزن بەدیار دەکەوێت.

**عن أبي سعيد رضي الله عنه مرفوعا: (إن من ضعف اليقين أن ترضى الناس بسخط الله، وأن تحمدهم على رزق الله، وأن تذمهم على مالم يؤتك الله، إن رزق الله لا يجره حرص حريص، ولا يرده كراهية كاره)**[1].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودری دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (لە نیشانەی لاوازی یەقینە خەڵکی ڕازی بکەیت بەناڕازی بوونی خوا، سوپاسی و ستایشی خەڵک بکەیت لەسەر ئەوەی کە خوا ڕزقی پێت بەخشیوە، زەم و لۆمەی خەڵک بکەیت لەسەر ئەوەی کە خوا ڕزقێک یان شتێکی نەبەخشیوە پێت، بە تەئکید ڕزقی خوا سووربوونی کەسانی هەوڵدەر و بە تەماع بۆتی ڕاناکێشێت، وە کەسانێکیش پێیان ناخۆش بێ کە ئەو ڕزقەت بۆ بێ ناتوانن بیگێڕنەوە).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(إن من ضعف اليقين):** واتە: لە نیشانەی لاوازی یەقینە.

**(أن ترضى الناس بسخط الله):** واتە: خەڵکی ڕازی بکەیت بەناڕازی بوونی خوا.

**(وأن تحمدهم على رزق الله):** واتە: سوپاسی و ستایشی خەڵک بکەیت لەسەر ئەوەی کە خوا ڕزقی پێت بەخشیوە.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە تاوەکو ڕوونی بکاتەوە کە لە نیشانەی لاوازی یەقینە خەڵکی ڕازی بکەیت بەناڕازی بوونی خوا و لە خەڵک بترسیت.

---

[1] أخرجه أبو نعيم في (الحلية) (٥/١٠٦) و (١٠/٤١) ، والبيهقي في (شعب الإيمان) (١/٢٢١ رقم ٢٠٧).

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ڕازی کردنی خەڵک بە ناڕازی بوونی خوا، سوپاس و ستایش کردنی خەڵک لەسەر ئەوەی کە خوا ڕزقی پێت بەخشیوە، هەروەها زەم و لۆمە کردنی خەڵک لەسەر ئەوەی کە خوا ڕزقێک یان شتێکی نەبەخشیوە پێت، لە لاوازی یەقینە.

**٢-** ئەم فەرموودەیە لەسەر ظاهری خۆی نییە لە هەموو ڕووەک، مەبەست بە سوپاس کردن ئەوەیە خوا لەبیر بکەیت.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەگەر خوای گەورەت لە دڵ دابێت بەوەی ئەو ڕزقی بە تۆ داوە، پاشان سوپاسی کەسەکە بکەیت، ئەمە داخلی فەرموودەکە نابێت، بەڵکو ئەمە لە شەرعە، لەبەر وتەی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (من صنع إليكم معروفا فكافئوه، فإن لم تجدوا ما تكافئونه به، فادعوا له حتى تروا أنكم قد كافأتموه).

کەواتە فەرموودەکە لەسەر ظاهری خۆی نییە لە هەموو ڕوویێک، مەبەست بە سوپاس کردن ئەوەیە خوا لەبیر بکەیت ئەمە لە لاوازی یەقینە، هەروەک ئەوە وایە ئەوەی کە نیعمەتی ئەصڵی لەگەڵ تۆ کردووە و لەبیرت کردووە.

ئەگەر کەسێک ماڵێکی هەبێت و هەزار درهەمی پێبدات و پێی بڵێت: بیدە بە فلانە کەس، ئەوەی درهەمەکە وەردەگرێت سوپاسی باوکی دەکات، چونکە ئەگەر تەنها سوپاسی منداڵەکە بکات بە ساویلکە دەژمێردرێت، لەبەرئەوەی منداڵەکە هیچ نەبووە و تەنها بۆی بردووە)[1].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئەگەر ڕزقی بەندە دیارکرا کەس ناتوانێت ڕێگری بکات.

---

[1] القول المفيد.

**وعن عائشة رضي الله عنها: أن رسول الله (ﷺ) قال: (من التمس رضى الله بسخط الناس رضي الله عنه وأرضى عنه الناس، ومن التمس رضى الناس بسخط الله سخط الله عليه وأسخط عليه الناس).**

واته: له عائیشه دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێک بەدوای ئەوەدا بگەڕێت خوا لەخۆی ڕازی بکات و له بەرامبەر ئەوەشدا خەڵکی لێی ناڕازی بن ئەوا خوا و خەڵکیش لێی ڕازی دەبن" واته: خەڵکی موسلمان لێی ڕازی دەبن، وه هەر کەسێک بەدوای ئەوەدا بگەڕێت که خەڵکی ڕازی بکات، لەبەرامبەر ئەوەشدا خوا لێی ناڕازی بێت، ئەوەی خوا لێی تووڕه دەبێت و خەڵکیش لێی تۆڕه دەکات).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(من التمس رضا الله):** واته: هەر کەسێک بەدوای ئەوەدا بگەڕێت خوا لەخۆی ڕازی بکات.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوه ئەم فەرموودەی باسکردووه بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە دەبێت مرۆڤ ترسی خوا پێش ترسی دروستکراوەکان بخات، وه ڕازی بوونی خوا به پێش ڕازی بوونی خەڵک بخات.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە بەدوای ئەوەدا بگەڕێیت خوا لەخۆت ڕازی بکەیت، ئەگەر چی له بەرامبەر ئەوەشدا خەڵکی لێت ناڕازی بن، چونکه خوای گەورەیە سوود و زیان دەگەیەنێت.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروست نییە بەدوای ئەوەدا بگەڕێیت خەڵكی ڕازی بكەیت، لەبەرامبەر ئەوەشدا خوا لێت ناڕازی بێت[1].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیركردنی سیفەتی ڕازی بوون و تووڕە بوون لەسەر شێوەی حەقیقی بۆ خوا، بێ ئەوەی بیچوویێنی بە دروستكراوەكان[2].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دەبێت مرۆڤ ترسی خوا بە پێش ترسی دروستكراوەكانی تر بخات، هەروەها ڕازی بوونی خواش بە پێش ڕازی بوونی خەڵك بخات.

---

(١) القول المفيد.

(٢) القول المفيد.

## باب قول الله تعالى: ﴿وَعَلَى اللهِ فَتَوَكَّلُواْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ [المائدة: ٢٣].

**وقوله:** ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ [الأنفال: ٢].

**وقوله:** ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللّهُ وَمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ [الأنفال: ٦٤].

**وقوله:** ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ﴾ [الطلاق: ٣].

**عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: (حسبنا الله ونعم الوكيل) [ ال عمران: ١٧٣ ]، قالها إبراهيم (ﷺ) حين ألقي في النار، وقالها محمد (ﷺ) حين قالوا له:** ﴿إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ [ال عمران: ١٧٣] **رواه البخاري والنسائي**[1].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** أن التوكل من الفرائض.

**الثانية:** أنه من شروط الإيمان.

**الثالثة:** تفسير آية الأنفال.

**الرابعة:** تفسير الآية في آخرها.

**الخامسة:** تفسير آية الطلاق.

---

[1] أخرجه البخارى (٤٥٦٣،٤٥٦٤)، والنسائي في (الكبرى) (٦/١٥٤ رقم ١٠٤٣٩).

**السادسة:** عظم شأن هذه الكلمة، وأنها قول إبراهيم ومحمد (ﷺ) في الشدائد.

## باب قول الله تعالى: ﴿وَعَلَى اللهِ فَتَوَكَّلُواْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ [المائدة: ٢٣].

## واتە: بە تەواویی پشت بە خوا ببەستن ئەگەر ئێوە ئیماندارن.

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (مناسبەی ئەم بابە لە کتابی تەوحید ئەوەیە: پشت بەخوا بەستن واجبێکە لە واجبەکان، خوا بە تەنیا دانان لە پشت پێ بەستن دا تەوحیدە، وە پشت بەستن بە بێجگە لەخوا شیرکە و پێی لەدین دەردەچێت، پشت بەخوا بەستن مەرجی دروستی ئیسلام و ئیمانە، پشت بەخوا بەستن عیبادەتێکی گەورەیە، دانەری کتاب ئەم بابەی باسکردووە بۆ ئەوەی ئەم عیبادەتە ڕوون بکاتەوە)[1].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: ((توکل): پشت بەستنە بەخوا بۆ بەدەست هێنانی داواکاری و لادانی شتی ناخۆش، لەگەڵ ئەوەش متمانەی تەواوت بەخوا هەبێت و کردەوە ڕێگەپێدراوەکانیش بگریتەبەر، دەبێت ئیلا ئەم شتەی تێدا بێت:

یەکەم: پشت بەخوا ببەستیت بە پشت بەستنێکی ڕاست.

دووەم: هۆکارە ڕێگەپێدراوقنشی بگریتەبەر.

هەر کەسێک زۆرتر پشت بە هۆکارەکان ببەستێت ئەوا پشت بەستنی بەخوا کەم بووە، وە پێچەوانەی ئەوەیە بڵێت تەنها خوام بەسە، هەروەک ئەوە وایە تەنها هۆکار بناغەی بوە بۆ بەدەست هێنانی داواکاری و لادانی ناخۆشی.

هەر کەسێک پشت بەخوا ببەستێت و هۆکار پشت گوێ بخات ئەوا طعنە لە حیکمەتی خوای گەورە داوە، چونکە خوای گەورە بۆ هەموو شتێک هۆکاری داناوە، کەواتە هەر کەسێک پشت تەنها بەخوا ببەستێت بێ هۆکار ئەوە طعنە لە حیکمەتی خوای گەورە،

---

[1] التمهید لاپەڕە (٣٥٩).

چونکە خوای گەورە حەکیمە، وەک: کەسێک پشت بەخوا دەبەستێت بۆ بەدەست هێنانی مناڵ کەچی زەواجی نەکردوە .

پێغەمبەر (ﷺ) ئیمامی ئەوانە بووە کە پشت بە خوا دەبەستن، لەگەڵ ئەمەش هۆکاری گرتۆتەبەر، خواردنی ئامادە دەکرد بۆ سەفەر، کاتێک دەرچوو بۆ جەنگی ئوحد دوو درعی لەبەر کردبوو، کاتێک دەرچوو هیجرەتی کرد کەسێکی بەکرێ گرت بۆ ئەوەی ڕێگای پێ پیشان بدات، نەی فەرموو: من دەڕۆم هیجرەت دەکەم و پشت بەخوا دەبەستم، نەی فەرموو: کەس لەگەڵ خۆم نابەم بۆ ڕێگا، هەروەها خۆی دەپاراست لە سەرما و گەرما، ئەمەش لە پشت پێ بەستنی بەخوا کەم نەکردەوە.

دەگێڕنەوە لە عومەر خوا لێی ڕازی بێت خەڵکی یەمەن هاتن بۆ حەج بە بێ خواردن، هێنایانن بۆ لای عومەر و پرسیاری کرد لێیان، گوتیان: ئێمە لەوانەین کە پشتمان بەخوا بەستووە، عومەر فەرمووی: ئێوە لەوانە نین کە پشتتان بەخوا بەستووە، بەڵکو ئێوە لەوانەن کە پشتان بە خەڵک بەستووە و لەسەر حیسابی خەڵک دەژین)[١].

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ﴾: واتە: بە تەواویی پشت بە خوا ببەستن، معمول پێش خراوە کە جار و مجرورە (وعلى الله)، وە عامل دواخراوە ئەویش ئەمەیە: (توکلوا)، دەلالەت لەسەر حصر دەکات، واتە: پشت بەخوا ببەستن و پشت بە کەسی تر مەبەستن[٢] .

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

---

[١] القول المفيد.

[٢] إعانة المستفيد (٨٣/٢).

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردوە بۆی ئەوەی ڕوونی بکاتەوە پشت بەخوا بەستن واجبە و لە ئیمانە.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە پشت بەستن بەخوا لە ئیمانە، وتەی هاوەڵی موسا لەم ئایەتە بەڵگەیە پشت بەستن بەخوا لە ئیمانە، هەروەک ئەوەیە پێت بڵێت: ئەگەر تۆ کەریم بیت ڕێز لە میوان بگرە، بەڵگەیە ڕێز لە میوان گرتن لە کەرەمە، ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ نەفی کردنی تەواوی ئیمان لەسەر خوا؛ ئیلا ئەگەر هەموو ئیعتمادی لەسەر بێجگە لەخوا بێت، ئەو کات شیرکی گەورەیە و نەفی هەموو ئیمان دەکات[1].

پشت بەستن بە بێجگە لەخوا دوو حاڵەتە:

حاڵەتی یەکەم: پشت بەستن بە بێجگە لەخوا هەیە شیرکە، ئەویش ئەوەیە پشت بە دروستکراوێک دەبەستیت لە شتێک کە لە توانای کەس دا نییە تەنها خوا نەبێت، وەک: پشت بە دروستکراوێک ببەستی بۆ لێ خۆش بوونی تاوان، پشت بە دروستکراوێک ببەستێت بۆ بەدەست هێنانی خێر و چاکەی ئاخیرەت، یان پشت بە دروستکراوێک ببەستێت بۆ بەدەست هێنانی مناڵ، یان بەدەست هێنانی پیشە، پشتی پێ دەبەستێت بە دڵ و توانای هیچیشی نییە، ئەمە لای گۆڕ پەرستان و پیاوچاک پەرستان زۆرە، چونکە ئەوان ڕوو دەکەنە مردووەکان بە دڵ و پشتیان پێ دەبەستن، کارەکانی دونیا و ئاخیرەت دەدەنە دەست مردووەکان و پشتیان پێ دەبەستن و ئەوانیش توانایان نییە و ناتوانن هیچیان بۆ بکەن، ئەم عیبادەت کردنە بۆ بێجگە لەخوا شیرکی گەورەیە و نەفی ئەصڵی تەوحید دەکات.

---

[1] القول المفيد.

حاڵەتی دووەم: پشت بە دروستکراوێک دەبەستێت لە شتێک خوای گەورە توانای پێداوە، ئەمە جۆرێکە لە شیرک، بەڵکو شیرکی شاراوەیە و شیرکی بچووکە، لەبەر ئەوە هەندێک لە ئەهلی عیلم دەڵێن: ئەگەر یەکێک بڵێت: (توكلت على الله و علیك)، ئەمە شیرکی بچووکە، لەبەر ئەوە دەڵێن: دروست نییە بڵێیت: (توكلت على الله ثم علیك)، چونکە دروستکراو بەشی نییە لە (توکل)، توکل ئەوەیە کارەکان بدەیتە دەست خوا و بەدڵ پشتی پێ ببەستیت، دروستکراو شایستەی هیچ لەمانە نییە[١].

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە واجبە بە پاکی تەنها پشت بەخوا ببەستیت، هەروەها هۆکارێکە لە هۆکارەکانی سەرکەوتن بەسەر دوژمن[٢].

---

[١] التمهید لاپەڕە (٣٦٠).
[٢] إعانة المستفید (٨٣/٢).

**وقوله:** ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ [الأنفال: ٢].

واتە: بێگومان ئیماندارانی ڕاستەقینە تەنها ئەوانەن: (یەکەم) کە کاتێک ناوی خوا برا، ئەوە دڵەکانیان دەترسێت و دەهەژێت، (دووهەم) کاتێکیش ئایەت و فەرمانەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێتەوە ئەوا ئیمان و باوەڕیان زیاد دەکات، (سێهەم) لە هەموو کارو بارێکیشیاندا هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن.

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ﴾: (إنما): أداة الحصر، حصر جێگیر کردنی حوکمە و نەفی کردنی بێجگە لە خۆیەتی. واتە: ئیماندار نیە ئیلا ئەمانە نەبن، لەم ئایەتە دواتر پێنج سیفەتی باسکردووە، خوای گەورە باسی ئەوەی کردن مەرجی ئیمان تەقوای خوا و چاککردنی نێوانی خۆتانە و گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەیەتی، دواتر باسی سیفەتی ئیماندارە ڕاستەقینەکان و ئیمان تەواوەکان دەکات لەم دوو ئایەتە.

﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا﴾: ابن کثیر ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (چەندین زانا ئیجماع نەقل دەکەن لەسەر زیاد بوون و کەم بوونی ئیمان، لەوانە شافعی و ئەحمەد و ئەبو عوبێد)[1]

﴿وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾: بە کاری ڕانەبردوو دەری بڕیوە، دەلالەت لەسەر بەردەوام بوون دەکات لەسەر تەوەکول خستنەسەر خوای گەورە، هەروەها نوێژ و ماڵ بەخشینیش بە ڕانەبردوو دەری بڕیوە دەلالەت لەسەر بەردەوام بوون لەسەر نوێژ و ماڵ بەخشین دەکات،

---

(١) تفسير ابن كثير (٣/٥٥٢).

باشترین عیبادەت ئەوەیە لەسەری بەردەوام بیت، وە باشترین عیبادەت خاوەنەکەشی دەکاتە بەاشترین بەندە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە تاوەکو ڕوونی بکاتەوە پشت بەخوا بەستن واجبە و نابێت پشت بە کەسێکی تر ببەستیت.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** (حصر) کردنی ئیمان لەو کەسانەی ئەم سیفەتانەی تێدایە، لەبەر وتەی: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ۝ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾.

ئیمان تەنها بە خۆ ڕازاندنەوە و ئاوات خواستن نییە، بەڵکو بەوەیە کە لە دڵی مرۆڤ دایە، کردەوە ئەنجام دان ڕاستگۆی ئیمانەکە بەدیار دەخات.

حەسەن ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەگەر بەندە چێژی ئیمانی کرد و هەستی بە شیرینیەکەی کرد، ئەوە چێژی ئیمان و شیرینیەکەی لەلای هەیە، بەرووبوومەکەی لەسەر زمان و ئەندامەکانی لاشەی بەدیار دەکەوێت، زمانی شیرین دەبێت بە زیکری خوای گەورە کردن، ئەندامەکانی لاشە بەخێرایی ملکەچ دەبن بۆ تاعەتی خوا)[١]

**٢-** فەزلی کردەوەکانی دڵ، لەبەر ئەوە پێش کردەوەی ئەندامەکانی لاشە خراوە لە نوێژ و ماڵ بەخشین، چونکە ئەسڵە بۆ کردەوەکانی لاشە و هۆکاری چاک بوونیەتی.

(١) (لطائف المعارف) لابن رجب لاپەڕە (٢٢٦).

**٣-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە ئەم پێنج عیبادەتانە لە گەورەترین پلەکانی ئیمانن.

**٤-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە واجبە پشت بەخوا ببەستیت و نابێت پشت بە کەسی تر ببەستیت.

**٥-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە ئیمانداری تەواو ئەگەر ترسێنرا بە خوا دەترسێت، ئەگەر ئامۆژگاری کرا بەخوا بیر دەکاتەوە و تێ دەگات و وەردەگرێت، ئەگەر پێیان بڵێیت: (اتقوا الله)، لەخوای گەورەو سزاکەی دەترسن، هەروەها ئەگەر ئامۆژگاری کران لە خوا دەترسن، بە پێچەوانەی ئەوانەی خوای گەورە لە دەربارەیاندا دەفەرموویت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتْهُ ٱلْعِزَّةُ بِٱلْإِثْمِ ۚ فَحَسْبُهُۥ جَهَنَّمُ ۚ وَلَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ۝٢٠٦﴾ [البقرة: ٢٠٦][1].

**٦-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە ئیمان زیاد دەبێت.، بوخاری و پێشەوایانی تر ئەم ئایەتە و ئایەتی تری هاوشێوەی ئەمە دەکەنە بەڵگە بەوەی کە ئیمان زیاد دەبێت کە ئەمە وتەی زۆربەی زانایانە، بەڵکو هەندێک ئیجماع نقل دەکەن وەک ئیمام شافعی و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئەبو وعوبێد[2].

**٧-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە ئەگەر ئیماندار ئایەتەکانی خوای گەورەی بەسەردا خوێندرا و گوێی لێ بوو ئیمانی زیاد دەبێت، سوود لە قورئان وەردەگرێت.

**٨-** هەندێ زانا ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە دروست نییە هەموو ماڵ ببەخشیت، چونکە (من) بۆ هەندێک دێت، بەڵام وتەی ڕاست (من) بۆ بیان الجنسە.

وتەی: ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾، پیتی (من) بۆ هەندێکە، کەواتە مەدحەکە بۆ ئەوانەیە کە هەندێک لە ماڵی خۆیان دەبەخشن نەک هەموو، یان لەوانەیە پیتی (من) بۆ بیان

---

[1] إعانة المستفيد (٨٤/٢).
[2] تفسير ابن كثير (٢٧٥/٢).

الجنس بێت، کەواتە لەسەر ئەمە مەدحەکە بۆ بەخشینی هەندێک لە ماڵ و هەموو ماڵ دێت، ئەوەی ڕاست بێت بۆ بیان الجنسە، هەرکەسێک هەموو ماڵی خۆی ببەخشێت داخلی مەدح دەبێت ئەگەر پشتی بەخوا بەست بەوەی خوای گەورە رزقی خۆی و منداڵی بدات هەروەک چۆن ئەبوبەکر ئەمەی کرد، بەڵام ئەگەر ماڵ و منداڵی پێویستیان پێ ی هەبوو، نابێت لەم حاڵەتە هەموو ماڵی ببەخشێت[1].

زانایان دەڵێن دروستە مرۆڤ هەموو مالی خۆی ببەخشێت لەکاتی لەش ساغی، واتە: جگە لە نەخۆشی مردن، ئەم مال بەخشینە دروستە بە دوو مەرج:

ـ کەسەکە موچەیەکی هەبێت یان ئیشی هەبێت بتوانێت خۆی بژینێت دوای هەموو مال بەخشین.

ـ دەبێت لەوانە بێت تەوەکولێکی باشی هەبێت و ئارام بگرێت لەسەر هەژاری.

ئەگەر ئەم دوو مەرجەی تێدا نەبوو باش نییە هەموو مال ببەخشیت، چونکە ئەگەر هەموو مال ببەخشێت ئەمین نییە لە فیتنەی هەژاری و نەفس، نەوەک نەفس پەشیمان بێتەوە و پاداشتی پوچ بێتەوە، وە دەبێتە مشەخۆر بەسەر خەڵکەوە.

باشتر وایە مرۆڤ هەندێک ماڵ بۆ خۆی بەجێ بێلێت، چونکە کاتێک کەعبی کوڕی مالک ویستی هەموو ماڵی خۆی ببەخشێت پێغەمبەری خوا فەرمووی: (هەندێک ماڵی خۆت هەلگرە ئەمە بۆت باشترە)[2].

---

[1] القول المفید.

[2] رواه البخاري (٢٥٥٢)، ومسلم (٤٩٧٣).

**وقوله:** ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللهُ وَمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ [الأنفال: ٦٤].

واته: ئەی پێغەمبەر (ﷺ): تەنها خوا بەسە بۆ خۆت و ئەوانەی شوێنت کەوتوون لە ئیمانداران کە پشتگیر و یاریدەدەرتان بێت.

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللَّهُ وَمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾: لە ابن عباس دەگێڕنەوە خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت دەفەرموویێت: ﴿حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ [آل عمران: ١٧٣]، کاتێک ئیبراهیم هەڵدرایە ناو ئاگرەوە ئەمەی گوت، محمدیش (ﷺ) هەر وای گوت کاتێ پێیان گوت: (بە تەئکید خەڵکی کۆبوونەوە بۆ جەنگی ئێوە، جا کەوابوو لێیان بترسن، ئەمانیش ئیمانیان بەوە زیادی کرد و گوتیان: "خوامان بەسە و هەر ئەو باشترین کەسە کە کارەکانمان بدەینە دەستی، خۆی دەزانێت چی باشە ئەوەمان بۆ دەکات).

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (وشەی (حسب) بۆ خوایە بە تەنیا و کەسی تری لەگەڵ نییە، لەبەر وتەی: ﴿حَسْبُنَا اللَّهُ﴾، نەیان فەرموو: (حسبنا الله ورسوله)، بەڵکو گوتیان: (حسبنا الله وحده)، هەروەک چۆن بە تەنیایە بۆ تەوکل)[1].

﴿وَمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾: سەبارەت بە (عطف) زانایان دوو وتەیان هەیە، وتراوە: خوا بەسە بۆ تۆ، وە ئەوانەی شوێن کەوتووانی تۆن بەسن بۆ تۆ، پیتی (من) (معطوف)ە لەسەر ناوی خوا، چونکە نزیکترە، ئەگەر (عطف) لەسەر کاف بوایا (حسبك)، دەبوایا دووبارە کرابوایا، ئەمە وەک وتەی خوای گەورەیە کە دەفەرموویێت: ﴿هُوَ الَّذِى أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ

(١) تفسير سورة آل عمران (٢/٤٥٠).

﴿وَبِالْمُؤْمِنِينَ﴾ [الأنفال: ٦٢]، خوای گەورە پشتگیری پێغەمبەری کرد بە ئیمانداران، لەم ئایەتەش بەهەمان شێوە، ئەم وتەیە لاوازە لە چەند ڕووەوە:

یەکەم: ئەو وتەی کە دەڵێن: (عطف) بۆ نزیکترین دەگەڕێتەوە ئەمە ڕاست نییە، دەکرێت (عطف) بۆ پێشتر بگەڕێتەوە، هەتا زانایانی زمان دەڵێن ئەگەر (معطوف)ەکان زۆر بوون بۆ (عطف)ی یەکەمە.

دووەم: وتەیان کە دەڵێن: ئەگەر (عطف) لەسەر کاف بکرێت واجب دەبوو دووبارە بکرێتەوە، وتەی ڕاست واجب نییە، هەروەک ابن مالک دەفەرموویت:

وليس عندي لازما إذ قد أتى        في النثر والنظم والصحيح مثبتا

سێیەم: وتەی خوای گەورە کردنە بەڵگە: ﴿هُوَ الَّذِي أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ﴾، (تأييد) هەمان مانای (حسب)ی نییە، چونکە مانای (حسب) ئەوەیە پشتی پێ دەبەستێت، بەڵام مانای (تأييد) واتە سەری دەخات، کەواتە جیاوازی هەیە لە نێوانیان.

چوارەم: خوای گەورە کاتێک باسی (حسب) دەکات بە پاکی دەیداتە پاڵ نەفسی خۆی، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوا مَا آتَاهُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ سَيُؤْتِينَا اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَرَسُولُهُ إِنَّا إِلَى اللَّهِ رَاغِبُونَ﴾ [التوبة: ٥٩]، جیاوازی خستۆتە نێوان (حسب) و (الإيتاء)، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿حَسْبِيَ ٱللَّهُۖ عَلَيۡهِ يَتَوَكَّلُ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ﴾ [الزمر: ٣٨]، چۆن تەوکل بۆ بێجگە لەخوا دروست نییە، (حسب)یش بەهەمان شێوەیە.

پێنجەم: وتەی (ومن اتبعك)، ئەوەی ڕێگر بێت لەوەی هاوەڵان بەس بن بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەیە هاوەڵان شوێنکەوتەی پێغەمبەرن (ﷺ)، چۆن دەکرێت شوێنکەوتوو بەس

بێت بۆ شوێن کەوتراو؟ ئەمە ناگونجێت هەرگیز، ئەوەی ڕاست بێت (معطوف)ە لەسەر پیتی (کاف) لە وتەی: (حسبك) واتە: خوای گەورە بەسە بۆ شوێن کەوتووانت لە ئیماندارەکان، تەوکل بخەنە سەر خوا هەمووتان، تۆ و شوێن کەوتووەکانت)[1].

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

عبدالله بن جار الله دەفەرموویێت: (ئەگەر خوای گەورە بەس بێت بۆ بەندە، واجبە پشت بە کەس نەبەستێت ئیلا بە خوا نەبێت)[2].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

١- خطاب بە بانگکردن بۆ ئاگادارکردنەوە و بە ئاگاهاتنە، لەبەر وتەی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ﴾.

٢- ڕێز و شەرەفی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە بانگ کردنی بە شێوەیەکی تایبەت لەنێو هەموو پێغەمبەرەکان، لەبەر وتەی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ﴾.

٣- جێگیرکردنی پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ).

٤- کیفایەتی خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەی و ئیمانداران بە پاراستن و سەرخستن و پشتگیر کردنی، لەبەر وتەی: ﴿حَسْبُكَ اللَّهُ وَمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾، هەر کەسێک تەوکل نەخاتە سەر خوا، خوای گەورە بەتەمای ئەو شتە جێی دەهێڵێت کە پشتی پێ بەستووە، ئەگەر خوای گەورە بەس بێت واجبە توکل بخەیتە سەری و تەنها پشت بەو ببەستیت.

---

(١) القول المفيد.

(٢) الجامع الفريد (١٣٦).

**٥-** فەزلی ئیمان هێنان و شوێن پێغەمبەری خوا کەوتن لەبەر کیفایەتی خوای گەورە بۆیان.

وقوله: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ﴾ [الطلاق: ٣].

واتە: جا ئەوەی پشت بە خوا ببەستێت ئەوا ئەو زاتەی بەسە بۆ ئەوەی یاریدەدەری بێت، چونکە بەڕاستی خوا کارو فەرمانی خۆی بە ئەنجام دەگەیەنێت، بێگومان خوا بۆ هەموو شتێک نەخشەیەکی دیاریکراوی بڕیارداوە (کە دەبێت پەیڕەو بکرێت).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ﴾: واتە: هەر کەسێک پشت بەخوا ببەستێت.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابەتە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە واجبە توکل بخەیتە سەر خوا، وە توکل خستنە سەر بێجگە لەخوا شیرکە.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە هەر کەسێک توکل بخاتە سەر بێجگە لەخوا ڕیسوا دەکرێت، چونکە بێجگە لەخوا بۆی بەس نییە[1].

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە توکل خستنەسەر خوا واجبە.

---

[1] القول المفید (٢/٢٤٠-٢٤١).

**عن ابن عباس رضي الله عنهما قال:** ﴿حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾ [آل عمران: ١٧٣]، **قالها إبراهيم (ﷺ) حين ألقي في النار، وقالها محمد (ﷺ) حين قالوا له:** ﴿إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ [آل عمران: ١٧٣] رواه البخاري والنسائي[1].

واتە: لە ابن عباس دەگێڕنەوە خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت دەفەرموویێت: ﴿حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾، كاتێک ئیبراهیم هەڵدرایە ناو ئاگرەوە ئەوەی گوت، محمدیش (ﷺ) هەر وای گوت كاتێ پێیان گوت: (بە تەئكید خەڵكی كۆبوونەوە بۆ جەنگی ئێوە جا كەوابوو لێیان بترسن، ئەمانیش ئیمانیان بەوە زیادی كرد و گوتیان: "خوامان بەسە و هەر ئەو باشترین كەسە كە كارەكانمان بدەینە دەستی، خۆی دەزانێت چی باشە ئەوەمان بۆ دەكات).

### ڕاڤەی وشەكانی فەرموودەكە:

﴿إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ﴾: واتە: بە تەئكید خەڵک كۆبوونەوە بۆ جەنگی ئێوە.

﴿فَاخْشَوْهُمْ﴾: واتە: جا كەواتە لێیان بترسن.

### هۆكاری باسكردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری كتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسكردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بكاتەوە واجبە پشت بەخوا ببەسترێت، وە ئیمانداری تەواو لە كاتی تەنگانەدا توكلی بەدیار دەكەوێت.

---

[1] أخرجه البخاري (٤٥٦٣،٤٥٦٤)، والنسائي في (الكبرى) (٦/١٥٤ رقم ١٠٤٣٩).

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** وتەی ابن عباس مەجالی بیرورِای تێدا نییە و حوکمی رِەفعی هەیە، ابن عباس لەو کەسانەیە لە نەوەی ئیسرائیلیش رِیوایەت دەکات لەوانەیە لەوانی وەرگرتبێت، بەڵام بە شێوەیەکی براوە ئەمەی گوتووە و بەراوردی کردووە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)، دوورە لە نەوەی ئیسرائیلی وەرگرتبێت[1].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە وشەی (حسب) بۆ خوایە بە تەنیا و کەسی تری لەگەڵ نییە، لەبەر وتەی: ﴿حَسۡبُنَا اللّٰهُ﴾، نەیان گوت: (حسبنا الله ورسوله)، بەڵکو گوتیان: حسبنا الله وحده هەروەک چۆن بە تەنیایە بۆ توکل[2].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئیماندار چەندە بەڵاو ناخۆشی بەسەردا زۆرو توند بێت، ئەوا رِوو لە خوا دەکات و ئیمانی زیاد دەبێت[3].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی ناوی (الوكيل) بۆ خوا[4].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەرووبوومی تەوکل بۆ سەر خوا بۆمان رِوون دەردەخات، ئەویش رِزگار بوونە لە تەنگانە و بەدەست هێنانی ئارامی و سەقامگیرییە.

---

[1] القول المفيد.

[2] تفسير سورة آل عمران (٤٥٠/٢).

[3] تفسير سورة آل عمران (٤٤٩/٢).

[4] تفسير سورة آل عمران (٤٤٩/٢).

## باب قول الله تعالى: ﴿أَفَأَمِنُواْ مَكۡرَ ٱللَّهِۚ فَلَا يَأۡمَنُ مَكۡرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ٩٩﴾ [الأعراف: ٩٩]

**وقوله:** ﴿قَالَ وَمَن يَقۡنَطُ مِن رَّحۡمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ٥٦﴾ [الحجر: ٥٦]

**عن ابن عباس رضي الله عنهما، أن رسول الله (ﷺ) سئل عن الكبائر، فقال: (الشرك بالله، واليأس من روح الله، والأمن من مكر الله)[١].**

**وعن ابن مسعود رضي الله عنه قال: (أكبر الكبائر: الإشراك بالله، والأمن من مكر الله، والقنوط من رحمة الله، واليأس من روح الله) رواه عبد الرزاق[٢].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير آية الأعراف.

**الثانية:** تفسير آية الحجر.

**الثالثة:** شدة الوعيد فيمن أمن مكر الله.

**الرابعة:** شدة الوعيد في القنوط.

---

[١] أخرجه البزار (١/٧١ رقم ١٠٦/كشف)، والبيهقي في (شعب الإيمان) (١/٢٧١ رقم ٢٩١).

[٢] أخرجه عبدالرزاق في (المصنف) (١٠/٤٥٩ رقم ١٩٧٠١)، والطبراني في (الكبير) (٩/١٥٦ رقم ٨٧٨٣ و ٨٧٨٤)، والبيهقي في (شعب الإيمان) (٢/٢٠ رقم ١٠٥٠).

## باب قول الله تعالى: ﴿أَفَأَمِنُواْ مَكۡرَ ٱللَّهِۚ فَلَا يَأۡمَنُ مَكۡرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ٩٩﴾ [الأعراف: ٩٩]

## باسی ئەمین بوون لە فێڵ و پیلانی خواو، نائومێد بوون لە ڕەحمی خوا.

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (مەبەست لەم بابە: ڕوون کردنەوەی کۆکردنەوەی ترسان و ئومێد بوونە بەخوا کە واجبێکە لە واجبەکانی ئیمان، تەوحید تەواو نابێت مەگەر بەمە، کۆنەکردنەوەی ترسان و ئومێد بوون بەخوا نەفی تەواوی تەوحید دەکات، واجبە لەسەر بەندە ترسی لەگەڵ ئومێد بوون بە خوا بێت، هەروەها ئومێدی لەگەڵ ترس بێت، وە ئەمین نەبێت لە فێڵی خوا هەروەک چۆن بێ ئومێد نابێت لە ڕەحمی خوا)[1].

﴿أَفَأَمِنُواْ مَكۡرَ ٱللَّهِۚ فَلَا يَأۡمَنُ مَكۡرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ٩٩﴾ [الأعراف: ٩٩]

خوای گەورە دەفەرموویت: (ئایا ئەوانە لە فێڵی خوا ئەمین و بێ خەم بوون، هیچ کەس لە فێڵی خوا ئەمین و بێ خەم نابێ مەگەر قەومێک کە تەواو خەسارەتمەند بن).

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿أَفَأَمِنُواْ مَكۡرَ ٱللَّهِۚ﴾: واتە: ئایا ئەوان لە فێڵی خوا ئەمین و بێ خەم دەبن.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٣٦٦).

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردوە بۆ ئەوەی حوکمی ئەمین بوون لە مەکری خوا ڕوون بکاتەوە.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە حەڕامە ئەمین بیت لە فێڵی خوا، ئەم ڕستەیە لەسەر شێوەی استفهامە، دەلالەت لەسەر ئینکاری و سەرسوڕمان دەکات[1].

**٢-** ئەم ئایەیە بەڵگەیە بۆ ئاگاداری وەرگرتن لە نیعمەتی خوای گەورە بۆ بەندە، چونکە جاری وایە بەندە ڕادەکێشێت و هەستی پێ ناکات.

**٣-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە موشریکەکان سیفەتیان ئەوە بوو ئەمین بوون لە سزای خوا و نەدەترسان[2].

**٤-** نابێت سیفەتی مەکر بدرێتە پاڵ خوای گەورە مەگەر لەو شوێنە بێت کە مەدح بێت، ئەگەر وترا چۆن وەسفی خوای گەورە دەکرێت بە مەکر لەگەڵ ئەمەش ئەوەی دیار بێت زەمکراوە؟

دەوترێ: مەکر لە شوێنی خۆی سوپاس کراوە و بەڵگەیە لەسەر بەهێزی ماکر، هەروەها باڵا دەستە بەسەر بەرامبەرەکەی، لەبەر ئەوە وەسف ناکرێت بە مطلقی نابێت بڵێیت: خوای گەورە ماکیرە، بەڵکو ئەمە لەو شوێنە باس دەکرێت کە مەدح بێت، وەک وتەی خوای گەورە: ﴿وَيَمۡكُرُونَ وَيَمۡكُرُ ٱللَّهُۖ﴾ [الأنفال: ٣٠]، هەروەها خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا وَمَكَرۡنَا مَكۡرٗا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ۝٥٠﴾ [النمل: ٥٠]، وەک وتەی خوای گەورە: ﴿أَفَأَمِنُواْ مَكۡرَ ٱللَّهِۚ﴾، ئەم سیفەتە نەفی ناکرێت بە مطلقی، بەڵکو لەو شوێنەی

---

[1] القول المفيد.

[2] التمهيد لاپەڕە (٣٦٦).

مەدحە وەسفی پێ دەکرێت و لەو شوێنەی مەدح نییە وەسفی پێ ناکرێت، هەروەها ناوی لێ نانرێت و نابێت بگوترێ یەکێک لە ناوەکانی خوای گەورە (ماکر)ە.

سەبارەت بە خیانەت نابێت وەسفی خوای گەورەی پێ بکرێت بە مطلقی، چونکە زەمە بە هەموو شێوەیەک، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن يُرِيدُواْ خِيَانَتَكَ فَقَدْ خَانُواْ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ فَأَمْكَنَ مِنْهُمْۗ﴾ [الأنفال: ٧١]، لەم ئایەتە نەیفەرموو: خیانەتی لەوان کرد.

سەبارەت بە (خداع) ئەویش وەک مەکر وایە و وەسفی خوای گەورەی پێ دەکرێت لەو شوێنەی کە مەدحە[١].

نابێت وەسفی خوای گەورە بکەیت بە کید، ئیلا ئەگەر بۆ بەرامبەر بێت.

ابن تیمیه ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەم ناوانە: المكر و الاستهزاء و السخرية ، ئەگەر مەکر بیکەیت بەرامبەر بە کەسێک شایستەی سزا نەبێت ئەوا دەبێتە ستەم بۆی، بەڵام ئەگەر بکەیت بەرامبەر کەسێک تاوانی بەرامبەر کەسێک کردووە ئەوا سزایە بۆی و کردەوەکەی دادپەروەرییە)[٢].

---

[١] القول المفيد.

[٢] مجموع الفتاوى (١١١/٧).

**وقوله:** ﴿قَالَ وَمَن يَقۡنَطُ مِن رَّحۡمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ٥٦﴾ [الحجر: ٥٦]

واته : خوای گەورە دەفەرموویت: (کێ هەیە لە ڕەحمەتی پەروەردگار نائومێد بێت مەگەر ئەو کەسانەی کە تەواو گومڕا بوون).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿قَالَ وَمَن يَقۡنَطُ مِن رَّحۡمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ﴾: ئەم ڕستەیە ئیبراهیم (علیه السلام) گوتی کاتێک فریشتە هاتنە لای لەسەر شێوەی مرۆڤ وەک میوان مەبەستیان ئەوە بوو بچن قەومی لوط لەناو ببەن[1] .

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

عبدالله بن جار دەفەرموویت: (بێ ئومێد بوون لە ڕەحمی خوای گەورە نەفی تەواوی تەوحید دەکات، هەروەک چۆن ئەمین بوون لە مەکری خوای گەورە نەفی تەواوی تەوحید دەکات)[2].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە بێ ئومێد بوون لە ڕەحمی خوای گەورە لە تاوانە گەورەکانە، زانایان دەڵێن گومانی تێدا نیە بێ ئومێد بوون لە ڕەحمی خوا سیفەتی کافرەکان و گومڕابووەکانە، هەروەها سیفەتی کافرەکانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش ناتوانیت بڵێیت هەر کەسێک سیفەتێک لە سیفەتەکانی کافری تێدا بێت کافرە بە هەموو شێوەیەک.

---

[1] القول المفيد.

[2] الجامع الفريد.

زانایان دەڵێن بێ ئومێد بوون لە ڕەحمی خوای گەورە حاڵەت هەیە تووشی کوفر بوە و حاڵەتیش هەیە تووشی تاوانێک بوە لە تاوانە گەورەکان:

یەکەم: ئەگەر ئومێدی بەڕەحمی خوا نەما و باوەڕی وابوو خوا لێی خۆش نابێت یان لە فلانە کەس خۆش نابێت و ئینکاری ڕەحم و لێ خۆش بوونی خوا بکات ئەمە کوفرە چونکە قورئانی بەدرۆ خستۆتەوە، لە کاتێکدا ڕەحمی خوا هەموو شتێکی گرتۆتەوە.

دووەم: ئەگەر ئومێدی بە ڕەحمی خوا نەما و بە دووری دانا لێ ی خۆش بێت لەبەر گەورەیی تاوانەکە لەکاتێکدا ئینکاری ڕەحم و لێ خۆش بوونی خوا ناکات ئەمە تووشی تاوانێکی گەورە بووە.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (بێ ئومێد بوون لە ڕەحمی خوا دروست نییە چونکە گومانی خراپ بردنە بە خوا لە دوو ڕووەوە:

یەکەم: طعن دانە لە توانای خوای گەورە، چونکە هەر کەسێک بزانێت خوای گەورە باڵا دەستە بەسەر هەموو شتێک ئەوا هیچ شتێک بە دوور نازانێت و بە دووری ناخات لە توانای خوای گەورە.

دووەم: طعن دانە لە ڕەحمی خوای گەورە، چونکە هەر کەسێک بزانێت خوای گەورە ڕەحیمە ئەوا بە دووری نازانێت ڕەحمی پێ بکات، لەبەر ئەوە ئەوەی بێ ئومێد بووە لە ڕەحمی خوای گەورە گومڕایە)[١].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەمە بەڵگەیە سیفەتی ئەوانەی گومڕا بوونە ئەوەیە کە بێ ئومێد بوونە لە ڕەحمی خوای گەورە، هەروەها ماناکەی ئەوە دەگەیەنێت کە سیفەتی تەقوادار و هیدایەت دراوەکان ئەوەیە کە بێ ئومێد نابن لە ڕەحمی خوای

---

[١] قول المفيد.

گەورە، بەڵکو ئومێدیان هەیە بە ڕەحمی خوای گەورە، هەردووک پێکەوە کۆکردنەوەی خوف و رجاء واجبە لە ڕووی شەرعەوە، ترسان عیبادەتە و ئومێد بوون بە ڕەحمی خواش عیبادەتە، کۆبوونەوەیان پێکەوە لە دڵ دا واجبە، دەبێت ئیلا هەردووکیان پێکەوە لە دڵ دا کۆببنەوە تاکو عیبادەت دروست بێت)[١].

---

[١] التمهید لاپەڕە (٣٦٨).

**عن ابن عباس رضي الله عنهما، أن رسول الله (ﷺ) سئل عن الكبائر، فقال: (الشرك بالله، واليأس من روح الله، والأمن من مكر الله)[١].**

واتە: لە ابن عباس دەگێڕنەوە خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت دەفەرموویت: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەبارەت بە تاوانە گەورەکان، فەرمووی: (شەریک بۆ خوا بڕیاردان، نائومێد بوون لەوەی کە خوا دەروی خێرت لێ بکاتەوە، وە ئەمین بوون لە فێڵی خوا).

## ڕاقەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(اليأس من روح الله):** (يأس) نەمانی ئومێدە، (الروح) نزیکە لە مانای ڕەحم، واتە: ڕزگار بوون و دەرگای خێر بەسەردا کردنەوە.

**(الأمن من مكر الله):** واتە: سەرپێچی خوا دەکات لەگەڵ ئەمەش خوای گەورە نیعمەتی لەگەڵ دەکات و ڕایدەکێشێت.

## هۆکاری باسکردنی فەرموودەکە لەم بابە:

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (ڕووی هێنانەوەی ئەمە فەرموودەیە لەم بابە ئەوەیە: بێ ئومێد بوونی لە ڕەحمی خوای گەورەیە و نەمانی (الرجاء)ە لە دڵ دا، عیبادەتی ڕەجای تەرک کردووە کە لە تاوانە گەورەکانە، هەروەها ئەمین بوون لە مەکری خوا نەمانی ترسە لە دڵدا و لە تاوانە گەورەکانە، نەبوونی ڕەجا لە تاوانە گەورەکانە و نەبوونی ترسیش لە تاوانە گەورەکانە، لە تاوانە گەورەکانە لەڕووی کردەوەی دڵ، کۆبوونەوەی هەردوو تاوان کە نە ترسی لا مابێت و نە ڕەجا گەورەترە لە تەرک کردنی ترس بە

[١] أخرجه البزار (١/٧١ رقم ١٠٦/كشف)، والبيهقي في (شعب الإيمان) (١/٢٧١ رقم ٢٩١).

تەنیا، یان تەرک کردنی ڕەجا بە تەنیا لەبەر ئەوە لەم فەرموودەیە هەردووکی باسکردووە)[1].

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە تاوان دەبەش دەکرێت بۆ دوو بەش، تاوانی گەورە و تاوانی بچووک.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە شیرک لە تاوانە گەورەکانە بە هەموو جۆرەکانییەوە، جا شیرکی گەورە بێت یان بچووک بێت یان شاراوە بێت، ظاهری فەرموودەکە مطلقە: مەبەست پێی شیرکی گەورە و بچووکە، ئەمە وتەی ڕوون و دیارە، چونکە شیرکی بچووک لە تاوانی گەورە گەورەترە، ابن مسعود دەفەرمووێت: (لأن أحلف بالله كاذبا أحب إلي من أن أحلف بغيره صادقا)، لەبەر ئەوە تاوانی شیرک گەورەترە لە تاوانی درۆ، ئەمەش بەڵگەیە شیرک لە تاوانە گەورەکانە بە مطلقی، شیرک بەخوا ئەمانە لەخۆ دەگرێت، شیرک لە پەروەردگارییەتی و بەندایەتی و ناو و سیفەت دا)[2].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بێ ئومێد بوون لە ڕەحمی خوای گەورە لە تاوان گەورەکانە.

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئەمین بوون لە مەکری خوای گەورە لە تاوانە گەورەکانە.

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بانگخواز دەبێت لە شتی گرینگتر دەست پێ بکات، چونکە پێغەبەر (ﷺ) کاتێک ویستی هاوەڵان فێر بکات بە گرینگترینیان دەستی پێ کرد کە شەریک بۆ خوا بڕیاردانە.

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٣٦٩-٣٧٠)..

[2] القول المفيد.

**وعن ابن مسعود رضي الله عنه قال: (أكبر الكبائر: الإشراك بالله، والأمن من مكر الله، والقنوط من رحمة الله، واليأس من روح الله) رواه عبد الرزاق[١].**

واتە: لە ابن مسعود دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: (گەورەترینی تاوانە گەورەکان ئەمانەن:

١- شەریک بۆ خوا دانان.

٢- ئەمین بوون لە فێڵی خوا.

٣- نائومێد بوون لە ڕەحمی خوا.

٤- بە دوور زانین و نائومێد بوون لەوەی کە خوا دەرگای خێرت لێ بکاتەوە).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(الإشراك بالله):** ئەمە گەورەترین تاوانی گەورەیە.

**(القنوط من رحمة الله):** (قنوط): ئەوەیە ڕەحمی خوای گەورە بە دوور دابنێیت و بەدەست هێنانی شتەکە بەدوور ببینیت.

**(والقنوط من رحمة الله، واليأس من روح الله):** صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: ((قنوط من رحمة الله)، عامە، چونکە ڕەحم (عام)ترە لە روح، ڕەحم

---

[١] أخرجه عبدالرزاق في (المصنف) (١٠/٤٥٩ رقم ١٩٧٠١)، والطبراني في (الكبير) (٩/١٥٦ رقم ٨٧٨٣ و ٨٧٨٤)، والبيهقي في (شعب الإيمان) (٢/٢٠ رقم ١٠٥٠).

ڕاكێشانی نیعمەت و لادنی ناخۆشی لەخۆ دەگرێت، ڕوح زۆرینەی جار بۆ ڕزگار بوونە لە بەڵاو ناخۆشی)[١].

**هۆكاری باسكردنی فەرموودەكە لەم بابە:**

دانەری كتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسكردووە تاوەكو ڕوونی بكاتەوە واجبە موسڵمان ترس و ئومێد بەخوا بوون پێكەوە كۆ بكاتەوە.

**سوودەكانی فەرموودەكە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەڕامە ئەمین بیت لە مەكری خوا و بێ ئومێد بیت لە ڕەحمی خوا، هەردووكیان تەواوی تەوحید كەم دەكەنەوە، هەندێک جار نەفی تەوحید دەكەن [٢].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە لەسەر موسڵمان ترس و ڕجاء پێكەوە كۆ بكاتەوە، نابێت تەنها بترسێت و نابێتیش تەنها ئومیدی هەبێت، بەڵكو دەبێت بترسێت و ئومێدی هەبێت بە بەردەوامی، ئەمە تەوحیدە و ئەمە سیفەتی وەلی یەكانی خوایە[٣].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بانگخواز دەبێت لە شتی گرینگتر دەست پێ بكات، چونكە پێغەبەر (ﷺ) كاتێک ویستی هاوەڵان فێر بكات بە گرینگترینیان دەستی پێ كرد كە شەریک بۆ خوا بڕیاردانە، چونكە شیرک لەهەمووان گەورەترە بۆیە بە شیرک دەستی

---

[١] التمهيد لاپەڕە (٣٧٠).

[٢] إعانة المستفيد (١٠٥/٢).

[٣] إعانة المستفيد (١٠٥/٢).

پێکرد، پاشان دوای ئەمە بە ئەمین بوون لە مەکری خوا و بێ ئومێد بوون بە ڕەحمی خوا دەست پێکرد[١].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە تاوان دوو جۆرن، تاوانی گەورە و تاوانی بچووک.

[١] إعانة المستفيد (١٠٥/٢).

## باب من الإيمان بالله الصبر على أقدار الله

**وقول الله تعالى:** ﴿وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ﴾ [التغابن: ١١].

**قال علقمة: هو الرجل تصيبه المصيبة فيعلم أنها من عند الله، فيرضى ويسلم.**

**وفي صحيح مسلم عن أبي هريرة رضي الله عنه، أن رسول الله (ﷺ) قال: (اثنتان في الناس هما بهم كفر: الطعن في النسب، والنياحة على الميت)[١].**

**ولهما عن ابن مسعود مرفوعا: (ليس منا من ضرب الخدود، وشق الجيوب، ودعا بدعوى الجاهلية)[٢].**

**وعن أنس رضي الله عنه، أن رسول الله (ﷺ) قال: (إذا أراد الله بعبده الخير عجل له العقوبة في الدنيا، وإذا أراد بعبده الشر أمسك عنه بذنبه حتى يوافى به يوم القيامة)[٣].**

**وقال النبي (ﷺ): (إن عظم الجزاء مع عظم البلاء، وإن الله تعالى إذا أحب قوما ابتلاهم، فمن رضي فله الرضي، ومن سخط فله السخط) حسنه الترمذي[٤].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير آية التغابن.

**الثانية:** أن هذا من الإيمان بالله.

---

[١] أخرجه مسلم (٦٧).

[٢] أخرجه البخارى (١٢٩٤)، ومسلم (١٠٣).

[٣] أخرجه الترمذي (٢٣٩٦)، والحاكم(٤/٦٠٨)، والبيهقي في (الأسماء والصفات) (١/٣٤٠).

[٤] أخرجه الترمذي (٢٣٩٦)، وابن ماجه (٤٠٣١)، وأبو يعلى في (المسند) (٧ / ٢٤٧ رقم ٤٢٥٣).

**الثالثة:** الطعن في النسب.

**الرابعة:** شدة الوعيد فيمن ضرب الخدود وشق الجيوب ودعا بدعوى الجاهلية.

**الخامسة:** علامة إرادة الله بعبده الخير.

**السادسة:** إرادة الله به الشر.

**السابعة:** علامة حب الله للعبد.

**الثامنة:** تحريم السخط.

**التاسعة:** ثواب الرضي بالبلاء.

## باب من الإيمان بالله الصبر على أقدار الله

## له ئيمان هێنانه بەخوا ئارام گرتن لەسەر قەدەرەکانی خوای گەورە

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (دانەری کتاب ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەم بابەی تایبەت کردووە بە ئارامگرتن لەسەر قەدەری خوا، چونکە پەیوەستە بە تەوحیدی پەروەردگاریەتی، چونکە بەڕێوەبردنی دروستکراوەکان و تقدیر کردن لە پەروەردگاریەتی خوای گەورەیە)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (مناسبەی ئەم بابە لە کتاب التوحید: ئارام گرتن لەسەر قەدەرەکانی خوای گەورە لە تەواوکەرەکانی تەوحیدە، وە ئارام نەگرتن لەسەر قەدەرەکانی خوای گەورە لە کەم کەرەکانی تەوحیدە)[2].

عبدالله بن جار دەفەرمووێت: (مناسبەی ئەم بابە لە کتێبی تەوحید: ئارام نەگرتن لەسەر قەدەری خوای گەورە و تۆڕە بوون نەفی تەوحید و ئیمان دەکات)[3].

---

[1] القول المفيد (٢/٢٥٩).

[2] إعانة المستفيد.

[3] الجامع الفريد لاپەڕە (١٤١).

**وقول الله تعالى:** ﴿وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ﴾ [التغابن: ١١].

واتە: خوای گەورە دەفەرموویت: (هەر کەسێک ئیمان بهێنێت بەخوا، ئەوە خوای گەورەی هیدایەتی دڵی دەدات، خواش بەهەموو شتێک زانایایە).

**قال علقمة: هو الرجل تصيبه المصيبة فيعلم أنها من عند الله، فيرضى ويسلم.**

واتە: عەلقەمە دەفەرموویت: ئەوە باسی پیاوێک دەکات هەر بەلا و ناخۆشییەکی بەسەردا دێت، دەزانێت لە لایەن  خواوەیە، ئەوجا بە قەدەری خوا ڕازی دەبێت و تەسلیم دەبێت.

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ﴾: واتە: خوای گەورە هیدایەتی دڵی دەدات بۆ ئارام گرتن و ناڕازی دەرنەبڕین.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوون بکاتەوە ئارام گرتن لە ئیمانە.

### سوودەکانی ئایەتەکە:

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە هەر کەسێک تووشی هەر بەلا و ناخۆشی یەک بوو، ئەوە با بزانێت لەلایەن خواوەیە و بە ئیزنی خوای گەورەیە، چونکە سەرەتای ئایەتەکە دەفەرموویت: ﴿ما أصاب من مصيبة إلا بإذن الله وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ﴾.

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە هەر کەسێک ئیمانێکی تەواوی بەخوا هەبێت، خوای گەورە هیدایەتی دەدات ئارام بگرێت و ناڕازی بوون دەرنەبڕێت وە هیدایەتی دڵی دەدات بۆ عیبادەتەکان[١] .

**٣-** ئەمە بەڵگەیە ئیمان پەیوەستە بە دڵ ، ئەگەر دڵ بە هیدایەت هات ئەندامەکانیش بە هیدایەت دێن، لەبەر وتەی پێغەمبەر (ﷺ): (إن في الجسد مضغة، إذا صلحت صلح الجسد كله، وإذا فسدت فسد الجسد كله، ألا وهي القلب)[٢].

**٤-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە ئارام گرتن لەسەر بەلا و ناخۆشی و ڕازی بوون بە قەدەری خوا لە ئیمانە، چونکە خوای گەورە بە ئیمان وەسفی کردووە[٣].

---

[١] التمهيد لاپەڕە (٣٧٥-٣٧٦).

[٢] القول المفيد.

[٣] إعانة المستفيد.

**وفي صحيح مسلم عن أبي هريرة رضي الله عنه، أن رسول الله (ﷺ) قال: (اثنتان في الناس هما بهم كفر: الطعن في النسب، والنياحة على الميت).**

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویت: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: (دوو سیفەت لەناو خەڵکی دەمێننەوە کوفرن: یەکیان: تانە دانە لە نەسەبی خەڵک، دووەمیان: شیوەن کردنە لەسەر مردوو).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(اثنتان في الناس هما بهم كفر):** واتە: دوو سیفەت لەناو خەڵکی دەمێننەوە کوفرن، وشەی: (كفر) لێرەی نەناسراوە، دەلالەت لەسەر کوفری گەورە ناکات.

**(الطعن في النسب):** واتە: تانە دانە لە نەسەبی خەڵک.

**(والنياحة على الميت):** واتە: شیوەن کردنە لەسەر مردوو.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوون بکاتەوە شیوەن کردن لەسەر مردوو ئارام نەگرتنە لەسەر قەدەری خوای گەورە و کوفرە.

صالح ال اشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (ڕووی هێنانەوەی ئەم فەرموودەیە: وتەی: (النياحة على الميت)، چونکە نیاحە پێچەوانەی ئارام گرتنە، ئارام گرتنی واجب خۆ گرتنەوەیە لە لەخۆدان و یەخە دڕاندن و شتی تری وەک ئەمانە، نیاحە بەشێکی کوفرە، چونکە نەفی ئارام گرتن دەکات)[1].

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٣٧٧).

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئەم دوو کردەوەیە کوفری بچووکن، چەند وتە هەیە ڕاسترینیان ئەوەیە ئەم دوو کردەوەیە کردەوەی کافرەکانە و ڕەوشتی سەردەمی نەزانینە.

دووەم: هەندێکی تر دەڵێن ئەمە سەردەکێشێت بۆ کوفر.

سێیەم: هەندێکی تر دەڵێن ئەمە کوفری نیعمەت و چاکەیە.

چوارەم: هەندێکی تر دەڵێن ئەمە باسی ئەو کەسەیە حەڵاڵی دەکات[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (ئەم دوو کردەوەیە کوفری بچووکن، چونکە کوفر ئەگەر نەناسراو هات مەبەست پێی کوفری بچووکە، بەڵام ئەگەر ئەلیف و لامی لەسەر بوو، ئەوە مەبەست پێی کوفری گەورەیە)[2].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە شیوەن کردن لەسەر مردوو حەڕامە و کوفرە، وە ئارام گرتن و ڕازی بوون لەسەر بەلاو ناخۆشی نیشانەی ئیمانە.

زانایان دەڵێن: (النیاحة): دەنگ بەرز کردن و گریانە بە دەنگی بەرز و هاوار کردن و لەخۆدان و قژ دەرهێنان و وتنی قسەی هەلەو ئارام نەگرتنە، وە یەکێکە لە تاوانە گەورەکان[3].

موسیبەت دوو جۆرە:

---

[1] شرح صحيح مسم (١/٣٣٤).
[2] إعانة المستفيد.
[3] (المجموع) للنووي (٥/٢٨١).

یەكەم: موسیبەتی دونیا، ئەمەیان دروست نییە و حەڕامە، هەندێک زانا ئیجماع نەقل دەكەن كە حەڕامە[1].

دووەم: موسیبەتی دین، هەندێک زانا دەڵێن ئەمەیان جیاوازە لە موسیبەتی دونیا و دروستە، بەڵگە:

١ـ ئەو پیاوەی لە ڕۆژی مانگی ڕەمەزاندا لەگەڵ خێزانی خۆی جووت بوو، ڕیوایەتی الدارقطني هاتووە دەفەرموویێت: (ويحثي على رأسه التراب)، واتە: خۆلی بەسەر سەری خۆیدا دەكرد.

ـ ڕیوایەت هاتووە: (يلطم وجهه)، واتە: لە ڕوخساری خوی دەدا.

ـ ڕیوایەت هاتووە: (هلك الابعد).

ابن حجر ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەم ڕیوایەتانە دەكەنە بەڵگە ئەم وتە و كردەوانە دروستن بۆ كەسێک تووشی تاوان بووە، جیاوازی دەخەنە نێوان موسیبەتی دین و دونیا، بۆ موسیبەتی دین دروستە لەبەر ئەوەی هەست بە حاڵی دەكرێت زۆر پەشیمان بۆتەوە، لەوانەشە كردەوەی ئەم پیاوە پێش نەهی كردن بوویێت لە لێدان لە ڕوومەت و قژ دەرهێنان لە كاتی موسیبەتدا)[2].

باشتر وایە خۆت بەدوور بگریت لەم كردەوانە كاتی موسیبەتی دین و دونیا، دەبێت ئارام بگریت لەسەر تاعەت و تاوان و قەدەرەكانی خوای گەورە، والله أعلم.

---

[1] (المجموع) (٢٨١/٥).

[2] فتح الباري (١٩٤/٤-١٩٥)، (طبع دار الريان للتراث) القاهره.

زیانەکانی نیاحە:

- هیچ بۆ نائح زیاد ناکات مەگەر خەم و خەفەت و دڵ تەنگی.

- نارِازی یە بە قەدەری خوای گەورە و پشتی تێکردووە، وە ئارام گرتنی کەمە، هەروەک ئەوە وایە نائحە بلێت: نابێت ئەو کەسە مردبا یان ئاوای کردبا یان هێشتا کات مابوو.

- خەلکی تریش هان دەدات و خەم و خەفەت بلاودەکاتەوە.

- نائحە مردوو ئازار دەدات، چونکە مردوو هەست بە ئازار دەکات هەروەک فەرموودە هاتووە.

- لەگەڵ ئەم هەموو زیانانە قەزاو ئەوەی بەسەری هاتووە لاناچێت بەم نیاحە کردنە.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە تانە دان لە نەسەبی خەڵک لە تاوانە گەورەکانە.

**ولهما عن ابن مسعود مرفوعا: (ليس منا من ضرب الخدود، وشق الجيوب، ودعا بدعوى الجاهلية).**

واتە: لە ابن مسعود دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (ئەو كەسە لەئێمە نییە كە لە كاتی بەلا و ناخۆشی لە ڕوومەتی خۆی دەدات، یان یەخەی خۆی بدڕێنێت و بانگەوازی نەفامی و جاهیلی هەڵبدات).

### ڕاڤەی وشەكانی فەرموودەكە:

**(ليس منا):** واتە: لە ئێمە نییە.

**(من ضرب الخدود):** واتە: ئەوەی لەڕوومەتی خۆی دەدات.

**(وشق الجيوب):** واتە: یەخەی خۆی بدڕێنێت.

### هۆكاری باسكردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری كتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسكردووە بۆ ئەوەی ڕوون بكاتەوە شیوەن كردن لە تاوانە گەورەكان.

### سوودەكانی فەروودەكە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئەم كردەوەیە لە تاوانە گەورەكانە، لەبەر ئەوە ئەگەر ئارام گرتنی تەرك كرد و ناڕازی بوونی بەدیار خست، ئەوە تاوانێكە لە تاوانە گەورەكان، تاوانەكان ئیمان كەم دەكەن، چونكە ئیمان زیاد دەبێت بە گوێڕایەڵی و عیبادەت و كەم

دەبێت بە تاوان، وە کەم بوونی ئیمان تەواوی تەوحید کەم دەکات، بەڵکو تەرک کردنی ئارام گرتن نەفی تەواوی تەوحیدی واجب دەکات[١].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە ئارام بگریت لە کاتی بەلاو ناخۆشی.

---

[١] التمهید لاپەڕە (٣٧٨).

**وعن أنس رضي الله عنه، أن رسول الله (ﷺ) قال: (إذا أراد الله بعبده الخير عجل له العقوبة في الدنيا، وإذا أراد بعبده الشر أمسك عنه بذنبه حتى يوافى به يوم القيامة).**

واتە: لە ئەنەس دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (ئەگەر خوای گەورە خێر و چاكەی بۆ بەندەی خۆی بوێت، سزای تاوانەكانی پەلەی لێ دەكات لە دونیا، واتە لە دونیا زوو سزای دەدات بۆ ئەوەی بە پاكی بگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە، بەڵام ئەگەر خراپەی بەندەی بوێت، ئەوە لێی دەگەڕێت بە تاوانەكانیەوە بمێنێتەوە، هەتا بەو تاوانانەوە لە ڕۆژی قیامەتدا دەگاتەوە بە پەروەردگاری).

## ڕاڤەی وشەكانی فەرموودەكە:

**(إذا أراد الله بعبده الخير):** واتە: ئەگەر خوای گەورە خێر و چاكەی بۆ بەندەی خۆی بوێت.

**(عجل له العقوبة):** سزای تاوانەكانی پەلەی لێ دەكات لە دونیا، واتە: لە دونیا زوو سزای دەدات بۆ ئەوەی بە پاكی بگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە.

**(وإذا أراد بعبده الشر أمسك عنه بذنبه حتى يوافى به يوم القيامة):** واتە: بەڵام ئەگەر خراپەی بەندەی بوێت، ئەوە لێی دەگەڕێت بە تاوانەكانیەوە بمێنێتەوە، هەتا بەو تاوانانەوە لە ڕۆژی قیامەتدا دەگاتەوە بە پەروەردگاری.

## هۆكاری باسكردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری كتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسكردووە بۆ ئەوەی ڕوون بكاتەوە ئەگەر خوای گەورە خێر و چاكەی بۆ بەندەی خۆی بوێت، سزای تاوانەكانی پەلەی لێ دەكات لە دونیا، كەواتە بەڵاو ناخۆشی هەر تووشی مرۆڤ دەبێت جا كەسەكە باش بێت یان خراپ.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگرکردنی سیفەتی ویست بۆ خوای گەورە.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئەگەر خوای گەورە خێر و چاکەی بۆ بەندەی خۆی بوێت، سزای تاوانەکانی پەلەی لێ دەکات لە دونیا، واتە لە دونیا زوو سزای دەدات بۆ ئەوەی بە پاکی بگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە، بەڵام ئەگەر خراپەی بەندەی بوێت، ئەوە لێی دەگەڕێت بە تاوانەکانیەوە بمێنێتەوە، هەتا بەو تاوانانەوە لە ڕۆژی قیامەتدا دەگاتەوە بە پەروەردگاری.

زانایان دەڵێن بەڵاو و ناخۆشی هۆکارەکەی دوو شتن:

یەکەم: تاوان هۆکارە بۆ بەڵاو و ناخۆشی، جا تاوانی گەورە بێت یان بچووک یان کوفر و شیرک، خوای گەورە سزایی دەدات وەک سزاییەکی پێشەکی پێش قیامەت.

دووەم: ویستی خوای گەورە بۆ ئەوەی پلەکانی ئیماندار بەرز بکاتەوە بە ئارام گرتن، خوای گەورە پێغەمبەرەکان و پیاوچاکانی تاقیکردۆتەوە بۆ ئەوەی پلەکانیان بەرز بکاتەوە.

ئەو کەسەی تووشی بەڵاو و ناخۆشی بووە ئەم دوو حالەتەیە:

یەکەم: ئەگەر کەسەکە کافر بوو، ناکرێت بەڵایەکە بۆ ئەوە بێت پلەی پێ بەرز ببێتەوە.

دووەم: ئەگەر کەسەکە موسلمان بوو، دوو ئەگەری هەیە:

١- یان کەسەکە موسلمانێکە تاوان بە ئاشکرایی دەکات و فاسقی یەکەی دیارە، لەم حالەتە واگومان دەبردرێت ئەمە سزاییە بۆی و بەهۆی تاوانەکانیەوە بووە، چونکە لاچوونی تاوان لەپێشترە لە بەرزبوونەوەی پلەکانی، تاوانبار زیاتر پێویستی بە لێخۆش بوونە لە پلە بەرزبوونەوە.

٢- یان کەسەکە موسلمانێکە عبادە و کردەوەی باش دەکات، بەردەوام ڕووی لە خوای گەورەیە، لەم حالەتە وا گومان دەبردرێت بەلایەکە وەک ڕێز و بەرزبوونەوەی پلەکانییەتی.

زانایان دەڵێن ئەو موسلمانەی تووشی بەڵاو و ناخۆشی بووە بەم سێ شتە جیادەکرێنەوە:

١- ئەگەر ناڕازی بوون و ئارامی نەگرت و تووڕەیی لەکەسەکە بەدیارکەوت، گومان مەبە ئەمە کەڕامەتێک بێت لەخواوە بۆ ئەوەی پلەی پێی بەرز ببێتەوە، چونکە خوای گەورە زانیوویەتی ئارام ناگرێت و ڕازی نابێت، نزیکتر ئەوەیە ئەمە عقوبەیە بۆ کەسەکە.

٢- ئەگەر ئارامی گرت و ناڕازی بوونی دەرنەبڕی ، ئەوە نیشانەیە بۆ کەفارەتی تاوان.

٣- ئەگەر ڕازی بوو و دڵ و نەفسی ئارام بوو بەم بەڵاو و ناخۆشی یە هەتا لەسەری لادەچێت، ئەمە نیشانەیە بۆ بەرزبوونەوەی پلەکانی.

**وقال النبي (ﷺ): (إن عظم الجزاء مع عظم البلاء، وإن الله تعالى إذا أحب قوما ابتلاهم، فمن رضي فله الرضي، ومن سخط فله السخط) حسنه الترمذي.**

واته: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (پاداشتی گەورە لەگەڵ بەڵا و ناخۆشی گەورەیە، بە تەئکید ئەگەر خوای گەورە قەومێکی خۆش ویست تاقییان دەکاتەوە، جا هەر کەسێک لەگەڵ ئارام گرتندا ڕازی بێت، ئەوە خواش لێی ڕازی دەبێت، وە هەر کەسێکیش ناڕازی بێت، ئەوە خواش لێی ناڕازی دەبێت).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(وإن الله تعالى إذا أحب قوما ابتلاهم):** واتە: بە تەئکید ئەگەر خوای گەورە قەومێکی خۆش ویست تاقییان دەکاتەوە، تاقیکردنەوەی پەیوەست کردووە بە خۆش ویستن.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوون بکاتەوە هەر کەسێک لەگەڵ ئارام گرتندا ڕازی بێت، ئەوە خواش لێی ڕازی دەبێت، هەر کەسێکیش ناڕازی بێت، ئەوە خواش لێی ناڕازی دەبێت.

**سوودەکانی فەروودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە خوای گەورە سیفەتی خۆشەویستی و ڕازی بوون و تۆڕە بوونی هەیە.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک لەگەڵ ئارام گرتندا ڕازی بێت، ئەوە خواش لێی ڕازی دەبێت، وە هەر کەسێکیش ناڕازی بێت، ئەوە خواش لێی ناڕازی دەبێت.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە گەورەی پاداشت لەگەڵ بەلاو ناخۆشی گەورەیە.

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە موسلمان دەبێت ڕازی بێت بە قەدەری خوا، جیاوازی هەیە لەنێوان ڕازی بوون و ئارام گرتن.

(الصبر): واتە: ئارام گرتن، زانایان دەڵێن ئارام گرتن واجبە لەسەر قەدەری خوا و لەسەر ئەوەی تووشی بووە، ئارام گرتن ئەوەیە مرۆڤ نەفسی خۆی بگرێتەوە لە ئەنجام دانی شتێک، یان خۆی بگرێتەوە لە گوتنی قسەی هەڵە.

(الرضا): واتە: ڕازی بوون، زانایان دەڵێن ئەمە بەرزترین پلەی ئارام گرتنە، پلەی ئەوانەیە کە دەست پێشخەری لە خێرو چاکە دەکەن، لەبەر ئەوە زانایان دەڵێن ڕازی بوون بە قەدەری خوا سوننەتە واجب نییە، مرۆڤ تاوانبار نابێ ئەگەر ڕازی نەبوو، بەڵام داوای لێکراوە جیهادی نەفسی خۆی بکات، ڕازی بوون ئارام گرتنە و زیاد لە ئارام گرتنیشی تێدایە، ئەوەی ڕازی دەبێت ئارامگرە و لەگەڵ ئەوەش ڕازی بووە بە قەدەری خوا، ئازار و ناخۆشی ناچێژێت پێی.

ابن تيمية ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ڕازی بوون بە موسیبەتەکان سوننەتە، وەک هەژاری و نەخۆشی و سەرشۆڕی، لەسەر یەکێک لە دوو وتەی زانایان واجب نییە، وتراوە: واجبە، ئەوەی ڕاست بێت و واجب بێت ئارام گرتنە)[١].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەوەی تووشی مرۆڤ دەبێت لە موسیبەتەکان سوننەتە ڕازی ببیت لەسەر وتەی زۆر ئەهلی عیلم واجب نییە، بەڵام واجبە لەسەری ئارام بگرێت لەسەری)[٢].

[١] مجموع الفتاوى (٦٨٢/١٠).
[٢] مجموع فتاوى ابن عثيمين (٩٢/٢).

## (باب ما جاء في الرياء)

**وقول الله تعالى:** ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾﴾ [الكهف: ١١٠]

**عن أبي هريرة مرفوعا: (قال الله تعالى: أنا أغنى الشركاء عن الشرك، من عمل عملا أشرك معي فيه غيري تركته وشركه). رواه مسلم[١].**

**وعن أبي سعيد مرفوعا: (ألا أخبركم بما هو أخوف عليكم عندي من المسيح الدجال؟) قالوا: بلى يا رسول الله! قال: (الشرك الخفي، يقوم الرجل فيصلي، فيزين صلاته، لما يرى من نظر رجل). رواه أحمد[٢].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير آية الكهف.

**الثانية:** الأمر العظيم في رد العمل الصالح إذا دخله شيء لغير الله.

**الثالثة:** ذكر السبب الموجب لذلك، وهو كمال الغنى. الرابعة: أن من الأسباب، أنه تعالى خير الشركاء.

**الخامسة:** خوف النبي صلى الله عليه وسلم على أصحابه من الرياء.

**السادسة:** أنه فسر ذلك بأن يصلي المرء لله، لكن يزينها لما يرى من نظر رجل إليه.

---

[١] أخرجه مسلم (٢٩٨٥).

[٢] أخرجه أحمد (٣/٣٠ رقم ١١٢٥٢)، وابن ماجه (٤٢٠٤)، وابن خزيمة (٢/٦٧ رقم ٩٣٧)، والبيهقي في "شعب الإيمان" (٣/١٤٤ رقم ٣١٤١).

## باب ما جاء في الرياء

## باسکردنی ڕیا کە شیرکە

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (دەڵێین: ڕیا شیرکی بچووکە؛ چونکە مرۆڤ مەبەستی لە عیبادەتی بۆ بێجگە لەخوایە و هەندێک جار دەگاتە شیرکی گەورە، ابن قیم نموونەی هێناوەتەوە بە شیرکی بچووک و دەفەرموویێت: (وەک ڕیایەکی کەم)، ئەمە بەڵگەیە ڕیای زۆر دەگاتە شیرکی گەورە)[1].

عبدالله بن جار الله دەفەرموویێت: (پەیوەندی ئەم بابە بە کتابی تەوحید: ڕیا شیرکی بچووکە نەفی تەواوی تەوحید دەکات)[2].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: ((ڕیا) واتە بینین بە چاو، ئەویش ئەوەیە کردەوە دەکات بۆ ئەوەی ببینرێ کە ئەو کەسە عیبادەتی کردوە جا یان نوێژە، یان قورئان خوێندنەوەیە، یان زیکرە، یان خێرە، یان حەججە، یان جیهاد کردنە، یان جێ بەجێکردنی واجبەکانە، یان خۆ دوورخستنەوەیە لە نەهی یەکان، یان شتی تری وەک ئەمانەیە، نەک بۆ داواکردنی ئەو شتە بێت کە لەلای خوایە بەڵکو لەبەر ئەوەیە بۆ ئەوەی خەڵک ببینێت و سوپاس و مەدحی بکەن لەسەر ئەم کردەوەیە ئەمە ڕیایە، هەروەها دەکرێت ڕیا لە ئەصلی ئیسلامی کەسەکە هەبێت وەک ڕیای دووڕووەکان)[3].

---

[1] القول المفيد.
[2] الجامع الفريد (١٤٥).
[3] التمهيد لاپەڕە (٣٨٢).

**وقول الله تعالى:** ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا ١١٠﴾ [الكهف: ١١٠]

واتە: خوای گەورە دەفەرموویت: (ئەی پێغەمبەر بڵێ: من تەنها مرۆڤێکم وەک ئێوە، جیاوازیمان ئەوەیە من وەحیم بۆ دێت، خوا و پەرستراوی بە حەقی ئێوە یەک پەرستراوە کە (الله)یە، جا هەر کەسێک بە تەمای دیداری خوایە با کردەوەی چاکە بکات و هیچ شەریکێک بۆ خوا بڕیار نەدات).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ﴾: واتە: من تەنها مرۆڤێکم وەک ئێوە.

﴿وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا﴾: ئەم نەهیە عامە و هەموو شیرکێک دەگرێتەوە، (أحدا)، نەناسراوە لە سیاقی نەهی، دەبێتە عام وهەموو تاکێک دەگرێتەوە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە دیارە ئەویش ئەوەیە ڕیا جۆرێکە لە جۆرەکانی شیرکی بچووک)[1].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

١- پێغەمبەری خوا (ﷺ) مرۆڤێکە وەک هەموو مرۆڤێکی تر، لەبەر وتەی: ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ﴾.

[1] التمهيد لاپەڕە (٣٨٣).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەم ئایەتە بەڵگەیە پێغەمبەر (ﷺ) مرۆڤە و شایستەی ئەوە نییە بپەرسترێت، چونکە حالەکەی حصر کردووە بە مرۆڤ)[1].

**٢-** جێگیرکردنی پەیامی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، لەبەر وتەی: ﴿يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ﴾.

**٣-** جێگیرکردنی تەنیایی خوا لە بەندایەتیدا، لەبەر وتەی: ﴿أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ﴾.

**٤-** لەسەر ئیمانداره ئومێدی بە دیداری خوا و پاداشتەکەی هەبێت، لە سزاکەی بترسێت و خۆی بۆ قیامەت ئامادە بکات و کردەوەی باش ئەنجام بدات، شەریک بۆ خوا بڕیار نەدات، لەبەر وتەی: ﴿فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا﴾.

**٥-** مەرجی دروستی عیبادەت ئەوەیە دەبێت بە پاکی بۆ خوا بێت و موافقی شەرع بێت، نابێت شەریک بۆ خوا بڕیار بدات ئەگەرنا کردەوەکە پوچ دەبێتەوە، لەبەر وتەی: ﴿فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا﴾.

**٦-** بینینی خوای گەورە لە بەهەشت، لەبەر وتەی: ﴿فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ﴾.

**٧-** ئەم ئایەتە وەڵامە بۆ ئەوانەی دەڵێن شیرک تەنها لە عیبادەتی پەیکەرەکانە، دەڵێن ئێمە نزیک دەبینەوە لە خوا بە وەلی و پیاو چاکان، دەڵێن ئەمە وەک عیبادەتی پەیکەر نییە.

---

[1] القول المفيد.

ئەم وتەیە پووچە، چونکە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا﴾، ئەمە عامە و هەموو شتێک دەگرێتەوە کە لەگەڵ خوا بپەرستیت، جا چ جنۆکە بێت یان مرۆڤ بێت یان فریشتە بێت یان پێغەمبەر و نێردراو بێت یان پیاو چاک بێت یان هەر کەسێک بێت)[1].

---

[1] إعانة المستفيد (١٢٨/٢).

**عن أبي هريرة مرفوعا: (قال الله تعالى: أنا أغنى الشركاء عن الشرك، من عمل عملا أشرك معي فيه غيري تركته وشركه) رواه مسلم.**

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (خوای بەرز و بڵند فەرموویەتی: من دەوڵەمەندترین و بێ نیازترینی ئەو کەسانەم کە شەریکم بۆ داندراوە و پێویستم بە هیچ شەریکێک نییە، جا هەر کەسێک کردەوەیەکی باش بکات و لەناو کارەکەیدا کەسێک بکاتە شەریکم ئەوا واز دەهێنم لە خۆی و ئەو کارەشی لێ وەرناگرم).

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(عملا):** نەناسراو هاتووە لە سیاقی مەرج؛ هەموو کردەوەیەک دەگرێتەوە، واتە: جا نوێژ بێت یان حەج یان جیهاد یان کردەوەی تر.

### هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

قەرعاوی دەفەرمووێت: (فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر پوچی ئەو کردەوەیەی کە شیرکی تێدایە، یەکێک لەو شیرکانەش ڕیایە)[1].

### سوودەکانی فەروودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ دەوڵەمەندی خوای گەورە[2].

---

[1] الجديد لاپەڕە (٣٢٦).

[2] القول المفيد (٢/٢٨٣-٢٨٤).

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ گەورەیی مافی خوای گەورە، دروست نیە کەس شەریک بێت لەگەڵی لە مافی خۆی[1].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کردەوەیەک ڕیای تێکەڵ ببێت پووچ دەبێتەوە، لەبەر وتەی: (ترکته وشرکه).

عیبادەت ئەگەر ڕیای تێکەڵ بوو ئەوا ئەم سێ حاڵەتانەن:

یەکەم: کەسەکە ئەصڵی عیبادەتەکە بە ڕیا دەست پێ دەکات، وەک کەسێک هەستاوە و نوێژی کردوە بۆ ئەوەی خەڵک بیبینن، کەچی مەبەستیشی خوا نیە، ئەمە شیرکە و عیبادەتەکەی پووچە.

دووەم: لەناو عیبادەت تووشی ڕیا دەبێت، واتە سەرەتای کردەوەکەی بە ئیخلاسی کردوە بۆ خوا، پاشان لەناو عیبادەتەکە تووشی ڕیا بووە.
ئەگەر عیبادەتەکە کۆتاییەکەی بنیات نەنرا بوو لەسەر سەرەتاکەی، ئەوا سەرەتای عیبادەتەکە دروستە، ئەوەی پووچ بێت کۆتاییەکەیەتی.

نموونە: پیاوێک ١٠٠ ڕیالی لەلایە و ئامادەی کردوە بۆ خێرکردن، ٥٠ ڕیالی بەخشی بە ئیخلاسی، پاشان ٥٠ ڕیالی تری بەخشی بۆ ڕیا، لەم حاڵەتە هی یەکەم دروستە و قبوڵە و هی دووەمیش پووچە.

بەڵام ئەگەر عیبادەتێک بێت کۆتاییەکەی بنیات نرابێت لەسەر سەرەتاکەی، ئەمە دوو حاڵەتە:

---

[1] القول المفيد (٢/٢٨٣-٢٨٤).

أ- ئەگەر ڕیای لادا و پێ ناخۆش بوو، ئەوا کاریگەری لەسەر نیە، لەبەر وتەی پێغەمبەر درووود و سەلامی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (إن الله تجاوز على ما حدثت به أنفسها ما لم تعمل أو تتكلم).

نموونە: پیاوێک هەڵدەستێت دوو ڕەکاعەت نوێژ بە ئیخلاسی بۆ خوا دەکات، لە ڕەکاعەتی دووەم هەستی بە ڕیا کرد و هەوڵی لادانی دا، لەم حاڵەتەدا هیچ زیانی پێ ناگەیەنێت و نوێژەکەی دروستە.

ب- دڵخۆشە بەو ڕیایە و لانادات، لەم حالەتە هەموو عیبادەتەکە پووچ دەبێت چونکە کۆتاییەکەی بنیات نراوە لەسەر سەرەتاکەی و پێکەوەن.

نموونە: پیاوێک هەڵدەستێت دوو ڕەکاعەت نوێژ بە ئیخلاسی دەکات، لە ڕەکاعەتی دووەم هەستی بە ڕیا کرد بەوەی کەسێک سەیری دەکات و دڵی پێیی خۆش بو و هەوڵی لادانی نەدا، لەم حاڵەتە هەموو نوێژەکە پووچە، لەبەر ئەوەی هەمووی پێکەوەیە.

سێیەم: دوای تەواو بوون لە عیبادەت بۆی دێت، لەم حاڵەتە هیچ کاریگەری لەسەر نیە، ئیلا ئەگەر عدوان بێت، وەک: منەت کردن و ئازاردان بە خێر کردن[1].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ڕیا حەڕامە، چونکە پشت گوێ خستنی مرۆڤ و قبوڵ نەبوونی کردەوەی بەڵگەیە لەسەر غەزەب، ئەو شتەی غەزەبی لێ کرابێت حەڕامە[2].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە خوای گەورە قسە دەکات.

---

[1] القول المفيد.
[2] القول المفيد (٢/٢٨٣-٢٨٤).

**وعن أبي سعيد مرفوعا: (ألا أخبركم بما هو أخوف عليكم عندي من المسيح الدجال؟) قالوا: بلى يا رسول الله! قال: (الشرك الخفي، يقوم الرجل فيصلي، فيزين صلاته، لما يرى من نظر رجل). رواه أحمد.**

واته: ئەبو سەعیدی خودری خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئایا پێتان ڕابگەیەنم چ شتێک مەترسی زیاترە بۆ ئێوە لە مەسیحی دەجال؟ گوتیان: بەڵێ ئەی نێردراوی خوا، فەرمووی: شیرکی شاراوە، ئەمەش ئەوەیە پیاوێک هەڵدەستێت نوێژ دەکات و نوێژەکەی دەڕازێنێتەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە دەبینێ پیاوێ تەماشای دەکات).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(المسيح الدجال):** دەجال: چاوی ڕاستی مەسح کراوە و کوێرە.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

قەرعاوی دەفەرمووێت: (فەرموودەکە بەڵگەیە پێغەمبەر (ﷺ) لە شتێک لە ئێمە ترساوە زیاتر لە فیتنەی مەسیح دەجال ئەویش شیرکە، لەبەر ئەوە دەبێت خۆتی لێ بەدوور بگریت و خۆت بپارێزی)[1].

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ڕەحمی پێغەمبەر (ﷺ) بەرامبەر بە ئیمانداران و لە ئوممەتی خۆی ترساوە تووشی فیتنە ببن.

---

(١) الجدید لاپەڕە (٣٢٧).

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ترسناکی ڕیا، چونکە شاراوەیە و لێ ڕزگار بوونی گرانە.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە شیرک دابەش دەکرێت بۆ شیرکی شاراوە و دیار.

**٤-** هۆکاری گوتنی ئەم فەرموودەیە ئەوە بوو هاوەڵان باسی دەجالیان دەکرد لەنێوان خۆیاندا.

قال أبو سعد: خرجَ علَينا رسولُ اللَّهِ (ﷺ) ونحنُ نتذاكَرُ المسيحَ الدَّجَّالَ فقالَ: (ألا أخبرُكُم بما هوَ أخوَفُ عليكُم عندى منَ المسيحِ الدَّجَّالِ) قالَ: قُلنا: بلَى فقالَ: (الشِّركُ الخفيُّ أن يقومَ الرَّجلُ يصلِّي فيزيِّنُ صلاتَهُ لما يرَى مِن نظرِ رجل).

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە فیتنەی ڕیا ترسناکترە لە فیتنەی دەجال، چونکە:

١- دەجال بە نیشانەکان دەناسرێتەوە، بەڵام ڕیا لە دڵ دایە و شاراوەیە.

٢- دەجال بۆ سەردەمێک دێت بۆ کۆمەڵە کەسانێک، بەڵام ڕیا لە سەرەتایی هاتنی ئیسلامەوە تا دوا ڕۆژ لەگەڵ نەوەکانی ئیسلامدا دەبێت.

عبدالله بن حمید ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (لەگەڵ ئەمە پێغەمبەر (ﷺ) لە ئوممەتی خۆی ترساوە زیاتر لە فیتنەی دەجال، چونکە فیتنەی دەجال دیارە، لەنێوان هەردوو چاوی نووسراوە کافر، سەبارەت بە ڕیا کردەوەیەکی شاراوەیە، کەس نایزانێت مەگەر ئەوە نەبێت کە نەفسی تووشی بوە، خوای گەورەش باڵا دەستە بەسەریدا)[1].

---

[1] شرح كتاب التوحيد لاپەڕە (٥٣٧).

## باب من الشرك إرادة الإنسان بعمله الدنيا

**وقول الله تعالى:** ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيۡهِمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فِيهَا وَهُمۡ فِيهَا لَا يُبۡخَسُونَ ١٥ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيۡسَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٦﴾ [هود: ١٥-١٦]

**وفي الصحيح عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (تعس عبد الدينار، تعس عبد الدرهم، تعس عبد الخميصة، تعس عبد الخميلة، إن أعطي رضي، وإن لم يعط سخط، تعس وانتكس وإذا شيك فلا انتقش، طوبى لعبد أخذ بعنان فرسه في سبيل الله، أشعث رأسه، مغبرة قدماه، إن كان في الحراسة كان في الحراسة، وإن كان في الساقة كان في الساقة، إن استأذن لم يؤذن له، وإن شفع لم يشفع )[1].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** إرادة الإنسان الدنيا بعمل الآخرة.

**الثانية:** تفسير آية هود.

**الثالثة:** تسمية الإنسان المسلم: عبد الدينار والدرهم والخميصة.

**الرابعة:** تفسير ذلك بأنه إن أعطي رضي، وإن لم يعط سخط.

**الخامسة:** قوله (تعس وانتكس).

**السادسة:** قوله: (وإذا شيك فلا انتقش).

---

[1] أخرجه البخاري (٢٨٨٦-٢٨٨٧).

**السابعة:** الثناء على المجاهد الموصوف بتلك الصفات.

# باب من الشرك إرادة الإنسان بعمله الدنيا

باسي جۆرێک لە شیرک ئەویش ئەوەیە مرۆڤ بیەوێت لەبەرامبەر چاکەکانیدا دونیای دەست بکەوێت.

عبدالله بن حميد ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەم بابە دووبارە نەبۆتەوە لەگەڵ بابی پێشووتر، بابی پێشووتر باسی ڕیا بوو ئەویش ئەوەیە کردەوە دەکات ظاهرەکەی وادیارە بۆ خوایە، بەڵام ئەو مەبەستەی هەیە کە فڵانە کەس مەدحی بکات ئەمەیان کردەوە پووچ دەکات، ئەم بابە باسی ئەوە دەکات کردەوە دەکات نەک بۆ خوا بەڵکو بۆ دونیا، کەواتە جیاوازی هەیە لەنێوان ئەم دوو بابە، هەردووکیان کردەوە پووچ دەکەن، خاوەنەکەی خەسارەتمەندە چونکە باسمان کرد عیبادەت بنیات نراوە لەسەر دوو بنچینە: ئیخلاس و متابعە.

هەر کەسێك فێری زانست ببێت بۆ ئەوەی ببێتە مامۆستا یان بۆ ئەوەی پیشەک بە دەست بهێنێت، یان بۆ ئەوەی ببێتە قازی، ئەم کردەوەیە لێی وەرناگیرێت، چونکە مەبەستی خوا نەبوە)[١].

ناونیشانی ئەم بابە سێ ئەگەری هەیە:

یەکەم: ئەم بابە دووبارە کراوەتەوە لەگەڵ هی پێشووتر، ئەمەش دووره دانەری کتاب دوو بابی وەک یەک بەدوای یەکتردا بنووسێت.

---

[١] شرح كتاب التوحيد لاپەڕە (٥٤١).

دووەم: بابی پێشووتر تایبەتمەندترە لەم بابە، ڕیا تایبەتە و ئەم بابە عامە، ئەمە لەوانەیە وابێت.

سێیەم: ئەم بابە جۆرێکی سەربەخۆیە لەگەڵ بابی پێشووتر، ئەمە وتەی دیارە، چونکە مرۆڤ لە بابی پێشوو کردەوە دەکات بۆ ڕیا و مەبەستی مەدح کردنی هەیە لە عیبادەت، بۆ ئەوەی پێی بوترێ: ئەمە عابدە، مەبەستی سوودی دونیایی نیە، ئەم بابە مەبەستی مەدح کردنی نییە بۆ عیبادەت بەڵکو خوای گەورە دەپەرستێت بە ئیخلاسی، بەڵام مەبەستی شتێکی دونیایی هەیە؛ وەک: ماڵ و پلە و لەش ساغی بۆ خۆی و ماڵ و مناڵی و شتی تری وەک ئەمانە، ئەمە مەبەستی لەم کردەوەیە سوودی دونیاییە و بێ ئاگایە لە پاداشتی ئاخیرەت، نموونە بۆ ڕوون کردنەوەی کردەوەی مرۆڤ بۆ دونیا:

١- مەبەستی ماڵی هەیە، نموونە کەسێک بانگ بدات بۆ مووچە، یان حەج دەکات بۆ ئەوەی ماڵ بەدەست بهێنێت، واتە: بۆ بازرگانی دەچێت.

٢- مەبەستی پلە و پایەی هەیە، نموونە: کەسێک خۆی فێری زانست بکات بۆ ئەوەی لە کۆلێژ بڕوانامە بەدەست بهێنێت و پلەی پێ بەرز ببێتەوە.

٣- مەبەستی لادانی ئازار و ناخۆشی و ئافاتە، نموونە: کەسێک عیبادەتی خوا بکات بۆ ئەوەی بەم عیبادەت کردنەی خوا خۆشەویست بێت لای دروستکراوەکان و خراپە و ناخۆشی لەسەر لابچێت.

٤- عیبادەتی خوا دەکات بۆ ئەوەی خەڵک بۆ خۆی ڕابکێشێت بۆ خۆشەویستی و ڕێزگرتن.

ئەگەر وترا: ئایا ئەوانە داخل دەبن کە خۆیان فێری زانست دەکەن لە کۆلێژەکان، یان شوێنی تر مەبەستی بڕوانامە و پلە و پایەی هەیە؟

وەڵام: ئەوانە داخل دەبن ئەگەر هیچ مەبەستی شەرعییان نەبوو‌بێت، ئێمە پێیان دەڵێین:

یەکەم: با مەبەستی پلە و پایەی دونیات نەبێت، بەڵکو ئەم بڕوانامەیە بکە هۆکارێک بۆ سوود گەیاندن بە دروستکراوەکان، چونکە کردەوەکان لەم کاتە بنیات نراون لەسەر بڕوانامەکان، خەڵک ناتوانێت بگات بە سوود گەیاندن بە دروستکراوەکان ئیلا بەم هۆکارە نەبێت، بەمە نییەت سەلامەت دەبێت.

دووەم: هەر کەسێک ویستی زانستی هەبێت و ئەمەش نەکرێت مەگەر بە کۆلێژەکان نەبێت، دەچێتە کۆلێژ بۆ ئەم مەبەستە و سەبارەت بە پلە و پایە لای گرینگ نیە ئەمەیان هیچی تێدا نیە.

سێیەم: مرۆڤ ئەگەر هەردوو نیەتی هەبوو، نییەتی دونیا و ئاخیرەتی هەبوو هیچی لەسەر نیە چونکە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمۡرِهِۦۚ قَدۡ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيۡءٖ قَدۡرٗا ۝٣﴾ [الطلاق: ٢-٣]، هانی تەقوا کردنی خوای داوە بە ڕزگار بوون لە هەموو ناخۆشی یەک، وە هانی داوە بۆ ڕزق و ڕۆزی[١].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (وتەی: (من الشرك)، واتە: لە جۆرەکانی شیرکە، مەبەست پێی شیرکی بچووکە.

وتەی: (إرادة الإنسان بعمله الدنيا)، ماناکەی: کردەوەیەک دەکات ئەم کردەوەیە هی ئاخیرەتە، ئەو کە دەیکات هیچ مەبەستێکی نیە ئیلا دونیا نەبێت، وەک: جیهاد دەکات بۆ

---

[١] القول المفيد.

غەنیمە، یان خۆی فێری زانست دەکات بۆ پلە و پایە و پیشە، یان حەج دەکات یان عومرە بۆ بەدەست هێنانی ماڵ، بەم شێوەیە)[1].

[1] إعانة المستفيد (١٣٥/٢).

**وقول الله تعالى:** ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيۡهِمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فِيهَا وَهُمۡ فِيهَا لَا يُبۡخَسُونَ ١٥ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيۡسَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٦﴾ [هود: ١٥-١٦]

واته: خوای گەورە دەفەرموویێت: (هەر کەسێك تەنها ژیانی دنیاو ڕازاوەیی و (خۆشگوزەرانی) یەکەی بویێت ئەوا پاداشتی هەوڵ و کۆششی ئەو جۆرە کەسانە دەدەینەوە لە دونیادا، ئەوانیش تێیدا هیچیان لێکەم ناکرێتەوە، ئا ئەوانەن کە لە ڕۆژی دوایدا جگە لە ئاگری دۆزەخ هیچی تریان بۆ نیە و ئەوەی کە کردیان لە دنیادا پووچەڵ بوەوەو بێ نرخە، هەروەها ئەو کاروکردەوەیەی کە دەیانکرد بەتاڵ و پووچ و بۆشە).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ﴾:
جیاوازی هەیە لەسەر ئایەتی سوڕەتی هود سەبارەت بە کێ دابەزیوە:

١- وتراوە: دابەزیوە سەبارەت بە کافرەکان، چونکە کافر هیچی ناوێت مەگەر ژیانی دونیا، بەڵگە بۆ ئەمە ئەوەیە کە لە ئایەتەکە باسی پاداشتەکەی کردووە، لەسەر ئەمە ڕووی باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە ئەوەیە ئەگەر کردەوەی کافرەکان مەبەستی دونیایان هەبێت و هەموو کەسێک بەژدار بێت لەگەڵیان لەم شتە، ئەوە بەژدارە لەگەڵیان لە شیرک و کوفریان.

٢- وتراوە: سەبارەت بە ڕیابازەکان دابەزیوە، چونکە کردەوە ناکەن مەگەر بۆ دونیا نەبێت، سوودی نییە بۆیان لە ڕۆژی قیامەت.

٣- وتراوە: دابەزیوە سەبارەت بە کەسێک کە ویستی ماڵی دونیای هەیە بە ئەنجام دانی کردەوەی باش.

ڕستەکە بەڵگەیە لەسەر وتەی یەکەم؛ لەبەر وتەی: ﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ إِلَّا النَّارُ ۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا فِيهَا وَبَاطِلٌ مَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾. [ هود: ١٦])[١].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەم ئایەتە سەبارەت بە کافرەکان بووە، ئەوانەی خوای گەورەیان دەپەرست لەبەر دونیا، وەک: دووڕووەکان، عمومەکەی بەڵگەیە دەبێت مرۆڤ خۆی بپارێزێت لە ئەنجام دانی کردەوە بۆ دونیا)[٢].

صالح آل الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (بە گوێرەی وتەی پێشینەکان چوار جۆری خەڵک هەن کە هەموویان داخلی ئەم هەڕەشەیە دەبن:

جۆری یەکەم: ئەوانەی تووشی ئەم شیرکە بچووکە بوونە ئەوانەن کە کردەوە دەکەن بۆ دونیا: کردەوە دەکات بۆ خوای گەورە بە ئیخلاسی بەڵام مەبەستی پاداشتی دونیای هەیە و ویستی پاداشتی ئاخیرەتی نییە، وەک: نوێژ دەکات بە پاکی بۆ خوای گەورە، بەڵام مەبەستی ئەوەی هەیە لاشەی تەندروست بێت، یا پەیوەندی خزمایەتی دەگەینێت بۆ سوودێکی دونیا.

ئەم جۆری عیبادەتە فەرمان جێ بەجێ دەکات و بە پاکی بۆ خوا دەیکات، بەڵام مەبەستی پاداشتی دونیای هەیە و هیچ مەبەستی ئاخیرەتی نییە، کردەوە ناکات بۆ ئەوەی ڕزگار بێت لە ئاگر و بۆ چوونە بەهەشت، ئەمە داخلی ئەم جۆرە دەبێت و داخلی وتەی خوای

(١) القول المفيد.
(٢) التعليق المفيد.

گەورە دەبێت: ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ﴾.

مرۆڤ کاتێک کردەوە دەکات و داوای پاداشت دەکات دوو بەشە:

بەشی یەکەم: کردەوەیەک دەکات مەبەستی دونیایە، هیچ مەبەستی پاداشتی ئاخیرەتی نییە، شەرعیش پاداشتی دونیاشی لەگەڵ باس نەکردووە، وەک: نوێژ و ڕۆژو و شتی تر لە کردەوەی باش، ئەمەیان دروست نییە بۆ مەبەستی دونیا، ئەگەر مەبەستی تەنها دونیا بێت ئەوە تووشی شیرک بووە.

بەشی دووەم: عیبادەتێک دەکات شەرع پاداشتی دونیاشی باسکردووە بۆ هاندان، وەک: گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی و چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوک و شتی تر، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (من سره أن يبسط له في رزقه وينسأ له في أثره فليصل رحمه)، ئەم جۆرە کردەوەیە ئەگەر بەئیخلاسی بۆ خوا بیکات و تەنها مەبەستی پاداشتی دونیای هەبێت، ئەوە داخلی ئەم هەڕەشەیە دەبێت و جۆرێکە لە شیرک، بەڵام ئەگەر مەبەستی پاداشتی دونیا و ئاخیرەتی هەبێت، لەبەر ئەوە کردەوە دەکات تاوەکو بچێتە بەهەشت و لە ئاگر ڕزگاری ببێت، لەم حاڵەتە هیچی تێدا نییە، چونکە شەرع پاداشتی دونیای باسکردووە وەک هاندان، هەروەک پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (من قتل قتيل فله سلبه).

جۆری دووەم: سەبارەت بەم ئایەتە: ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ﴾، پێشینەکان دەڵێن: ئەمەش دەکەوێتە ژێر ئەم ئایەتە بەوەی کەسێک کردەوەی باش دەکات بۆ سەروەت و سامان، کردەوە دەکات بۆ بەدەست هێنانی ماڵ، وەک: خوێندن و خۆ فێرکردنی زانستی شەرعی تەنها بۆ پیشە، مەبەستی لادانی نەزانینی نییە لەسەر نەفسی خۆی، هەروەها مەبەستی فێربوونی فەرمان و

نەهییەکانی خوا نییە، وە مەبەستی چوونە بەهەشت و دوورکەوتنەوەی نییە لە ئاگر، یان قورئان لەبەر دەکات بۆ ئەوەی ببێتە ئیمامی مزگەوت، بۆ ئەوەی مووچە وەربگرێت لە (بیت المال)، مەبەستی تەنها سەرووەت و سامانە، ئەمەیان کردەوەی باشی ئەنجام نەداوە، بەڵکو کردەوەی ئەنجام داوە لە ڕووکەشدا باشە بەڵام لەناخەوە بۆ دونیایە.

جۆری سێیەم: ئەهلی ڕیا ئەوانەی کردەوە دەکەن بۆ ڕیا.

جۆری چوارەم: ئەوانەی کردەوەی باش ئەنجام دەدەن لەگەڵ ئەوەش دا تووشی هەڵوەشێنەرێکی ئیسلام دەبن، وەک: کەسێک نوێژ دەکات و زەکات دەدات و خێر دەکات و قورئان دەخوێنێتەوە، بەڵام شیرکی گەورەی لەلایە، ئەمەیان ئەگەر بوترێ: ئیمانداره ئەوە ڕاست نییە، چونکە ئەگەر ڕاستگۆ بوایا خوای گەورەی بە تەنیا دەپەرست)[1].

﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ إِلَّا النَّارُ﴾: ئاماژە کردن بۆ ئەوە کە تەنها دونیایان دەویست، چونکە ئاماژە کراوە بە کۆ.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە تاوەکو ڕوونی بکاتەوە هەر کەسێک عیبادەت بکات تەنها بۆ سوودێکی دونیا، ئەوا تووشی شیرک بووە.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

١- هەر کەسێک لە کردەوە تەنها مەبەستی دونیا بێت، ئەوە پاداشتی دونیای پێ دەدرێت و بێ ئەوەی کەم بکرێتەوە، لەبەر وتەی: ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ

(١) التمهيد لاپەڕە (٣٨٨-٣٩١).

أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ﴾، هەروەها دونیا دان بە هەندێک لە خەڵکی بەڵگە نییە لەسەر ڕازی بوونی خوای گەورە لێیان، ئاماژە کردن بۆ ئەوە هەموو کردەوەیەک بە نییەتە.

**٢-** جێگیرکردنی ویست بۆ مرۆڤ، مرۆڤ ناچار نییە، وەڵامە بۆ جەبریەکان.

**٣-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە خوای گەورە سەروەت و سامان دەداتە کافران، ئەوان تیایدا هیچیان لێکەم ناکرێتەوە لەو هەوڵ و کۆششەی داویانە، بەڵام تەنها ئەم خۆشیەی دونیایان بۆ ئەوان هەیە.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (لەبەر ئەوە عومەر گریا کاتێک پێغەمبەری بینی (ﷺ) شوێنەواری فەرشی لەسەر تەنیشتی بەدیار کەوتبوو، گوتی:" بۆچی دەگرییت؟"، گوتی: ئەی نێردراوی خوا! کیسرا و قەیسەر لەناو خۆشی و نازو نیعمەت دا دەژین، تۆش ئەمە حاڵتە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (أولئك قوم عجلت لهم طيباتهم)، لە ڕاستیدا زیانە بەسەریان، چونکە ئەگەر گوازرانەوە بۆ دۆزەخ ئەو کات توندترین و گەورەترین سزایان بۆ هەیە لەو خۆشی یەی لە دونیا بردوویانە)[1].

**٤-** ئەم دوو ئایەتە بەڵگەن دونیا دان بە هەندێک لە خەڵکی بەڵگە نیە لەسەر ڕازی بوونی خوای گەورە لێیان.[2].

**٥-** ئەم دوو ئایەتە بەڵگەن عیبرەت بە شێوەی کردەوەکە نییە، بەڵکو عیبرەت بە نییەتی کەسەکەیە، ئەگەر نییەتی کەسەکە بە پاکی بۆ خوا بێت ئەوا کردەوەکە کردەوەیەکی

---

[1] القول المفيد.

[2] إعانة المستفيد(١٤٣/٢).

باشە، ئەگەر نییەتی کەسەکە بۆ خوا نەبێت ئەوا کردەوەکەی پووچە ئەگەرچی شێوەی کردەوەکە باشیش بێت[١].

---

[١] إعانة المستفيد (١٤٣/٢).

**وفي الصحيح عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (تعس عبد الدينار، تعس عبد الدرهم، تعس عبد الخميصة، تعس عبد الخميلة، إن أعطي رضي، وإن لم يعط سخط، تعس وانتكس وإذا شيك فلا انتقش، طوبى لعبد أخذ بعنان فرسه في سبيل الله، أشعث رأسه، مغبرة قدماه، إن كان في الحراسة كان في الحراسة، وإن كان في الساقة كان في الساقة، إن استأذن لم يؤذن له، وإن شفع لم يشفع )**[1].

واته: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (دەک بە دەم دا بکەوێت بەندەی دینار، بە دەم دا بکەوێت بەندەی درهەم، بە دەم دا بکەوێت بەندەی پۆشاک، بە دەم دا بکەوێت بەندەی پەتوو، ئەگەر پێی بەخشرا ڕازی دەبێت و بێ دەنگ دەبێت، ئەگەر پێی نەبەخشرا ناڕازی دەبێت،_بە دەما بکەوێت و بشکەوێت بە ملدا، وە ئەگەر دڕکی چوو بە گیانیدا کەس نەبێت بۆی دەربێنێتەوە و خۆیشی ناتوانێت، خۆشی بۆ بەندەیەک هەمیشە ئامادەیە و دەستی گرتووە بە جلەوی ئەسپەکەوە و لە جیهاد دایە لە ڕێگەی خوا، هەمیشە سەرقالە و نیشانەکەی ئەوەیە قژ و سەری ئالۆزاو و گیانی خۆڵاوی یە، ئەگەر لە پاسەوانی دانرا پاسەوانی یەکەی بەجوانی بەڕێوە دەبات، وە ئەگەر لە کۆتایی سوپاوە دانرا، گوێی ناداتێ هەر کارەکەی خۆی ڕادەپەڕێنێ، ئەگەر ئیزنی خواست لە ئەمیر و کاربەدەستان کە بڕواتە لایان یان قسە بکات ئیزنی نادەن، ئەگەر تکاشی کرد، تکاشی لێ وەرناگیرێت).

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(تعس):** واتە: خەسارەت مەندی و تیاچوون.

---

[1] أخرجه البخاري (٢٨٨٦-٢٨٨٧).

**(إن أعطي رضي، وإن لم يعط سخط):** واتە: ئەگەر پێی بەخشرا ڕازی دەبێت و بێ دەنگ دەبێت، ئەگەر پێی نەبەخشرا ناڕازی دەبێت، دوو ئەگەری هەیە:

١- لەوانەیە پێدانی قەدەری بێت، ئەگەر خوای گەورە پێی دا لە قەدەر، ئەوا دڵی خۆش دەبێت و ڕازی دەبێت و دڵی پێ خۆش دەبێت، ئەگەر پێی نەدرا ناڕازی دەبێت لە قەدەری خوا.

٢- لەوانەیە پێدانی شەرعی بێت، واتە ئەگەر کەسێک بە ڕێگای شەرعی ڕازی بێت، ئەگەر پێی نەدا ناڕازی دەبێت، ئەمە بەڵگەیە ئەم پیاوە بە ماڵ ڕازی دەبێت و تووڕە دەبێت، لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) ناوی ناوە بە بەندەی ماڵ.

**(طوبى):** چەند وتە هەیە سەبارەت بە (طوبى):

١- هەندێ زانا دەڵێن: خۆشی بۆ ئەو کەسە، واتە: خۆشترین حاڵ حاڵی ئەو کەسەیە.

٢- هەندێ زانای تر دەڵێن: دارێکە لە بەهەشت.

٣- هەندێ زانای تر دەڵێن: ناوێکە لە ناوەکانی بەهەشت.

**(إن كان في الحراسة كان في الحراسة، وإن كان في الساقة كان في الساقة، إن استأذن لم يؤذن له، وإن شفع لم يشفع):** ئەم ڕستەیە ئەگەری دوو مانای هەیە:

١- گوێی لێ نییە و لای گرینگ نیە لە کوێ دادەنرێت و بە هەموو شوێنێک ڕازی یە، داوای پلەی بەرز ناکات و کەسێکی خۆ بەکەم زانە.

٢- ئەگەر لە پاسەوانی دابنرێت کارەکەی خۆی دەکات و مافی دەدات، ئەگەر لە کۆتایی سوپاش دانرا هەمان شتە، زانایان دەڵێن هەردوو مانا هەڵدەگرێت، چونکە هەردوو مانا پێچەوانەی یەکتر نین.

**هۆكاری باسكردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری كتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسكردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بكاتەوە موسڵمان بە دونیا تووشی شیرک دەبێت، وەسفی كەسانێكی كردوە بە بەندەی دینار و درهەم.

**سوودەكانی فەرموودەكە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە خەڵک دوو جۆرن، جۆری یەكەم خەڵكی دونیا و جۆری دووەم خەڵكی ئاخیرەتن، فەرموودەكە خەڵكی دابەش كردوە بۆ دوو بەش:

یەكەم: كەسێكە هیچ نیازێكی نیە مەگەر دونیا نەبێت، یان بۆ بەدەست هێنانی ماڵ، یان جوان حال و شێوە، دوور كەوتۆتەوە و سەرقاڵ بووە لە عیبادەت و زیكری خوا.

دووەم: كەسێكە گەورەترین مەبەستی ئاخیرەتە، سەرقالە بە جیهاد كردن لە ڕێگای خوا لەگەڵ ئەمەش هەموو واجبەكان جێ بەجێ دەكات[1].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە مرۆڤ بە دونیا تووشی شیركی بچووک دەبێت، زانایان دەڵێن هەوڵ دان بۆ دونیا و شوێن كەوتنی دوو حاڵەتە:

١- كەسێک شوێن دونیا دەكەوێت و پشت لە دین دەكات، هەموو شتێک لە پێناو دونیادا دەكات و هیچ كردەوەیەكی باش ئەنجام نادات، ئەمەیان تووشی كوفری گەورە بووە.

٢- كەسێک كردەوە ئەنجام دەدات و بە یەكجاری پشت لە دین ناكات و شوێن دونیاش كەوتوە، ئەمەیان تووشی شیركی بچووک بووە.

---

[1] القول المفيد.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (پێغەمبەر (ﷺ) ناوی لەو بەندە ناوە کە کردەوە دەکات بۆ دونیا بە بەندەی ئەو شتەی کە هەوڵی بۆ دەدات، ئەمە بەڵگەیە شیرکە، بەڵام بۆ حەقی ئیماندار شیرکی بچووکە و تەوحیدی کەم دەبێت و ئەو کردەوەیەی بچووک دەبێت کە ئەمە مەبەستەی تێکەڵ کردووە)[1].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نزمی پلەی کەسێک لای مرۆڤەکان نابێتە بەڵگە کە لای خوای گەورەش پلەی نزمە.

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەزڵی خۆ بە دەرنەخستن و فەزڵی کردنی کردەوەی باش بە نهێنی[2].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نیشانەکانی کردەوە ئەنجام دان بۆ ئاخیرەت ئەمانە:

١- هەمیشە ئامادەیە بۆ جیهاد کردن لەپێناو خوا.

٢- گرینگی بە نەفسی خۆی و خۆشی یەکانی دونیا نادات، لەبەر سەرقاڵی بە جیهاد کردن و کردەوەی باش.

٣- حەزی لە پلە و پایەی دونیا نیە، هەر کارێک پێی ڕابسپێری ئەنجامی دەدات بە پاکی و مافی دەدات.

٤- کەسێکە بەناوبانگ نیە لەناو خەڵک و حەزی لێ نیە خۆی بەدەربخات.

---

[1] إعانة المستفيد (١٤٤/٢).

[2] إعانة المستفيد (١٤٤/٢-١٤٥).

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بەندەی دونیا ئەگەر پێی بەخشرا ڕازی دەبێت و بێ دەنگ دەبێت، ئەگەر پێی نەبەخشرا ناڕازی دەبێت، ئەمە بەڵگەیە ئەم پیاوە بە ماڵ ڕازی دەبێت و تووڕە دەبێت، لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) ناوی ناوە بە بەندەی ماڵ.

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ لاوازی بەندەی دونیا، کەسێکی لاوازە سەر لە هیچ شتێک دەرناکات.

## باب من أطاع العلماء والأمراء في تحريم ما أحل الله

## أو تحليل ما حرم الله فقد اتخذهم أربابا من دون الله

وقال ابن عباس: يوشك أن تنزل عليكم حجارة من السماء، أقول: قال رسول الله (ﷺ)، وتقولون: قال أبو بكر وعمر؟!

وقال الإمام أحمد: عجبت لقوم عرفوا الإسناد وصحته، يذهبون إلى رأي سفيان، والله تعالى يقول: ﴿فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴿٦٣﴾﴾ [النور: ٦٣]، أتدري ما الفتنة؟ الفتنة: الشرك، لعله إذا رد بعض قوله أن يقع في قلبه شيء من الزيغ فيهلك.

عن عدي بن حاتم: أنه سمع النبي (ﷺ) يقرأ هذه الآية: ﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ﴾ الآية. فقلت له: إنا لسنا نعبدهم قال: (أليس يحرمون ما أحل الله فتحرمونه ويحلون ما حرم الله، فتحلونه؟) فقلت: بلى. قال فتلك: عبادتهم) رواه أحمد، والترمذي وحسنه[1].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير آية النور.

**الثانية:** تفسير آية براءة.

---

[1] أخرجه الترمذي (٣٠٩٤)، والطبراني في (الكبير) (١٧/ ٩٢ رقم ٢١٨).

**الثالثة:** التنبيه على معنى العبادة التي أنكرها عدي.

**الرابعة:** تمثيل ابن عباس بأبي بكر وعمر، وتمثيل أحمد بسفيان.

**الخامسة:** تغير الأحوال إلى هذه الغاية، حتى صار عند الأكثر عبادة الرهبان هي أفضل الأعمال، وتسمى الولاية، وعبادة الأحبار هي العلم والفقه ثم تغيرت الحال إلى أن عبد من دون الله من ليس من الصالحين، وعبد بالمعنى الثاني من هو من الجاهلين.

## باب من أطاع العلماء والأمراء في تحريم ما أحل الله أو تحليل ما حرم الله فقد اتخذهم أربابا من دون الله

هەر کەسێک گوێڕایەڵی زانا و ئەمیر و سەرکردەکان بکات لەوەدا کە شتێک حەڕام بکات کە خوا حەڵاڵی کردوە، یان شتێک حەڵاڵ بکات کە خوا حەڕامی کردوە، ئەوە ئەوانی کردوە بە خوا و پەرستراوی خۆی بێجگە لە خوا.

زانایان دەڵێن گوێ ڕایەڵی کردنی سەربەخۆ تەنها بۆ خوایە و گوێ ڕایەڵی کردنی پێغەمبەر (ﷺ) تابعە بۆ گوێ ڕایەڵی خوا، هەروەها گوێ ڕایەڵی زانایان دەکرێت لە حەق نەوەك لە باطل. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ﴾ [النساء: ٥٩]، واتە: گوێڕایەڵی خوا و گوێڕایەڵی پێغەمبەر و زانا وکاربەدەستان بکەن.

صالح ال شيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: ﴿وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ﴾، کاری گوێڕایەلی (واتە: أطيعوا) دووبارە نەکردۆتەوە، ابن القيم و بێجگە لە ابن القيم دەڵێن: ئەمە بەڵگەیە کە گوێڕایەلی أولی الامر سەربەخۆ نیە، بەڵکو گوێڕایەڵییان دەکرێت لە گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر، ئەگەر فەرمانیان بە تاوان کرد گوێڕایەلی دروست کراو ناکرێت لە پێچەوانەی دروستکار)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (دانەری کتاب دەفەرمووێت: (من أطاع العلماء والأمراء)، ئەمە مەرج و وەڵامە، چونکە حەڕام کردن و حەڵاڵ کردن مافی خوای گەورەیە کەس بۆی نیە ببێتە شەریک لەگەڵ خوا، هەر کەسێک شت حەڵاڵ بکات یان

[1] التمهيد لاپەڕە (٣٩٥).

حەڕام بکات بە بێ بەڵگەی قورئان و سوننەت ئەوا نەفسی خۆی کردۆتە شەریک لەگەڵ خوا، هەر کەسێک گوێڕایەڵی بکات ئەوا کردوویەتی بە شەریک لەگەڵ خوا لە تشریع.

ئەمەیان پێی دەڵێن شیرکی گوێڕایەڵی، چونکە عیبادەت ماناکەی گوێڕایەلی کردنی خوایە بە جێ بە جێکردنی فەرمانەکان و تەرک کردنی نەهی یەکان)[1].

---

[1] إعانة المستفيد (١٤٧/٢).

**وقال ابن عباس: يوشك أن تنزل عليكم حجارة من السماء، أقول: قال رسول الله (ﷺ)، وتقولون: قال أبو بكر وعمر؟!**

واتە: ابن عباس دەفەرموویت: نزیکە لە ئاسمانەوە بەرد ببارێت بەسەرتاندا، (چونکە) دەڵێم: پێغەمبەر (ﷺ) ئاوای فەرموو، ئێوەش ڕەتی دەکەنەوە و دەڵێن: ئەبوبەکرو عومەر ئاوایان گوتوە.

## ڕاڤەی وشەکانی ئەم ئەثەرە:

**(يوشك):** واتە: نزیکە.

## هۆکاری باسکردنی ئەم ئەثەرە لەم بابە:

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (چونکە واجبە لەسەر موسڵمان ئەگەر گوێی لە فەرموودەی پێغەمبەر بوو (ﷺ) لە زانست و فقه یان ئەهلی علم ڕوونیان کردەوە، نابێت فەرموودەکە تەرک بکات بۆ وتەی هەر کەسێک)[1].

## سوودەکانی ئەم ئەثەرە:

**١-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە بۆ خۆ پاراستن لە شوێن کەوتنی کوێرانە و دەمارگیری کە بنیات نەنراوە لەسەر بنچینەیەکی ڕاست[2].

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: ( ئەگەر ئەوەی قسە دەکات پێچەوانەی شەرع ئەبوبەکر بێت ئەی چی دەڵێی بۆ کەسانی تر لە هاوەڵان و تابعین، ئەی دەبێت چۆن بێت بۆ ئەوانەی ئەهلی مەزهەبن، ڕێزگرتنی زانایان و مەزهەب واجبە، بەڵام هەموو

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٣٩٨).
[2] القول المفيد.

زانایان یەک دەنگن هەر کەسێک سوننەتی بۆ ڕوون بووەوە بۆی نیە سوننەت تەرک بکات بۆ وتەی کەسێکی تر)[١].

**٢-** هۆکاری گوتنی ئەم وتەیە لەبەر فسخ کردنی حەج بوو بۆ عومرە.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ابن عباس خوا لێی ڕازی بێت ئەم وتەیەی گوت کاتێک خەبەری پێ گەیشت کە ئەبوبەکر و عومەر خوا لە هەردووکیان ڕازی بێ وایان دەبینی نابێت حەج فەسخ بکرێت بۆ عومرە، لە کاتێک دا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کردوە بە فسخ کردنی حەج بۆ عومرە بۆ کەسێک قوربانی لەگەڵ خۆی نەهێنابێت)[٢].

**٣-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە بۆ فەزڵی ابن عباس و وردی تیگەیشتنی[٣].

**٤-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە بۆ واجبی تووڕە بوون لە پێناو خوا و پێغەمبەری خوا[٤].

**٥-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە بۆ ترسانی هاوەڵان لە سزای خوا ئەگەر سەرپێچیان کرد.

**٦-** ئینکاری کردنی بەرامبەر بە توندی هەندێک کات پێچەوانەی حیکمەت نیە.

---

[١] التمهيد لاپەڕە (٣٩٩).

[٢] القول المفيد.

[٣] الجديد لاپەڕە (٣٣٣).

[٤] الجديد لاپەڕە (٣٣٣).

**وقال الإمام أحمد: عجبت لقوم عرفوا الإسناد وصحته، يذهبون إلى رأي سفيان، والله تعالى يقول:** ﴿فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴿٦٣﴾﴾ [النور: ٦٣]، **أتدري ما الفتنة؟ الفتنة: الشرك، لعله إذا رد بعض قوله أن يقع في قلبه شيء من الزيغ فيهلك.**

واتە: ئیمام ئەحمەد دەفەرموویت: سەرم سوڕماوە لەو کەسانەی کە شارەزای ئیسنادی فەرموودەن و دەشزانن کام فەرموودە صحیحە، کەچی دەڕۆن شوێن ڕای سوفیانی سەوری دەکەون، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴿٦٣﴾﴾، واتە: (ئەوانەی کە سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەری خوا دەکەن و لێی لادەدەن با بترسن و خۆیان بپارێزن لەوەی تووشی فیتنە ببن یان تووشی سزایەکی بە ئێش ببن.)، دەزانن ئەم فیتنەیە چییە؟ ئەم فیتنەیە شیرکە.

**ڕاڤەی وشەکانی ئەم ئەثەرە:**

**(عجبت):** واتە: سەرم سوڕماوە.

**(يذهبون إلى رأي سفيان):** واتە: دەڕۆن شوێن ڕای سوفیانی سەوری دەکەون.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئەثەرە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئەثەرەی باسکردوە چونکە نابێت شوێن هیچ زانایەک بکەویت لە سەرپێچی کردنی خوا و پێغەمبەری خوا.

**سوودەکانی ئەم ئەثەرە:**

**١-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە ڕەت کردنەوەی وتەی پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر وتەی کەسێکی تر ترسی ئەوەی هەیە خوای گەورە سزای بدات.

صالح الفوزان خوا بیپاریزێت دەفەرمووێت: (تەرک کردنی فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) و وەرگرتنی وتەی زانایان و کاربەدەستان بە پێچەوانەی وتەی پێغەمبەر بۆ حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن هۆکارە بۆ تووش بوون بە فیتنە یان سزای بە ئێش)[(١)].

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم ئەثەرە بەڵگەیە ڕەت کردنەوەی وتەی پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر وتەی کەسێکی تر ترسی ئەوەی هەیە خوای گەورە سزای بدات)[(٢)].

**٢-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە هەر کەسێک گەیشتبێتە پلەی ئیجتهاد و سەنەد بزانێت نابێت تەقلید بکات.

**٣-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە هەر کەسێک نەگەیشتبێتە پلەی ئیجتهاد و سەنەد و نەزانێت دەبێت تەقلید بکات بە کەسێک کە جێگای متمانە بێت و شارەزا بێت.

**٤-** ئەم ئەم ئەثەرە بەڵگەیە صحیحی سەنەد بەڵگەیە لەسەر صحیحی مەتن، بە پێچەوانەی ئەوانەی عەقڵی خۆیان دەکەنە بەڵگە و هەموو شتێک لایان عەقڵە، دەڵێن ئەگەر سەنەد صحیح بوو نابێتە بەڵگە کە مەتنی صحیحە[(٣)].

---

[(١)] إعانة المستفيد (٢/١٦٠).

[(٢)] التمهيد لاپەڕە (٤٠٠).

[(٣)] إعانة المستفيد (٢/١٦٢).

**عن عدي بن حاتم: أنه سمع النبي (ﷺ) يقرأ هذه الآية:** ﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ﴾ **الآية. فقلت له: إنا لسنا نعبدهم قال: (أليس يحرمون ما أحل الله فتحرمونه ويحلون ما حرم الله، فتحلونه؟) فقلت: بلى. قال فتلك: عبادتهم) رواه أحمد، والترمذي وحسنه**[1].

واتە: لە عەدی کوڕی حاتەم دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ئەم ئایەتەی دەخوێند: ﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ﴾، منیش گوتم: ئێمە نەمان پەرستوون، فەرمووی: (ئەی ئەوە نیە ئەوەی خوا حەڵالی کردوە ئەمان هاتوون حەڕامیان کرد، ئێوەش یەکسەر بە حەڕامتان دادەنا، ئەوەشی کە خوا حەڕامی کردوە ئەوان حەڵاڵیان دەکرد، ئێوەش یەکسەر بە حەڵاڵتان دادەنا؟ منیش گوتم: بەڵێ وایە. فەرمووی: دەی ئەوە پەرستنی ئەوانە).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(فقلت له: إنا لسنا نعبدهم):** واتە: منیش گوتم: ئێمە نەمان پەرستوون.

**(قال فتلك عبادتهم):** واتە: فەرمووی: دەی ئەوە پەرستنی ئەوانە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە گوێڕایەڵی کردنی زانایان لە پێچەوانەی شەرعدا بە شیرک حساب دەکرێت.

---

[1] أخرجه الترمذي (٣٠٩٤)، والطبراني في "الكبير"(١٧ /٩٢ رقم ٢١٨).

**سوودەكانی فەرموودەكە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە گوێڕایەلی بە مانای عیبادەت دێت، كەواتە گوێڕایەڵی كردنی زانایان بە پێچەوانەی شەرع شیركە.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە گوێڕایەڵی بە مانای عیبادەت دێت)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (فەرموودەی عەدی خوا لێی ڕازی بێت بەڵگەیە عیبادەت تەنها لە ڕكوع و سوجدە و دوعادا نیە، بەڵكو گوێڕایەڵی فەرمان و تەرك كردنی نەهی لێكراوەكانیش دەگرێتەوە)[2].

گوێ رایەڵی كردنی زانایان ئەم چوار حاڵەتەیە:

حاڵەتی یەكەم: ئەگەر گوێ ڕایەڵی زانا بكات لە حەڕام كردنی حەڵاڵێك یان حەڵاڵ كردنی حەڕامێک و باوەڕی وابێت گوێ ڕایەڵی كردنی دروستە و بە قسەی ئەو حەڵاڵ حەڕام دەبێت، ئەمە شیركی گەورەیە و شیركە لە گوێ ڕایەڵی كردندا.

حاڵەتی دووەم: ئەگەر گوێ ڕایەڵی زانا بكات لە حەڕام كردن و حەڵاڵ كردن ئەگەر حەڕامەكەش حەڕام بێت یان حەڵاڵەكەش حەڵاڵ بێت هەر تووشی شیركی گەورە بووە، چونكە زانای كردۆتە خوای خۆی لە دین و گوێ ڕایەڵی سەربەخۆی بۆ زانا داناوە.

حاڵەتی سێیەم: ئەگەر گوێ ڕایەڵی زانا بكات لە حەڕام كردنی حەڵاڵێک یان حەڵاڵ كردنی حەڕامێک و بزانێت زانایەكە هەڵەیە بەڵام شوێن ئارەزووی خۆی بكەوێ و گوێ

---

[1] القول المفيد.

[2] إعانة المستفيد (١٦١/٢).

ڕایەڵی بکات ئەمە تەنها تاوانبارە، هەروەها هەندێ زانا دەڵێن تووشی شیرکی بچووک بووە.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەگەر ئەوەی گوێڕایەڵییان دەکات باوەڕی وابێت حەڕامە و دان بەوەدا دەنێت کە ئەمە هەڵەیە، بەڵام گوێڕایەڵیان دەکات لەبەر هەواو ئارەزووی خۆی کەچی دان بەوەدا دەنێت کە تاوانە، ئەمە شیرکی بچووکە)[1].

حاڵەتی چوارەم: ئەگەر گوێ ڕایەڵی زانا بکات لە حەڵاڵ کردنی حەڕام یان حەڕام کردنی حەڵاڵ، هەروەها نەزانێت فڵانە شت حەڵاڵە یان حەڕامە و گومانی وایە ڕاست دەکات، ئەمەیان عوزری هەیە و تاوانبار نابێت.

کەسانێک دەڵێن یان باوەڕیان وایە وتە و فەتوای فلان پیاو چاک یان زانا ئەگەر لە قورئان و سوننەت بەهێزتر نەبێت ئەوا یەکسانە، گومانی تێدایە نیە ئەمانە کافرن ئەگەر شەو شەونوێژ بکەن و ڕۆژیش بە ڕۆژوو بن و بە ئەندازەی چیای ئوحدیش ماڵ ببەخشن خوای گەورە لێیان خۆش نابێت، موسڵمانان لەم سەردەمەدا زۆرینەیان سەرسامن بە بانگخوازەکان بە سەرسام بوونێکی کوێرانە بێ ئەوەی لێیان بکۆڵنەوەو بپرسن ئەوەی دەیڵێن ڕاستە یان نا؟! بەڵگەی هەیە یان نا؟! هەر کەسێک بانگخوازێکی دیارکردووە و بە شان و بالیدا دەڵێت و کردوویەتی بە زانا کەچی ئاستی ئەو بانگخوازە لە ئاستی قوتابی دایە نەک مامۆستا، بەڵکو هەیە لە ئاستی قوتابییشدا نیە، زۆرینەی ئەو بانگخوازانەی گومڕا دەبن خەڵکی نەزانن گومڕایان دەکەن، چونکە بە شان و بەژنیان دا دەڵێن و پلەیەکیان بۆ داناون کەچی لەو پلەیەدا نین، لە لایەکی ترەوە کەسانێک دینداری بە خزمایەتی و حزبایەتی دەکەن، دین لە مەلای خزمی خۆی نەبێت لە کەسی تری وەرناگرێت یان لە حزبی خۆی نەبێت وەریناگرێت و دەڵێن ئەمە زانای سەردەمە، ئەوەی زانراو بێت خەڵکی

---

[1] اعانة المستفيد (٢/١٦٠).

عەوام کە شارەزاییان نیە لە دین و ناتوانن ئاستی مامۆستای ئایینی دیار بکەن، چونکە شارەزا نین.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە شوێن کەوتنی زانایان و بەندە چاکەکان پێچەوانی شەرعی خوا، کردنە بە خوا[١].

---

[١] القول المفيد.

**باب قول الله تعالى:**

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾ { النساء: ٦٠}.

وقوله: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ قَالُواْ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ﴾ { البقره: ١١}.

وقوله: ﴿وَلاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا﴾ {الاعراف: ٥٦}.

وقوله: ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾ {المائده: ٥٠}.

عن عبد الله بن عمرو رضي الله عنهما، أن رسول الله (ﷺ) قال: ( لا يؤمن أحدكم حتى يكون هواه تبعا لما جئت به) قال النووي: حديث صحيح، رويناه في كتاب "الحجة" بإسناد صحيح[1].

وقال الشعبي: كان بين رجل من المنافقين ورجل من اليهود خصومة؛ فقال اليهودي:نتحاكم إلى محمد ـ لأنه عرف أنه لا يأخذ الرشوة ـ وقال المنافق: نتحاكم إلى اليهود ـ لعلمهأنهم يأخذون الرشوة – فاتفقا أن يأتيا كاهنا في جهينة فيتحاكما إليه، فنزلت: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ) الآية[2].

وقيل: نزلت في رجلين اختصما، فقال أحدهما: نترافع إلى النبي (ﷺ)، وقال الآخر: إلى كعب بن الأشرف، ثم ترافعا إلى عمر، فذكر له أحدهما القصة. فقال للذي لم يرض

---

[1] أخرجه ابن أبي عاصم في (السنة) والبيهقي في (المدخل الى السنن الكبرى) (لاپەڕە ١٨٨ رقم ٢٠٩) والهرة في (ذم الكلام و أهله) (١٦٩/٢).

[2] أخرجه المروزي في (تعظيم قدر الصلاة) (٦٥٨/٢ رقم ٧١١)، والطبراني(١٥٢/٥).

**برسول الله (ﷺ): أكذلك؟ قال: نعم، فضربه بالسيف فقتله[1].**

**فيه مسائل:**

**الأولى: تفسير آية النساء وما فيها من الإعانة على فهم الطاغوت.**

**الثانية: تفسير آية البقرة: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ﴾.**

**الثالثة: تفسير آية الأعراف ﴿وَلاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا﴾.**

**الرابعة:** تفسير: ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾.

**الخامسة:** ما قاله الشعبي في سبب نزول الآية الأولى.

**السادسة:** تفسير الإيمان الصادق والكاذب.

**السابعة:** قصة عمر مع المنافق.

**الثامنة:** كون الإيمان لا يحصل لأحد حتى يكون هواه تبعا لما جاء به الرسول.

---

[1] أخرجه الثعلبي في "تفسيره"(٣٣٧/٣)عن ابن عباس من قوله، وأخرجه الطبري في " التفسير"، عن مجاهد من قوله (١٥٤/٥), وكذا ابن أبي حاتم في " تفسيره" (٩٩١/٣ رقم ٥٥٤٨)، وانظر: " فتح الباري" (٣٧/٥)

## باب قول الله تعالى:

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾ { النساء: ٦٠}.

واتە: ئایا نەتڕوانیوەتە ئەو (دووڕووانەی) لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە بەڕاستی باوەڕیان هێناوە بەوەی کە بۆ تۆ ڕەوانەکراوە و بەوەش کە پێش تۆ ڕەوانەکراوە (بۆ پێغەمبەران)! کەچی دەیانەوێت ڕووبکەنە زۆردارو جادووگەرو خوانەناسان تا دادوەریان لە نێواندا بکەن و چارەسەری کێشەکانیان بکەن، لەکاتێکدا بە ڕاستی فەرمانیان پێدراوە کە باوەڕیان بە (تاغوت) نەبێت، شەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بکات بەگومڕاییەکی دوورو بێ سنوور.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: ( ئەم بابە پەیوەندییەکی بەهێزی هەیە لەگەڵ بابی پێشوو؛ چونکە بابی پێشتر ئەوەی باسکردووە حوکمی ئەو کەسەی گوێڕایەڵی زانا و کاربەدەستان دەکات لە حەڵاڵ کردنی شتێک کە خوا حەڕامی کردوە یان حەڕام کردنی شتێک کە خوا حەڵاڵی کردوە، ئەمەیان ئینکاری ئەو کەسە دەکات کە بێجگە لە خوا و پێغەمبەر دەکاتە حاکم بۆ کێشەکان یان هەر شتێکی تر)[١].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم بابە لە جنسی بابی پێشوە، هەردووکیان باسی گۆڕینی شەرعی خوا دەکەن، بەڵام ئەم بابە تایبەتە بە حوکم کردن بۆ کێشەکان، بابی پێشووتر باسی حەڕام کردن و حەڵاڵ کردنە بە شێوەیەکی گشتی)[٢].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (یەکخواپەرستی لە گوێڕایەڵی خوا و تحقيقی وشەی: (لا إله إلا الله محمدا رسول الله) نایێتەدی ئیلا بە حوکم کردن بەوە

[١] القول المفيد.
[٢] إعانة المستفيد.

نەبێت كە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دابەزیوە، وازهێنان لەوەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دابەزیوە بە حوكمی جاهلی، یان بە حوكمی یاسا، یان بە حوكمێک كە پێچەوانەی حوكمی خوا بێت، ئەمە كوفری گەورەیە و هەڵوەشێنەری وشەی: (لا إله إلا الله محمدا رسول الله))[1].

**هۆكاری دابەزینی ئایەتەكە:**

لە موجاهد دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: (كێشە كەوتە نێوان پیاوێكی دووڕوو و پیاوێكی جولەكە، دووڕووەكە گوتی: با بڕۆین بۆ لای كەعبی كوڕی ئەشرەف بۆ ئەوەی دادوەری بكات لەنێوانمان، جولەكەكە گوتی: بڕۆین بۆلای محمد، خوای گەورە فەرمووی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا ۝٦٠ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنْكَ صُدُودًا﴾)[2].

**ڕاڤەی وشەكانی ئایەتەكە:**

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى﴾: استفهام مەبەست پێی دان پێنان و سەیری حاڵیانە، خطاب بۆ پێغەمبەرە دروود و سەلامی خوای لێ بێت.

﴿يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ﴾: تاغوت مەبەست پێی هەموو حوكمێكە كە پێچەوانەی حوكمی خوا و پێغەمبەر بێت، یان هەموو حاكمێكە كە حوكم بكات بە حوكمی بێجگە لە خوا و پێغەمبەر.

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٤٠٥).

(٢) أخرجه الطبري في (جامع البيان) (١٩٤/٧)، وابن أبي حاتم في (تفسيره) (٩٩١/٣-٩٩٣).

﴿وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ﴾: شەیتان مەبەست پێی جنسە، شەیتانی جنۆکە و مرۆڤ دەگرێتەوە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ڕووی باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە ڕوون و ئاشکرایە، حوکم کردن بە شەریعەت وشەریعەت کردنە حاکم بۆ هەموو شتێک لە تەوحیدی خوای گەورەیە، هەروەها تەرک کردنی ئەمە شیرکە بەخوا و سیفەتی دووڕووەکانە)[1].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** سەیری حاڵی دووڕووەکان و ئینکاری کردنیان لەوەی لەسەری دەڕۆن و تناقضیان، لەبەر وتەی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾.

**٢-** درۆی دووڕووەکان کە بانگەشەی ئیمان دەکەن، هەروەها تناقضیان، بانگەشەی ئەوە دەکەن ئیمانمان هێناوە بەوەی خوای گەورە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دایبەزاندووە و بۆ ئەوانی پێش پێغەمبەریش، لەگەڵ ئەمەش دەیانەوێت ڕوو بکەنە زۆردارو جادووگەرو خوانەناسان تا دادوەری لە نێواندا بکەن و چارەسەری کێشەکانیان بکەن، لەبەر وتەی: ﴿يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ﴾.

---

[1] إعانة المستفيد (١٧٦/٢).

**٣-** واجبی ئیمان هێنان بەوەی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دابەزیوە و بۆ ئەوانەی پێش پێغەمبەریش، لەبەر وتەی: ﴿أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ﴾.

**٤-** جێگیرکردنی دابەزاندنی قورئان لەلایەن خوای گەورە و هەروەها کتێبەکانی پێشووتریش، لەبەر وتەی: ﴿بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ﴾، هەروەها وتەی: ﴿تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنْزَلَ اللَّهُ﴾.

**٥-** جێگیرکردنی بەرزی خوای گەورە بەسەر دروستکراوەکانی، لەبەر وتەی: ﴿أُنْزِلَ﴾، هەروەها وتەی: ﴿تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنْزَلَ اللَّهُ﴾، دابەزاندن لە سەرەوە بۆ خوارەوەیە.

**٦-** شەرەف و ڕێزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە خطاب بۆی و جێگیرکردنی پەیامی.

**٧-** ڕووکردنە حوکمی جگە لە قورئان و حوکمی تاغوت، لەبەر وتەی: ﴿يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ﴾.

ئەگەر ویستی ڕووکردنە جگە لە حوکمی خوا لەدین دەرچوون بێت، ئەوە ڕووکردنە حوکمی جگە لەقورئان لەپێشترە لەدین دەربچیت، بۆیە ئایەتی دواتر فەرمووی: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا﴾ [١]

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم ئایەتە بەڵگەیە ویستی ڕووکردنە بێجگە لە حوکمی خوا و پێغەمبەر نەفی ئیمان دەکات، ئەی ئەگەر بە کردەوە بیکات دەبێت

---

(١) (تفسير ابن عثيمين- سورة النساء) (٤٧٤/١).

چۆن بێت؟ ئەگەر بە کردەوە ڕووبکاتە بێجگە لە حوکمی خوا و پێغەمبەر؟، ئەگەر لە دڵەوە ئەم شتەی لا دروست بێت، ئەگەر چی بە کردەوەش نەکات ئیماندار نیە)[1].

**٨-** ڕووکردنە حوکمی جگە لە قورئان و حوکمی تاغوت کوفرە پەنا بەخوا، لەبەر وتەی: ﴿وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ﴾.

**٩-** عوزر بۆ ئەوانە نییە کە ڕوو دەکەن تاغوتەکان و ئیمانی پێ دەهێنن، چونکە فەرمانیان پێ کراوە کوفر بە تاغوت بکەن.

**١٠-** شوێن کەوتنی تاغوتەکان گومڕا بوونێکە لە شەیتانەوە، لەبەر وتەی: ﴿وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾.

**١١-** واجبی هۆشداری وەرگرتن و خۆپاراستن لە شەیتان و ویستی شەیتان بۆ گومڕا کردن و تووشی کوفرکردن، لەبەر وتەی: ﴿وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾.

**١٢-** شەیتان ڕازی نابێت و قەناعەتی نایەت هەتا خەڵک گومڕا دەکات بەگومڕاییەکی دوورو بێ سنوور، هەتا تووشی کوفری دەکات، بەڵام هەنگاو بە هەنگاو بۆ مرۆڤ دێت، لە تاوانی بچووک دەست پێ دەکات بۆ تاوانی گەورە، پاشان بۆ کوفر.

**١٣-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە واجبە حوکم بکرێت بە شەرعی خوا، نابێت حوکم بکرێت بە شتی تر هەرچیەک بێت، ئەمە بنچینەیە و هەموو یەک دەنگن لەسەری[2].

---

[1] إعانة المستفيد (١٦٧/٢).

[2] التعليق المفيد.

**١٤-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ سەیری حاڵیان، ئەمەش وەردەگیرێت لە استفهام لە وتەی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى﴾، مەبەست لەمە سەرسوڕمانی حاڵیانە[١].

**١٥-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە شەیتان ویستی هەیە[٢].

[١] تفسير سورة النساء (٤٧١/١).

[٢] تفسير سورة النساء (٤٧٥/١).

**وقوله:** ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ﴾ **{ البقرە: ١١}.**
واتە: ئەگەر بەو دووڕووانە گوترا خراپە و فەساد مەنێنەوە لەسەر زەوی، دەڵێن: ئێمە هەر خۆمان چاکسازین.

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ﴾ واتە: ئەوانە کاتێک پێیان دەوترێت تۆی گوناهو تاوان و خراپەکاری مەچێنن لە زەویدا، ئەوەی پێی دەوترێ دیار نەکراوە، لەبەر ئەوەیە تا هەموو کەسێک بگرێتەوە، واتە هەر کەسێک بەو دووڕووانە بڵێت، ماناکەی: ئەگەر پێیان بگوترێ کوفر مەکەن لە زەویدا و پشتگیری کافرەکان مەکەن و خەڵک لە ئیمان دەرمەخەن[١].

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (حوکم کردن بە بێجگە لەوەی خوا دایبەزاندووە گەورەترین هۆکاری فەسادە لەسەر زەوی)[٢].

### سوودەکانی ئایەتەکە:

١- حەڕامی تۆی گوناهو تاوان و خراپەکاری چاندن لە زەویدا، نیفاقیش گەورەترین فەسادە لەسەر زەوی، لەبەر وتەی: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾.

---
(١) الجامع لأحكام القرآن (٣٠٦/١).
(٢) القول المفيد.

٢- مردنی هەستی دووڕووەکان، کوێر بوونی چاویان و کوێر بوونی دڵیان، کە ئەمە گەورەترین بەڵایە، لەبەر وتەی: ﴿وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ﴾.

٣- دەبێت خۆت بپارێزی لە سیفەتی دووڕووەکان، چونکە هەر سیفەتێکی کافر و دووڕوو لە قورئان باسکرابێت ئاماژەیە بۆ ئەوە ئیماندار خۆی لەم سیفەتانە بپارێزی، ئەوان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ئیماندارن، کەچی درۆ دەکەن، بانگەشەی ئەوە دەکەن چاکە لە زەویدا دەڕوێنن کەچی خراپە دەڕوێنن.

٤- ئەم ئایەتە بەڵگەیە گەورەترین بەڵا ئەوەیە خراپە جوان بووبێت بۆ مرۆڤ هەتا وای ببینێت خۆی چاکەکارە[1].

٥- هەر کەسێک بانگەشەی شتێک بکات مەرج نییە بانگەشەکەی ڕاست بێت، چونکە ئەوان گوتیان: ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ﴾، خوای گەورە فەرمووی: ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ﴾[2].

٦- مرۆڤ تاقی دەکرێتەوە بە خراپە چاندن لەسەر زەوی، هەروەها خراپەکەش لێی شاراوە دەبێت، لەبەر وتەی: ﴿وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ﴾[3].

---

(١) تفسير ابن عثيمين (٢٠٩/١).

(٢) تفسير ابن عثيمين (٢١٠/١).

(٣) تفسير ابن عثيمين (٢١٠/١).

**٧-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە حوكم كردن بە كتابی خوا لە چاكە كردنە لەسەر زەوی، وە حوكم كردن بە بێجگە لە كتابی خوا لە خراپە كردنە لەسەر زەوی، ئەمەش ڕووی باسكردنی ئەم ئایەتە لەم بابە[1].

[1] إعانة المستفید (١٧٧/٢).

قوله: ﴿وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَا﴾ [الأعراف: ٥٦]

واته: لەگەڵ ئەوەشدا خراپە و فەساد مەنێنەوە لەسەر زەوی پاش ئەوەی سەر زەوی چاک کرا.

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿وَلاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا﴾: واتە: پاش ئەوەی سەر زەوی چاک کرا بە ناردنی پێغەمبەر و وەحی و ئیمان.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ڕووی باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە ئەوەیە: حوکم کردن بەوەی خوای گەورەی دایبەزاندووە لە چاکەکردنە، حوکم کردن بە بێجگە لە حوکمی خوا خراپە کردنە)[1].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** خراپە کردن پاش چاکە گەورەترە لەوەی مرۆڤ خراپە بکات پێش چاکە، ئەگەر چی داواکراوە چاکە بکرێت دوای خراپە[2].

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە چاک بوونی زەوی بە شوێن کەوتنی شەرعی خوایە و حوکم کردنە بە شەرعی خوا، هەروەها خراپە کردن لەسەر زەوی سەرپێچی کردنی فەرمانی خوایە و حوکم کردنە بە حوکمی بێجگە لە شەرعی خوا.[3].

---

(١) القول المفيد.

(٢) القول المفيد.

(٣) التعليق المفيد.

**وقوله:** ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾ {المائده: ٥٠}.
واتە: ئایا ئەوانە حوکمی جاهیلی و نەفامییان دەویێت و لە حوکمی خوا لادەدەن، ئەی جا کێ هەیە حوکمی جوانتر بێت لە حوکمی خوا.

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿يَبْغُونَ﴾: واتە: داوا دەکەن و دەیانەوێت.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردوە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە باشترین حوکم حوکمی خوایە و لادان لە حوکمی خوا کردەوەی دووڕووەکانە و کوفرە.

### سوودەکانی ئایەتەکە:

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە دووڕوو حەز ناکەن لە حوکمی جاهیلی نقل بین بۆ حوکمی خوا، بەڵکو حەز دەکەن لەسەر حوکمی جاهیلی بمێننەوە.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (ئەم دووڕووانەی بانگەشەی ئیسلامیان دەکرد دەیانویست حوکمی جاهیلی بکرێت، حوکمی خوای گەورەیان نەدەویست، نەیاندەویست لە حوکمی جاهیلی نقل بین بۆ حوکمی خوا، بەڵکو دەیان ویست لەسەر حوکمی جاهیلی بمێننەوە، ئەمە مەزهەبی دووڕووەکانە بە بەردەوامی، وە مەزهەبی ئەوانەشە کە شوێنیان دەکەون)[1].

زانایان دەڵێن حوکمی بێجگە لەخوا ئەم چوارانە دەگرێتەوە:

---

[1] إعانة المستفيد (١٧٨/٢).

یەکەم: (المشرع): ئەو کەسەی قانونێک دادەنێت پێچەوانەی شەرعی خوا، ئەمە کافرە، کوفرەکەشی دیارە چونکە نەفسی خۆی کردۆتە تاغوت و بانگی خەڵک دەکات تا گوێڕایەڵی بکەن.

دووەم: (حاکم): ئەو حاکمەی لەسەر قانونی مشرع دەڕوات کە پێچەوانەی شەرعی خوایە، دەڵێن ئەم چوار حاڵەتەیە:

(١) یاسای مشرع لای حاکم باشتر بێت لە خوا، ئەمە کافرە.

(٢) یاسای مشرع لای حاکم وەک حوکمی خوا بێت، ئەمە کافرە.

(٣) حوکم کردن بە یاسای مشرع لای حاکم حەڵاڵە، ئەمە کوفرە.

(٤) حوکم کردن بە یاسای مشرع لای حاکم حەڕامە و دەزانێت حوکمی خوا باشترین حوکمە و

هیچ حوکمێک وەک حوکمی خوا نیە، بەڵام ناچارە لەگەڵ واقع دەڕوات و خۆی پێ تاوانبارە، لەم حاڵەتە وتەی ڕاست ئەوەیە تووشی کوفری بچووک بوە.

حاکم کاتێک خەڵک پابەند دەکات بە یاسای پێچەوانەی شەرع دوو حاڵەتە:

(آ) جارێک یان دوو جار یان زیاتر حوکم دەکات بە یاسا و دەزانێت تاوانبارە و باشترین حوکم حوکمی خوایە، ئەمە تووشی کوفری بچووک بووە.

(ب) حاکمێک هەرگیز حوکم بە شەرعی خوا ناکات، بەردوام حوکم بە شەرعی بێجگە لەخوا دەکات و خەڵک پابەند دەکات بە شەرعی بێجگە لەخوا، دەڵێین کافرە وەک کوفری ئەو کەسەی یاسای داناوە.

هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون کافر نابێت هەتا حەڵاڵی نەکات، چونکە خۆی دەزانێت تاوانبارە و وتەی یەکەم کە دەڵێت کافرە ئەمە وتەی ڕاستە، کە ئەمە وتەی محمد ئیبراهیمە لە نامیلکەی (تحكيم القوانين).

سێیەم: ئەوانەی کێشەی خۆیان دەبەنە لای حاکم بۆ ئەوەی حوکم لەنێوانیان بکات، ئەمە تەفسیلی تیدایە:

(١) ئەگەر حوکمی بێجگە لەخوا هەڵبژێرێت و پێی باشتر بێت ئەوە کافرە.

(٢) ئەگەر بە حوکمی بێجگە لەخوا ڕازی نەبێت، بەڵام ناچار کراوە لەسەر ئەمە، هەروەک لە هەندێک وڵات ئەمە هەیە ئەمە کوفر نیە.

چوارەم: حاڵی وڵات ئەگەر حوکم بە بێجگە لە شەرع بکات، محمد ئیبراهیم دەفەرمووێ: ئەگەر حوکم کردن بە قانون واجب کرابێت ئەوا لەم حاڵەتە:

(١) ئەگەر حوکم کردن بەو قانونە شاراوە بێت و کەم بێت، لەم حاڵەتە وڵاتەکە وڵاتی ئیسلامە.

(٢) ئەگەر حوکم کردن بەو قانونە دیار بێت و بڵاوبێت، لەم حاڵەتە وڵاتەکە وڵاتی کوفرە.

**عن عبد الله بن عمرو رضي الله عنهما، أن رسول الله (ﷺ) قال: (لا يؤمن أحدكم حتى يكون هواه تبعا لما جئت به) قال النووي: حديث صحيح، رويناه في كتاب "الحجة بإسناد صحيح[1].**

واتە: لە عبدالله بن عمرو دەگێڕنەوە خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت گوتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (یەکێ لە ئێوە ئیمانی نییە واتە: (ئیمانی تەواو نییە)، هەتا وای لێ دێت ئارەزووەکانی شوێن ئەوە دەکەون کە من هێناومە).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(لا يؤمن أحدكم):** واتە: ئیمانی تەواو نیە، نەک ئیمانی نەبێت و کافر بێت.

**(حتى يكون هواه تبعا لما جئت به):** واتە: هەتا وای لێ دێت ئارەزووەکانی شوێن ئەوە دەکەون کە من هێناومە.

**(هواه):** وشەی هەوا بەزۆری بۆ گومڕایی بەکاردێت، نەک هەوای ئیمان.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە چونکە واجبە ئیماندار شوێن ئەوە بکەوێت کە خوای گەورە بۆ پێغەمبەری ناردوە (ﷺ).

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

[1] أخرجه ابن أبي عاصم في "السنة" والبيهقي في "المدخل الى السنن الكبرى" (لاپەڕە ١٨٨ ڕقم ٢٠٩) والهروي في "ذم الكلام و أهله" (١٦٩/٢).

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئیماندار ئیمانی تەواو نابێت هەتا وای لێ دێت ئارەزووەکانی شوێن ئەوە دەکەون کە پێغەمبەر (ﷺ) هێناویەتی.

عبدالله بن حميد ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئیمام النووی و کەسانی تری وەک ئیمام النووی دەڵێن: ئەمە نەفی یە هی تەواوی ئیمانە، واتە ئیمانی تەواو نیە نەک کافر بێت)[1].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە ئیماندار شوێن ئەوە بکەوێت کە خوای گەورە بۆ پیغەمبەری ناردووە.

---

[1] شرح كتاب التوحيد لاپەڕە (٥٦٨).

**وقال الشعبي: كان بين رجل من المنافقين ورجل من اليهود خصومة؛ فقال اليهودي: نتحاكم إلى محمد ـ لأنه عرف أنه لا يأخذ الرشوة ـ وقال المنافق: نتحاكم إلى اليهود ـ لعلمه أنهم يأخذون الرشوة – فاتفقا أن يأتيا كاهنا في جهينة فيتحاكما إليه، فنزلت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ﴾ الآية[١].**

واته: شەعبی دەفەرمووێت: لە بەینی پیاوێکی دووڕوو و پیاوێکی جوولەکە ناکۆکی ڕوویدا، جوولەکەکە گوتی: دەڕۆین بۆ لای محمد، با حوکم بدات لە نێوانمان، چونکە دەیزانی بەرتیل وەرناگرێت، دووڕووەکەش گوتی: دەڕۆین بۆ لای پیاوێکی جوولەکە، چونکە دەیزانی بەرتیل وەردەگرێت، پاشان ڕێککەوتن بچن بۆ لای کاهینێ لە جوهەینە و داوای لێ بکەن حوکم بکات لەنێوانیان، پاشان ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ﴾.

**وقيل: نزلت في رجلين اختصما، فقال أحدهما: نترافع إلى النبي (ﷺ)، وقال الآخر: إلى كعب بن الأشرف، ثم ترافعا إلى عمر، فذكر له أحدهما القصة. فقال للذي لم يرض برسول الله (ﷺ): أكذلك؟ قال: نعم، فضربه بالسيف فقتله[٢].**

واته: وتراوە: ئەو ئایەتە لە بارەی دوو پیاوەوە دابەزیوە کە کێشەیان لە بەیندا پەیدا بوو بوو، یەکێکیان گوتی: کێشەکەمان دەبەین بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوەی تریش گوتی: دەیبەین بۆ لای کەعبی کوڕی ئەشرەف، پاشان هەردووکیان کێشەکەیان بردەوە بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب، یەکێکیان بەسەر هاتەکەی بۆ گێڕایەوە، عومەریش بەوەیانی

---

[١] أخرجه المروزي في (تعظيم قدر الصلاة) (٦٥٨/٢ رقم ٧١١)، والطبراني (١٥٢/٥).

[٢] أخرجه الثعلبي في "تفسيره"(٣٣٧/٣)عن ابن عباس من قوله, وأخرجه الطبري في (التفسير)، عن مجاهد من قوله (١٥٤/٥), وكذا ابن أبي حاتم في (تفسيره) (٩٩١/٣ رقم ٥٥٤٨)، وانظر: (فتح الباري) (٣٧/٥).

گوت کە بە حوکمی خوا ڕازی نەبوو بوو، جا بەڕاست مەسەلەکە ئاوابوو؟ گوتی: بەڵێ، عومەریش بە شمشێرەکەی لێی دا و کوشتی.

**ڕاڤەی وشەکانی دوو ئەثەرەکە:**

**(نتحاکم إلی محمد):** نەی گوت پێغەمبەر یان نێردراو، چونکە ئەوان ئیمانیان بە پەیامی پێغەمبەر نەبووە دوورد و سەلامی خوای لێ بێت.

**(إلی کعب بن الأشرف):** پیاوێکی جوولەکە بوو لە گەورەکانی بنی النضر بوو.

**هۆکاری باسکردنی ئەم دوو ئەثەرە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم دوو چیرۆکەی باسکردوە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە واجبە حوکم بە شەرعی خوا بکرێت، هەر کەسێک بە حوکمی خوا ڕازی نەبیت کافرە و دەبێت بکوژرێت.

**سوودەکانی دوو ئەثەرەکە:**

**١-** ئەم چیرۆکە بەڵگەیە هەر کەسێک بە حوکمی پێغەمبەری خوا ڕازی نەبێت کافرە و دەبێت بکوژرێت، لەبەر ئەوە عومەر کوشتی خوا لێی ڕازی بێت. ئەگەر بگوترێ چۆن عومەر دەیکوژێت کەچی کارەکە بۆ پێشەوای ئیماندارانە کە پێغەمبەرە (ﷺ)؟

وەڵام: ئەوەی دیار بێت عومەر نەفسی خۆی پێ نەگیراوە، لەبەر بەهێزی غیرەتی کوشتی، چونکە زانیویەتی ئەمە هەڵگەڕانەوەیە لە دین و پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموویت: (هەر کەسێک دینی خۆی گۆڕی بیکوژن)[1].

---

[1] القول المفید.

**٢-** ئەم چیرۆکە بەڵگەیە لەسەر خراپی دووڕوو، چونکە لە ڕووکەش دا خۆی بە موسڵمان دادەنێت کەچی دەڵێت: دەڕۆین بۆ لای پیاوێکی جوولەکە، چونکە دەیزانی بەرتیل وەردەگرێت.

## باب من جحد شيئا من الأسماء والصفات

وقول الله تعالى: ﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَـنِ﴾ {الرعد:٣٠}.

وفي صحيح البخاري قال علي: (حدثوا الناس بما يعرفون، أتريدون أن يكذب الله ورسوله؟)[١].

وروى عبد الرزاق عن معمر عن ابن طاوس عن أبيه عن ابن عباس: أنه رأى رجلا انتفض ـ لما سمع حديثا عن النبي (ﷺ) في الصفات، استنكارا لذلك ـ فقال: (ما فرق هؤلاء؟ يجدون رقة عند محكمه، ويهلكون عند متشابهه) انتهى[٢].

ولما سمعت قريش رسول الله (ﷺ) يذكر: (الرحمن) أنكروا ذلك. فأنزل الله فيهم: ﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَـنِ﴾[٣].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** عدم الإيمان بجحد شيء من الأسماء والصفات.

**الثانية:** تفسير آية الرعد.

**الثالثة:** ترك التحديث بما لا يفهم السامع.

**الرابعة:** ذكر العلة أنه يفضي إلى تكذيب الله ورسوله، ولو لم يتعمد المنكر.

**الخامسة:** كلام ابن عباس لمن استنكر شيئا من ذلك، وأنه هلك.

---

[١] أخرجه البخاري(١٢٧).

[٢] أخرجه عبدالرزاق في (جامع معمر) الملحق بالمصنف(٤٢٣/١١ رقم ٢٠٨٩٥) وابن أبي شيبة (٥٦٦/٧ رقم ٣٧٩٠٢) وابن أبي عاصم في (السنة) (٢١٢/١ رقم ٤٨٥).

[٣] أخرجه ابن جرير في (التفسير) (١٥٠/١٣) عن قتادة قال: ذكر لنا ...

## باب من جحد شيئا من الأسماء والصفات

## باس كردنی ئەوەی هەر كەسێک ئینكاری شتێک بكات لە ناو و سیفەتەكانی خوا.

صالح آل الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (دانەری کتاب لەبەرئەوە ئەم بابەی باسکردوە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە بە گەورە دانانی ناو و سیفەت لە تەواوی تەوحیدە و ئینکاری کردنی ناو سیفەتیش نەفی ئەسلی تەوحید دەکات، ئەو کەسەی ئینکاری ناوێک لە ناوەکانی خوا دەکات کە خوای گەورە لە نەفسی خۆی ناوە، یان پێغەمبەر (ﷺ) باسی کردوە ئەوا کافرە بە خوا، هەروەک خوای گەورە سەبارەت بە موشریکەکان دەفەرمووێت: ﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَـٰنِ﴾)[1].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئینکاری کردن دوو جۆرە:

یەکەم: ئینکاری کردنی بە درۆخستنەوە، ئەمەیان کوفرە بێگومان ئەگەر کەسێک ئینکاری ناوێکی خوا بکات یان سیفەتێک کە بە قورئان و سوننەت جێگیر بووە وەک ئەوەی بڵێیت: خوای گەورە دەستی نیە یان خوای گەورە لەسەر عەرش نیە یان چاوی نیە ئەمە کافرە بە یەک دەنگی هەموو موسڵمانان، چونکە بە بەدرۆخستنەوەی خەبەری پێغەمبەری خوا لە دین دەردەچێت بە یەک دەنگی هەموو زانایان.

دووەم: ئینکاری کردنی تەئویل (لێکدانەوە)، ئەویش ئەوەیە ئینکاری ناکات بەڵام تەئویل بۆ مانایەکە دەکات کە پێچەوانەی ڕووکەشی دەقەکەیە، ئەمەش دوو جۆرە:

١- لێکدانەوەی بۆ دەکات لە زمانی عەرەبی ئەم لێکدانەوەیە هەیە، ئەمەیان کوفر نییە.

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٤١٥).

**٢-** لێکدانەوەی بۆ دەکات لە زمانی عەرەبی ئەم لێکدانەوەیە نییە، ئەمەیان کوفرە، چونکە ئەگەر لێکدانەوە نەبێت ئەوا لە ڕاستیدا بەدرۆ خستنەوەیە، وەک ئەوەی بڵێت: وتەی خوای گەورە کاتێک دەفەرمووێت: ﴿تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا﴾ [القمر: ١٤]، واتە: (تجري بأرضنا)، ئەمەیان کوفرە، چونکە نەفی دەکات بە نەفی یەکی مطلق و بەدرۆی خستۆتەوە.

ئەگەر سەبارەت بە وتەی خوای گەورە: ﴿بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ﴾ [المائدة: ٦٤]، بڵێت: مەبەست لە هەردوو دەست ئاسمان و زەوی یە ئەمەش کوفرە، چونکە لە زمانی عەرەبی ئەم مانایە هەڵناگرێت، ئینکاری کردوە و بەدرۆی خستۆتەوە، بەڵام ئەگەر بڵێت مەبەست لە دەست نیعمەت و هێزە ئەوا کافر نابێت، چونکە لە زمانی عەرەبی دا بەمانای نیعمەت دێت)[1].

---

[1] القول الفيد.

**وقول الله تعالى:** ﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَـنِ﴾ {الرعد:٣٠}.
خوای گەورە دەفەرموویێت: (ئەوان کافر بوون و ئینکاریان لەوە دەکرد کە خوا ناوی (الرحمن)، بێت).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿وَهُمْ﴾: واتە: کافرەکانی قورەیش.

﴿يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَـنِ﴾: واتە: کوفریان بەو ناوە کردووە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە تاوەکو ڕوونی بکاتەوە ئینکاری کردنی ناوەکانی خوای گەورە کوفرە.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە هەر کەسێک ئینکاری ناوێک لە ناوەکانی خوا بکات کافر دەبێت لەبەر وتەی: ﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَـنِ﴾، چونکە خوا و پێغەمبەری (ﷺ) بە درۆ خستۆتەوە و ئەمەش کوفرە، ئەمە ڕووی باسکردنی ئەم ئایەتەیە لەم بابە[١].

**٢-** هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوە بوو کافرانی قورەیش ئینکاری ناوی (الرحمن) یان دەکرد.

---

[١] القول المفيد.

**٣-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە ئیمان هێنان بە ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە لە تەوحیدە و مەزهەبی ئەهلی سوننەیە.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئیمان هێنان بە ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعەیە لە هاوەڵان و تابعییەکان و شوین کەوتووەکانیان هەتا ڕۆژی قیامەت، ئەهلی سوننە ئیمانیان بە ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە هەیە کە لە خۆی ناوە یان ئەوانەی پێغەمبەر (ﷺ) باسی کردوە ئیمانیان پێی هەیە بێ (تحريف و تعطيل و تكييف و تمثيل)، ئەهلی سوننە جێگیری دەکەن و ئیمانیان پێی هەیە و ماناکەی جێگیر دەکەن، بەڵام چۆنییەتی یەکەی کەس نازانێت ئیلا خوا نەبێت.

سەبارەت بە گروپە گومڕاکان جەهمی و موعتەزیلە و ئەشاعرە و هاوشێوەکانیان ئینکاری ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە دەکەن، لەوانەیە هەیە ئینکاری ناو و سیفەتەکان دەکات ئەمە مەزهەبی جەهمی یەکانە، لەبەر ئەوە زۆر لە زانایانی ئەهلی سوننە دەڵێن کافرن، ابن القيم ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە ( النونيه) دا دەفەرموویێت:

ولقد كفر كفرهم خمسون في عشر من العلماء في البلدان

واتە: پێنج سەد زانای ئەم ئومەتە جەهمی یەکانیان کافر کردووە، چونکە ئینکاری ناو و سیفەت دەکەن، موعتەزیلە ناوەکان بۆ خوای گەورە جێگیر دەکەن بەڵام ئینکاری ماناکەی دەکەن، ناویان بۆ جێگیر کردووە بە ڕووتی، هیچ مانای نییە.

ئەشاعرەکان هەندێک ناو و سیفەت بۆ خوای گەورە جێگیر دەکەن، ئینکاری زۆر لە سیفەتەکان دەکەن، حەوت سیفەت بۆ خوای گەورە جێگیر دەکەن و هەندێکی تریان

چوارده سیفەت جێگیر دەکەن و سیفەتەکانی تر ئینکاری دەکەن، هەموو ئەمانە دەستەی گومڕان و لە گومڕاییدا لێک جیاوازن)[١].

**٤-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ سەیری حاڵی موشریکەکان، چونکە ئەوان ئینکاری ناوی (الرحمان)یان دەکرد، ئەوەی نەفس و دڵی بەندە پێی خۆش بێت ڕەحمی خوای گەورەیە.

---

[١] إعانة المستفيد (١٩٥/٢).

**وفي صحيح البخاري قال علي: (حدثوا الناس بما يعرفون، أتريدون أن يكذب الله ورسوله؟)**[1].

واته: عەلی خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: (فەرموودە بۆ خەڵک باس بکەن کە لێی تێبگەن و عەقڵیان تەحەمول بکات، ئایا دەتانەوێت سەرەنجام وا لەو خەڵکە بکەن کە وتەی خوا و پێغەمبەرەکەی بە درۆ بخەنەوە).

### ڕاڤەی وشەکانی ئەثەرەکە:

**(حدثوا الناس بما يعرفون):** واتە: فەرموودە بۆ خەڵک باس بکەن کە لێی تێبگەن و عەقڵیان تەحەمول بکات.

**(أتريدون أن يكذب الله ورسوله؟):** واتە: ئایا دەتانەوێت سەرەنجام وا لەو خەڵکە بکەن کە وتەی خوا و پێغەمبەرەکەی بە درۆ بخەنەوە.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئەثەرە لەم بابە:

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (مناسبەی ئەم ئەثەرە لە بابی سیفەتەکان: مناسبەی دیارە، چونکە هەندێک سیفەت هەن خەڵکی عەوام تەحەمولی ناکەن و تێناگەن ئەگەر پێیان بڵێی ئاثەواری خراپ بەسەریاندا دێت، وەک: فەرموودەی هاتنە خوارەوە بۆ ئاسمانەکانی دونیا لەگەڵ جێگیرکردنی بەرزی، ئەگەر بە کەسی عەوام بڵێیت دێتە ئاسمانی دونیا و لەگەڵ ئەوەش لەسەر عەرشە ئەو وا تێدەگات ئەگەر بێتە ئاسمانی

---

[1] أخرجه البخاري (١٢٧).

دونیا ئەوا ئاسمان بەسەریەوە دەبێت و عەرش چۆل دەبێت، ئەو کاتە دەبێت ئەوە ڕوون بکرێتەوە کە خوای گەورە دێتە ئاسمانی دونیا وەک دابەزینی دروستکراوەکان نیە)[١].

**سوودەکانی ئەثەرەکە:**

**١-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە لەسەر حیکمەت لە بانگەوازی کردن، دەبێت بانگخواز سەیری عەقڵی خەڵک بکات و بۆ هەر کەسێک پلەیەک دابنێت[٢].

**٢-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە فێرکردنی خەڵک دەبێت هەنگاو و بە هەنگاو بێت، لە شتی بچووک دەست پێ دەکەیت پاشان نقل دەبیت بۆ شتی گەورە، ئەمە ڕێگای ڕاستە بۆ فێرکردن، سەبارەت بەوەی لە بابەتە گەورەکان دەست پێ بکەیت بۆ کەسێک کە لە قۆناغی سەرەتا دا بێت، ئەمە هەڵەیە لە فێرکردن[٣].

---

[١] القول المفيد.

[٢] القول المفيد.

[٣] إعانة المستفيد (٢/١٩٩-٢٠٠).

**وروى عبد الرزاق عن معمر عن ابن طاوس عن أبيه عن ابن عباس: أنه رأى رجلا انتفض ـ لما سمع حديثا عن النبي (ﷺ) في الصفات، استنكارا لذلك ـ فقال: (ما فرق هؤلاء؟ يجدون رقة عند محكمه، ويهلكون عند متشابهه) انتهى.**

واته: ابن عباس خوا لێی ڕازی بێت پیاوێکی بینی کاتێ گوێ بیستی فەرموودەیەکی پێغەمبەر بوو (ﷺ) لەبارەی سیفەتەکانی خواوە، ئەو پیاوە کەوتە لەرزین و ڕاپەڕی (وەک ئەوەی ئینکاری لێ بکات و بە ناشەرعی بزانێت).

ابن عباس گوتی: بۆچی ئەوانە دەترسن کاتێک باسی ئەو سیفەتانەی خوا دەکرێت کە ماناکانیان لا ڕوونە، نەرم دەنوێنن و باوەڕی پێ دەکەن، ئەو سیفەتانەش کە چۆنیەتییەکەی لایان ڕوون نییە و عەقلیان قبول ناکات، بە هیلاک دەچن).

**ولما سمعت قريش رسول الله (ﷺ) يذكر: (الرحمن) أنكروا ذلك. فأنزل الله فيهم:** ﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَـٰنِ﴾.

واته: کاتێک قورەیش گوێ بیستی پێغەمبەری خوا بوون (ﷺ) کە ناوی (الرحمان)ی دەهێنا ئینکاریان لێکرد، خواش لەبارەی ئەوانەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَـٰنِ﴾.

**ڕاڤەی وشەکانی ئەثەرەکە:**

**(انتفض):** واته: لاشەی لەرزی.

**(رقة):** واته: نەرمی نواندن و قبوڵ کردن.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئەثەرە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە ئینکاری کردنی ناوەکانی خوای گەورە کوفرە.

**سوودەکانی ئەثەرەکە:**

**١-** ئەهلی خراپە شوێن متشابهەکان و دەکەون واز لە موحکەمەکان دەهێنن[١].

**٢-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە واجبە ئینکاری خراپە بکرێت، چونکە ابن عباس خوای لێی ڕازی بێت ئینکاری ئەو پیاوەی کرد[٢].

---

[١] إعانة المستفيد (٢/٢٠٠).

[٢] إعانة المستفيد (٢/٢٠٠).

## باب قول الله تعالى:

﴿يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ اللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكْثَرُهُمُ الْكَافِرُونَ﴾ {النحل: ٨٣}.

**قال مجاهد ما معناه: هو قول الرجل: هذا مالي، ورثته عن آبائي.**

**وقال عون بن عبد الله: يقولون: لولا فلان لم يكن كذا.**

**وقال ابن قتيبة: يقولون: هذا بشفاعة آلهتنا[1].**

**وقال أبو العباس – بعد حديث زيد بن خالد الذي فيه: (إن الله تعالى قال: أصبح من عبادي مؤمن بي وكافر.. ) الحديث، وقد تقدم ـ وهذا كثير في الكتاب والسنة، يذم سبحانه من يضيف إنعامه إلى غيره، ويشرك به[2].**

**قال بعض السلف: هو كقولهم: كانت الريح طيبة، والملاح حاذقا، ونحو ذلك مما هو جار على ألسنة كثير.**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير معرفة النعمة وإنكارها.

**الثانية:** معرفة أن هذا جار على ألسنة كثير.

**الثالثة:** تسمية هذا الكلام إنكارا للنعمة.

**الرابعة:** اجتماع الضدين في القلب.

---

[1] ابن الجوزى فى "زاد المسير"(٣/٣٥٧).

[2] مجموع الفتاوى (٤/٤٧٩).

## باب قول الله تعالى:
## ﴿يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ اللهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكْثَرُهُمُ الْكَافِرُونَ﴾ {النحل: ٨٣}.
## (باسی ئەوەی کە نابێت نیعمەتەکان بدرێتە پاڵ بێجگە لەخوا).

خوای گەورە دەفەرموویێت: (دان دەنێن بە نیعمەتەکانی خوا، واتە دەزانن هەموو نیعمەتەکان لە لایەن خواوەیە و پاشان ئینکاری لێ دەکەن یان لەبیری خۆیان دەبەنەوە و زۆربەشیان کافرن).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت:(هەر کەسێک نیعمەتی خوا بداتە پاڵ کەسێکی تر ئەوا ئەو کەسەی کردۆتە شەریک لەگەڵ خوا لە پەروەردگارییەتیدا، چونکە نیعمەتی داوەتە پاڵ هۆکار کە فاعل بێت ئەمە لە ڕووەک، لە ڕوویێکی تر هەڵ نەستاوە بە سوپاس کردنی خوای گەورە کە عیبادەتێکە لە عیبادەتەکان، تەرک کردنی سوپاسی خوای گەورە نەفی تەوحید دەکات، چونکە واجبە سوپاسی خوای گەورە بکەیت، کەواتە پەیوەندی بە تەوحیدی پەروەردگارییەتی و تەوحیدی بەندایەتی کردنەوە هەیە، لەڕووی ئەوەوە کە نیعمەت بدەیتە پاڵ هۆکارەوە کە بکەرە ئەمە درزە "خەلەلە" لە تەوحیدی پەروەردگارییەتی دا، لەڕووی تەرک کردنی سوپاسی خوای گەورە کردن کە عیبادەتە ئەوە خەلەلە لە تەوحیدی بەندایەتی کردن دا)[1].

صالح آل الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (واجبە لەسەر بەندە بزانێت هەموو نیعمەتێک لە خواوەیە و تەواوی تەوحید نایێتەدی مەگەر بەوە نەبێت کە هەموو نیعمەتێک بدەیتە پاڵ خوا، هەروەها نیعمەت دانە پاڵ بێجگە لەخوا تەواوی تەوحید کەم دەکاتەوە و جۆرێکە لە جۆرەکانی شیرک.

[1] القول المفيد (٣٧٦/٢).

لەبەر ئەوە ئەم بابەی لە کتاب التوحید باسکردووە)[١].

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿**يَعْرِفُونَ**﴾: واتە: دان دەنێن بە نیعمەتەکانی خوا.

﴿**ثم ينكرونها**﴾: واتە: پاشان ئینکارییان دەکرد، واتە دەیان دایە پاڵ بێجگە لەخوا.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

**قەرعاوی** دەفەرموویێت: (ئایەتەکە بەڵگەیە هەر کەسێک نیعمەت بداتە پاڵ بێجگە لەخوا تووشی کوفر بووە)[٢].

### سوودەکانی ئایەتەکە:

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە کافرەکان دان بە تەوحیدی پەروەردگارییەتی دا دەنێن، بەڵام لە تەوحیدی بەندایەتی کردن دا تووشی شیرک بوون.

محمد الامین الشنقیطی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (کافرەکان نیعمەتەکانی خوای گەورە دەناسنەوە و دانی پێ دەنێن، چونکە دەزانن خوای گەورە ڕزق و ڕۆزییان دەدات و کارەکانیان بۆ بەڕێوە دەبات، پاشان ئینکاری ئەم نیعمەتە دەکەن و کەسانی تر دەپەرستن لەگەڵ خوا)[٣].

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە نیعمەت دانە پاڵ بێجگە لەخوا کوفرە.

---

[١] التمهید لاپەڕە ٤٢٤.
[٢] الجدید لاپەڕە ٣٩٥.
[٣] اضواء البیان (٣/٢٤٦).

صالح الفوزان خوا بيپارێزێت دەفەرمووێت: (نیعمەت دانە پاڵ بێجگە لەخوا کوفره)[١].

**٣-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە هەموویان کافر نین لەسەر وتەی هەندێک لە زانایان، چونکە دەفەرمووێت: ﴿وَأَكۡثَرُهُمُ الۡكَافِرُونَ﴾.

ڕازی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (بۆچی ئایەتەکە دەفەرمووێت: ﴿وَأَكۡثَرُهُمُ الۡكَافِرُونَ﴾، لەگەڵ ئەوەی هەموویان کافرن؟

وەڵام لە چەند ڕوویەکەوەیە:

یەکەم: لەم ئایەتە فەرموویەتی: ﴿وَأَكۡثَرُهُمُ﴾، چونکە زۆریان حوجەیان لەسەر هەڵنەستاوە و نەگەیشتوون بە حەددی تەکلیف، یان عەقڵیان تەواو نیە، لەم حاڵەتە مەبەستی بە زۆرینە کەسانی بالغ بوو و تەواوە.

دووەم: مەبەست لە کافرەکان ئەو کافرانەن کە عینادن و ئینکاری دەکەن، لەم کاتە دەگوترێ فەرموویەتی: ﴿وَأَكۡثَرُهُمُ﴾، چونکە هەیە لەنێوانیان دا عیناد نییە و ئینکاری ناکات، بەڵکو نەزانە بە ڕاستگۆیی پێغەمبەر درووود و سەلامی خوای لێ بێت،

سێیەم: لەم ئاتەیە ﴿وَأَكۡثَرُهُمُ﴾، زۆرینەی باسکردوە بەڵام مەبەست پێی هەمووە، کەواتە هەموویان کافرن)[٢].

---

[١] إعانة المستفيد (٢/٢١٠).

[٢] التفسير الكبير.

ابن الجوزی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (مانای وتەی: ﴿وَأَكْثَرُهُمُ الْكَافِرُونَ﴾، حەسەن دەفەرمووێت: هەموویان كافرن، زۆرینە باسكراوە مەبەست پێی هەمووە)[1].

**٤-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە نیعمەت دانە پاڵ خوا لە ئیمانە[2].

---

[1] زاد المسير(٣٦٥/٤).

[2] إعانة المستفيد (٢/٢١٠).

**قال مجاهد ما معناه: هو قول الرجل: هذا مالي، ورثته عن آبائي.**

واته: موجاهد دەفەرموویێت: ئەو ئایەتە ئەوە دەگرێتەوە کە پیاوێک بڵێت: (ئەمە ماڵ و موڵکی خۆمە و لە باب و باپیرانەوە بۆم ماوەتەوە)

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەوەی دیار بێت گوتنی ئەم وشەیە هیچی تێدا نیە ئەگەر یەکێک پێت بڵێت: ئەم خانووەت لەکوێ بەدەست کەوتووە؟ تۆش بڵێیت: لە باب و باپیرانمەوە بۆم ماوەتەوە، ئەمە هیچی تێدا نییە چونکە تەنها هەواڵە.

بەڵام مەبەستی موجاهد ئەوەیە موڵک بدەیتە پاڵ هۆکارەوە کە بە میرات گرتنە.

لەبەر ئەوە ئەگەر تەنها خەبەر بێت بەڕووتی هیچی تێدا نیە، لەبەر ئەوە فەرموودە جێگیر بووە کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی گوترا: (اتنزل فی دارك غدا؟ فقال: وهل ترك لنا عقيل من دار او رباع)، ڕوونی کردەوە ئەم خانووانە نقل بووە بە میرات بۆ عقیل و ڕوونی کردەوە جیاوازی هەیە لە نێوان نیعمەت دانە پاڵ مرۆڤ وەک خەبەر و نیعمەت دانە پاڵ هۆکارێک کە خوای گەورە ئەم هۆکارەی داناوە و ئەو نیعمەتەی لەگەڵ کردوە)[1].

**وقال عون بن عبد الله: يقولون: لولا فلان لم يكن كذا.**

واته: عەون بن عبدالله دەفەرموویێت: ئەگەر فڵان نەبوایا ئاوا دەبوو.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت: ئەم وتەیە تەفسیلی تێدایە، ئەگەر مەبەست پێی تەنها خەبەر بێت ئەوا هیچی تێدا نیە، ئەگەر مەبەست پێی هۆکار بێت ئەوا سێ ئیحتیمالی هەیە:

---

[1] القول المفيد (٣٧٧/٢).

یەکەم: هۆکارێکی شاراوەیە و کاریگەری نیە، وەک ئەوەی بڵێت: ئەگەر فڵانە وەلی نەبوایا فڵانە شت بە دەست نەدەهات ئەمە شیرکی گەورەیە، چونکە باوەڕی وایە ئەم وەلی یە تصرف لە کەون دا دەکات کەچی مردووشە، ئەمە تصرفی نهێنی یە.

دووەم: دەیداتە پاڵ هۆکارێک کە جێگیر بووە بە شەرع یان بەرجەستەیە، ئەمە دروستە ئەگەر باوەڕی وا نەبێت خودی هۆکارەکە کاریگەری هەیە و خوای گەورە لەبیر بکات کە ئەوە نیعمەتی لەگەڵ کردوە.

سێیەم: دەیداتە پاڵ هۆکارێکی دیار بەڵام ئەم هۆکارە جێگیر نەبووە بە شەرع و بەرجەستە، ئەمە جۆرێکە لە جۆرەکانی شیرکی بچووک، وەک: دەزو و ملوانکە لە مل کردن بۆ ئەوەی ڕێگری لە چاوەزار بکات)[١].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەمە دروست نیە، چونکە نیعمەت دانە پاڵ بێجگە لە خوای تێدایە، ئەوەی دروست بێت و پێغەمبەر (ﷺ) ڕێنموویی ئێمەی کردبێت ئەوەیە بڵێین: لو لا الله، ثم فلان، چونکە تۆ نیعمەتت داوەتە پاڵ خوا و باست کردووە کە فلانە کەس تەنها هۆکارە، چونکە (ثم) للترتيب و التعقيب)[٢].

**وقال ابن قتيبة: يقولون: هذا بشفاعة آلهتنا**[٣].

واتە: ابن قوتەیبە دەفەرمووێت: ئەو ئایەتە ئەوە دەگریتەوە کە کافرەکان دەڵێن: ئەم نیعمەتەی کە خوا پێمانی داوە بەهۆی تکا و ڕەجای پەرستراوەکانی خۆمانەوە پێمان دراوە.

---

[١] القول المفيد (٣٧٨/٢-٣٧٩).

[٢] إعانة المستفيد (٢٠٥/٢).

[٣] ابن الجوزى فى "زاد اللسير"(٣٥٧/٣).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (ئەمە پووچ ترە لەوەی پێشووتر، چونکە دوو قەدەغە کراوی تێدایە: (١) شیرک بەم پەیکەرانە. (٢) جێگیر کردنی هۆکاری نادروست)[١].

**وقال أبو العباس – بعد حديث زيد بن خالد الذي فيه: (إن الله تعالى قال: أصبح من عبادي مؤمن بي وكافر... ) الحديث، وقد تقدم ـ وهذا كثير في الكتاب والسنة، يذم سبحانه من يضيف إنعامه إلى غيره، ويشرك به. مجموع الفتاوى (٤٧٩/٤).**

واتە: ابن تیمیه دوای فەرموودەی خالد بن زەید کە پێشتر لە بابی (٢٩) دا هاتووە دەڵێت: خوای گەورە دەفەرمووێت: (أصبح من عبادي مؤمن بي وكافر)، دەڵێت: ( ئەمە لە قورئان و سوننەت زۆر هاتووە خوا زەمی ئەو کەسانە دەکات کە نیعمەتەکانی خوا دەدەنە پاڵ بێجگە لەخوا، دەیان کەن بە شەریکی خوا لە نیعمەتەکانیدا).

**قال بعض السلف: هو كقولهم: كانت الريح طيبة، والملاح حاذقا، ونحو ذلك مما هو جار على ألسنة كثير.**

واتە: هەندێک لە پێشینەکان گوتوویانە: ئەمە وەک ئەوە وایە کە دەڵێت: هەوایەکە(واتە:با) نەرم بوو، دەریاوانەکەش زیرەک بوو، بۆیە ڕزگارمان بوو، چەندین وتەی تر کە بەسەر زمانی زۆرێک لە خەڵکیدا دێن.

قەرعاوی دەفەرمووێت: (ابن تیمیه وای دەبینێت هەر کەسێک نیعمەت بداتە پاڵ بێجگە لەخوا کوفرە، یان شەریکی بۆ خوا بڕیار داوە)[٢].

---

[١] القول المفيد (٣٨٠/٢).

[٢] الجديد لاپەرە ٣٦٢.

## باب قول الله تعالى:

## ﴿فَلاَ تَجْعَلُواْ لِلّهِ أَندَاداً وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ {البقرة:٢٢}.

**قال ابن عباس في الآية: الأنداد: هو الشرك أخفى من دبيب النمل على صفاة سوداء في ظلمة الليل؛ وهو أن تقول: والله، وحياتك يا فلان وحياتي، وتقول: لولا كليبة هذا لأتانا اللصوص، ولولا البط في الدار لأتانا اللصوص، وقول الرجل لصاحبه: ما شاء الله وشئت، وقول الرجل: لولا الله وفلان. لا تجعل فيها فلانا هذا كله به شرك)[(١)].**

**وعن عمر بن الخطاب رضي الله عنه: أن رسول الله (ﷺ) قال: (من حلف بغير الله فقد كفر أو أشرك) رواه الترمذي وحسنه، وصححه الحاكم[(٢)].**

**وقال ابن مسعود: لأن أحلف بالله كاذبا أحب إلي من أن أحلف بغيره صادقا[(٣)].**

**وعن حذيفة رضي الله عنه، عن النبي (ﷺ) قال: (لا تقولوا: ما شاء الله وشاء فلان، ولكن قولوا: ما شاء الله ثم شاء فلان)[(٤)].**

---

[(١)] رواه ابن أبي حاتم.أخرجه ابن أبي حاتم (٦٢/١ رقم ٢٢٩).

[(٢)] أخرجه الترمذي (١٥٣٥)، والحاكم(١٨/١) و (٢٩٧/٤)، وأحمد (٩٢/٢ رقم ٥٣٧٥)، وأبو داود (٣٢٥١) من
حديث عبدالله بن عمر, وفي الموضع الأول عند أحمد جعله عن عمررضي الله عنهما.

[(٣)] أخرجه عبد الرزاق في (المصنف) (٤٦٩/٨ رقم ١٥٩٢٩)، وابن أبي شيبة (٧٩/٣ رقم١٢٢٨١)، والطبراني في (الكبير) (١٨٣/٩ رقم ٨٩٠٢).

[(٤)] رواه أبو داود بسند صحيح. أخرجه أبو داود (٤٩٨٠)، وأحمد (٣٨٤/٥ رقم ٢٣٢٦٥).

**وجاء عن إبراهيم النخعي، أنه يكره أن يقول: أعوذ بالله وبك، ويجوز أن يقول: بالله ثم بك. قال: ويقول: لولا الله ثم فلان، ولا تقولوا: لولا الله وفلان**[1].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير آية البقرة في الأنداد.

**الثانية:** أن الصحابة رضي الله عنهم يفسرون الآية النازلة في الشرك الأكبر بأنها تعم الأصغر.

**الثالثة:** أن الحلف بغير الله شرك.

**الرابعة:** أنه إذا حلف بغير الله صادقا، فهو أكبر من اليمين الغموس.

**الخامسة:** الفرق بين الواو وثم في اللفظ.

---

[1] أخرجه ابن أبى الدنيا فى كتاب (الصمت) (٣٤٤).

## باب قول الله تعالى:

## ﴿فَلاَ تَجْعَلُواْ لِلّهِ أَندَاداً وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ {البقرة:٢٢}.

واته: جا کەواتە هاوتا بۆ خوا دامەنێن لە پەرستنەکانتاندا، لە حاڵێکدا ئێوەش دەزانن کە خوا هاوتای نیە.

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم بابە باسی هەندێک جۆری شیرک دەکات کە وتەن، واتە هەندێک وتە هەن گوتنیان شیرکە، (تندید) ماناکەی ئەوەیە بێجگە لەخوا بکەیتە هاوتا لەگەڵ خوا، هاوتا بەوە دەبێت نیعمەت بدەیتە پاڵ بێجگە لەخوا و بەوە دەبێت سوێند بە بێجگە لە خوا بخۆیت و بڵێیت: ئەگەر خوا ویستی و فلانە کەسیش ویستی، هەروەها وتەکانی تری وەک ئەمانە.ئەم بابە باسی ڕوون کردنەوەی هاوتا دەکات لە قسە کردن دا، هاوتا مەبەست پێی شیرکی بچووکە لە قسە کردن دا، نەک هاوتای تەواو بێت و شیرکی گەورە بێت)[(١)].

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿أَندَاداً﴾: واتە: هاوتا، نەکیرە هاتووە لە سیاقی نەهی هەموو جۆرەکانی شیرک دەگرێتەوە.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

ئەم ئایەتە بەڵگەیە دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە تاوەکو ئاماژە بۆ ئەوە بکات نابێت شیرک بۆ خوا بڕیار بدەیت، لەوانە شیرکی بچووک لە قسە کردن دا.

---

[(١)] التمهيد لاپەڕە (٤٣٠-٤٣١).

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە نابێت شەریک بۆ خوا بڕیار بدەیت، جا شیرکی گەورە بێت یان بچووک.

قەرعاوی دەفەرمووێت: ( ئایەتەکە بەڵگەیە واجبە خۆت بەدوور بگریت لە شیرکی دیار و شاراوە، شیرکی شاراوە وەک ئەوەیە بڵێیت: ئەگەر پاسەوان نەبوایا دز دەهاتە سەرمان)[1].

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە کە موشریکەکان دانیان بە تەوحیدی پەروەردگاریەتی دادەنا و دەیانزانی نابێت شەریک بۆ خوا دابنرێت لە بەندایەتی کردنیشدا، چونکە ئەگەر بڵێی ئەوان نەزان بوون بەوەی نابێت شیرک بۆ خوا بڕیار بدەی لە بەندایەتی کردن دا، ئەوا ئەوان عوزریان هەبووە بە نەزانین.

عبدالرحمن بن ناصر السعدی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (وتەی: ﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾، خوای گەورە شەریک و هاوتای نییە لە دروست کردن و ڕزق و بەڕێوە بردن و بەندایەتی کردن دا.

چۆن خوای تر دەپەرستن لەگەڵ ئەوەی ئێوە زانستتان هەیە؟ ئەمە سەیرترین شتە کە جێگای سەرسوڕمان بێت و ئەو پەڕی کەم عەقڵی و ساویلکەییە)[2].

---

[1] الجدید لاپەڕە (٢٦٤).

[2] تیسیر الکریم الرحمن (٢٠/١).

ابن الجوزى ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (وتەی: ﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾، شەش وتە هەیە:

١- واتە: ئێوە دەزانن خوای گەورە ئاسمانی دروسکردوە و بارانی باراندووە، واتە ئەو کردەوانە دەگرێتەوە کە لەم ئایەتە باسکراوە، ئەمە لە ابن عباس و قەتادە و موقاتل نەقل کراوە.

٢- ئێوە دەزانن لە کتابی ئێوەدا نییە تەورات و ئینجیل، هەروەها ئەمەش لە ابن عباس نەقل کراوە.

٣- ئێوە دەزانن خوای گەورە هیچ شەریکی نییە، ئەمە لە موجاهد نەقل کراوە.

٤- زانین لێرە بە مانای عەقڵ دێت ئەمە لە ابن قوتەیبە نەقل کراوە.

٥- ئێوە دەزانن کەس ناتوانێت ئەم کردەوانە بکات بێجگە لەخوا نەبێت، مامۆستای ئێمە عەلی بن عبیداللە باسی کردووە.

٦- ئێوە دەزانن ئەمە بەردە، گوێم لێ بووە لە باوکی محمد بن خشاب)[١].

**٣-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە تەوحید گەورەترین شتە فەرمانی پێ کرابێت، چونکە یەکەم بانگ کردنە لە قورئانی پیرۆز، بانگی مرۆڤ دەکات خوا بپەرستن و هیچ شەریکی بۆ بڕیار نەدەن.

---

[١] زاد المسير (٤٢/١).

**قال ابن عباس في الآية: الأنداد: هو الشرك أخفى من دبيب النمل على صفاة سوداء في ظلمة الليل؛ وهو أن تقول: والله، وحياتك يا فلان وحياتي، وتقول: لولا كلبة هذا لأتانا اللصوص، ولولا البط في الدار لأتانا اللصوص، وقول الرجل لصاحبه: ما شاء الله وشئت، وقول الرجل: لولا الله وفلان. لا تجعل فيها فلانا هذا كله به شرك) رواه ابن أبي حاتم.**

ابن عباس خوا لێی ڕازی بێت سەبارەت بەم ئایەتە دەفەرموویێت: الأنداد: هاوتا، شەریک بۆ دانانە، ئەوەش شاراوەترە لە تەپەی قاچی مێرووڵەیەک لەسەر بەردێکی سافی ڕەش لە شەوەزەنگدا، ئەوەش ئەم چوار نموونانە دەگرێتەوە، کە بڵێیت:

١- سوێند بەخوا و ژیانی تۆ ئەی فڵان، یان سوێند بە ژیانی خۆم.

٢- یان بڵێیت: ئەگەر سەگەکە نەبوایا دزەکان دەهاتنە سەرمان، ئەگەر مراوی یەکە لەم ماڵە نەبوایا، دزەکان دەهاتنە سەرمان.

٣- یان ئەوەش کە پیاوێک بە هاوەڵەکەی بڵێت: ئەگەر خوا ویستی و تۆش ویستت.

٤- یان وتەی پیاوێک کە دەڵێت: ئەگەر خوا و فڵان کەس نەبوونایە.

نەکەی ناوی فڵان بخەیتە ڕیزی ناوی خواوە، ئەمانە هەمووی شەریک دانانی پێوەیە.

**ڕاڤەی وشەکانی ئەثەرەکە:**

**(دبيب النمل):** واتە: تەپەی قاچی مێرووڵەیەک.

**(على صفاة سوداء):** واتە: لەسەر بەردێکی سافی ڕەش، ئەگەر بەردەکە سپی بوایا دیار دەبوو.

**(ظلمة الليل):** واتە: لە شەوەزەنگدا، واتە شەوێکی زۆر تاریک.

**(لولا كليبة):** واتە: ئەگەر سەگەکە نەبوایا، کلیبە بچووک کراوەوەی سەگە.

**(ولولا البط):** واتە: ئەگەر مراوی یەکە لەم ماڵەوە نەبوایا، چونکە مراوی دەنگ بەرز دەکاتەوە و خاوەنی ماڵ بەئاگادێنێت.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئەثەرە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئەثەرەی باسکردووە بۆ ئەوەی هەندێک لە جۆرەکانی شیرکی بچووک لە وتەدا ڕوون بکاتەوە.

**سوودەکانی ئەثەرەکە:**

**١-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە هەموو ئەم وتانەی ابن عباس باسی کردووە کە بەسەر زمانی خەڵکدا دێن شیرکن بەڵام شیرکی بچووکن، پێیان دەڵێن شیرک لە وتەدا، ئەگەر چی بەدڵ مەبەستی نەبێت، ئەمەیان لە هاوتا دانانە بۆ خوا[١].

**٢-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە پێشینەکان ئەو ئایەتانەی سەبارەت بە شیرکی گەورە دابەزیون دەیان کردنە بەڵگە بۆ شیرکی بچووک، ابن عباس ئەم ئایەتەی کردۆتە بەڵگە چونکە شیرکی بچووک مرۆڤ ڕادەکێشێت بۆ شیرکی گەورە[٢].

**٣-** ئەمە بەڵگەیە بۆ خۆ دورخستنەوە لە شیرک لە هەموو ڕوویەکەوە بە قسە و نییەت و کردەوە[٣].

---

[١] إعانة المستفيد (٢/٢٢٠).

[٢] إعانة المستفيد (٢/٢٢٠).

[٣] إعانة المستفيد (٢/٢٢٠).

**٤-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە سوێند خواردن بەم شێوەیە: (والله و حیاتك)، واتە: سوێند بەخوا و ژیانی تۆ ئەی فڵان، ئەمە شیرکە لە دوو ڕووەوە:

١- سوێندی خواردووە بە بێجگە لەخوا، سوێند خواردن بە بێجگە لەخوا شیرکە.

٢- کەسەکەی کردۆتە شەریک لەگەڵ خوا بە گوتنی پیتی ( الواو)، چونکە دەلالەت لەسەر یەکسانی دەکات جۆرێکە لە جۆرەکانی شیرک.

**٥-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە کە گوتنی: (ما شاء الله وشئت)، شیرکە، واتە: ئەگەر خوا

ویستی و تۆش ویستت، گوتنی: (ما شاء الله وشئت)، دوو حاڵەتی هەیە:

١- ئەگەر باوەڕی وابێت کەسەکە یەکسانە لەگەڵ خوا لە ویست و بەڕێوەبردندا، ئەوا شیرکی گەورەیە.

٢- ئەگەر ئەم بیروباوەڕەی نەبێت و باوەڕی وابێت خوای گەورە لە سەرووی هەموو شتێکە، ئەوا شیرکی بچووکە و گوتنی: ( لولا الله وفلان)یش هەمان شتە.

**وعن عمر بن الخطاب رضي الله عنه: أن رسول الله (ﷺ) قال: (من حلف بغير الله فقد كفر أو أشرك) رواه الترمذي وحسنه، وصححه الحاكم.**

واته: لە عومەری کوڕی خەتاب دەگێرنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێک سوێند بخوات بە بێجگە لە خوا ئەوا کوفری کردوە یان شەریکی بۆ خوا داناوە).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(عن عمر):** ئەوەی ڕاست بێت لە ابن عمر دەگێڕنەوە نەک عمر[١].

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە بۆ ئەوەی روونی بکاتەوە کە سوێند خواردن بە بێجگە لەخوا شیرکە.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە سوێند خواردن بە بێجگە لە خوا شیرکی بچووکە ئەگەر باوەڕی وابێت سوێند پێ خوراو یەکسانە لەگەڵ خوا لە بەگەورە دانان ئەوە شیرکی گەورەیە، ئەگەر نا سوێند خواردن بە بێجگە لە خوا شیرکی بچووکە[٢].

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (سوێند: تەئکید کردنەوەی قسەیە بە بەگەورە دانراوێک لەنێوان قسەکەر و کەسی بەرامبەر بە یەکێک لەم سێ پیتانەی سوێند خواردن:

---

[١] تیسیر العزیز الحمید لاپەڕە (٤٤٣-٤٤٦).

[٢] القول المفید (٢/٢١٤).

(الواو یان الباء یان التاء)، واجبه قسه تەئکید نەکرێتەوە ئیلا به خوا، چونکه بەگەورە دانراوی ڕاستەقینه تەنها خوایه، سەبارەت به مرۆڤ لەو بەگەورە دانراوانه نیه که سوێندی پێ بخورێت، بەڵێ هەندێک جار به گەورەی دابنێ که شیاوی بێت، سەبارەت به بەگەورە دانانێک که بگاته سنووری سوێند پێ خواردن ئەمه تەنها بۆ خوایه.

سوێند خواردنێکی تریش هەیه به بێجگه لەخوا ئەویش شیرکه، ئەویش ئەوەیه سوێند دەخوات به بێجگه لەخوا و هیچ مەبەستی له دڵدا نییه، وەک ئەوەی کەسێک بەردەوام سوێند خواردن به پێغەمبەر لەسەر زاریەتی، یان سوێند خواردن به کەعبه، یان ئەمانەت، یان وەلی، یان شتی تر، ئەمەیان مەبەستی حەقیقەتی سوێندی نیه بەڵکو لەسەر زاریەتی وەک لەغو، ئەمه شیرکه، چونکه بەگەورە دانانی بێجگه لەخوای تێدایه)[1].

**٢-** ئەم فەرموودەیه بەڵگەیه سوێند خواردن به بێجگه لەخوا حەرامه، هەموو زانایان یەک دەنگن لەسەر مەکروهی سوێند خواردن به بێجگه لەخوا، بەڵام جیاوازی له حەرامی دایه، دوو وته هەیه:

یەکەم: هەندێ زانا بۆ ئەوە چوون سوێند خواردن به بێجگه لەخوا مەکروهه نەک حەرامه، که ئەمه وتەی زۆرێک له شافعی یەکانه، هەروەها وتەی بەناوبانگی مالکی یەکانیشه، بەڵگە:

١- چەند فەرموودەی ڕوون و ئاشکرا هاتوون سوێندی خواردووه به مرۆڤ، لەوانه:

(أ) عن طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ قال: (جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ ثَائِرُ الرَّأْسِ نَسْمَعُ دَوِيَّ صَوْتِهِ وَلَا نَفْقَهُ مَا يَقُولُ حَتَّى دَنَا مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَإِذَا هُوَ يَسْأَلُ عَنِ الْإِسْلَامِ

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٤٣٢-٤٣٣).

فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ فَقَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُنَّ قَالَ: لَا إِلَّا أَنْ تَطَّوَّعَ وَصِيَامُ شَهْرِ رَمَضَانَ فَقَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ فَقَالَ: لَا إِلَّا أَنْ تَطَّوَّعَ وَذَكَرَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الزَّكَاةَ فَقَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا قَالَ: لَا إِلَّا أَنْ تَطَّوَّعَ قَالَ: فَأَدْبَرَ الرَّجُلُ وَهُوَ يَقُولُ: وَاللهِ! لَا أَزِيدُ عَلَى هَذَا وَلَا أَنْقُصُ مِنْهُ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): أَفْلَحَ وَأَبِيهِ إِنْ صَدَقَ أَوْ دَخَلَ الْجَنَّةَ وَأَبِيهِ إِنْ صَدَقَ[١].

(ب) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَيُّ الصَّدَقَةِ أَعْظَمُ أَجْرًا فَقَالَ: أَمَا وَأَبِيكَ لَتُنَبَّأَنَّهُ: أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ شَحِيحٌ تَخْشَى الْفَقْرَ وتَأْمُلُ الْبَقَاءَ وَلَا تُمْهِلَ حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ الْحُلْقُومَ قُلْتَ: لِفُلَانٍ كَذَا وَلِفُلَانٍ كَذَا وَقَدْ كَانَ لِفُلَانٍ[٢].

(ج) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: "قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! مَنْ أَحَقُّ بِحُسْنِ الصُّحْبَةِ قَالَ: أُمُّكَ ثُمَّ أُمُّكَ ثُمَّ أُمُّكَ ثُمَّ أَبُوكَ ثُمَّ أَدْنَاكَ أَدْنَاكَ[٣]. ثم ساق رواية بعدها، فيها زيادة: "فَقَالَ: نَعَمْ وَأَبِيكَ لَتُنَبَّأَنَّ.

(٢) خوای گەورە لە قورئان دا لە چەند شوێنێک سوێندی خواردووە بە دروستکراوەکان، ئەمە بەڵگەیە دروستە سوێند بە بێجگە لەخوا بخۆیت.

[١] رواه مسلم (١١).
[٢] رواه مسلم (١٠٣٢).
[٣] رواه مسلم (٢٥٤٨).

دووەم: هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون سوێند خواردن بە بێجگە لەخوا حەڕامە، کە ئەمە وتەی حەنەفی و ظاهری و حەنابلە و ابن تیمیه و ابن القیم وابن باز و ابن عثیمین و شێخ ئەلبانی یە، بەڵگە:

١- وەسف کردنی سوێند خواردن بە بێجگە لەخوا بە شیرک بەڵگەیە حەڕامە و لە تاوانە گەورەکانە، سەبارەت بە وتەی: (وَأَبِيهِ) و (وأَبِيكَ)، زانایان دەڵێن:

یەکەم: هەندێ زانا  بۆ ئەوە چوون ئەم دەقانە لاوازن، وتراوە ئەم دەقە محفوظ نیە، ڕیوایەت هاتووە فەرموودەی مالک و بێجگە لە مالک لە ڕێگای أبي سهيل باسی ئەمەی نەکردوە، وقد روي عن إسمعيل بن جعفر هذا الحديث وفيه: (أفلح والله إن صدق)، (أو دخل الجنة والله إن صدق)، ئەمە لەپێشترە لە ڕیوایەتی: (وأبيه)، ئەم دەقە مونکەرە و دەگەڕێندرێتەوە بۆ فەرموودەی ڕاست[1].

ئەلبانیش ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەم دەقانەی بەلاواز داناوە لە کتابی (السلسلة الضعيفة) (١٠/٧٥٠-٧٦٨).

دووەم: هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون ئەم فەرموودەیە منسوخە، سەرەتا سوێند خواردن بە بێجگە لە خوا ڕێگەپێدراو بوو، پاشان فەرموودە جێگیر بوو نەهی کرد لە سوێند خواردن بە  بە بێجگە لەخوا، پاڵ پشتیش بۆ ئەمە:

لە صحيح مسلم دا جێگیر بووە: (وكانت قريش تحلف بآبائها)، ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە سوێند خواردن بە باوک و باپیر لایان ناسراو بووە،

أ- وتەی: (وَأَبِيهِ)ش هەمان شتە.

[1] التمهيد (١٤/٣٦٧).

ب- وتەی: (ألا إن الله ينهاكم أن تحلفوا بابائكم).

ج- وتەی عمر: (فوالله ما حلفت بها منذ سمعت رسول الله (ﷺ) نهى عنها).

ابن بازيش ئەم وتەيەی ترجيح كردووە لە راڤەی بلوغ المرام.

سێیەم: ئەمە سوێند نەبوە، بەڵكو قسەی سەر زار بوە بێ ئەوەی هیچ مەبەستێكیان هەبێت، وەک ئەم وتانە: ويحك، وويلك، وثكلتك أمك، هيچ مەبەستيان نەبوو.

خطابی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: ( وتەی (أفلح وأبيه)، ئەم وشەيە وشەی سەر زار بو و زۆر بەركاريان دەهێنا بۆ بەرامبەر)[1].

ئيمام النووي ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: ( وتەی (أفلح وأبيه)، سوێند نيە، بەڵكو وتەيەكە عەرەب بەكاريان دەهێنا وەک عادەت و داخلی قسەكردنيان دەكرد بێ ئەوەی مەبەستی سوێنديان هەبێت، نەهی جێگير بووە بۆ ئەو كەسە كە مەبەستی سوێند خواردنی هەيە، چونكە بەگەورە دانانی سوێند پێ خوراوی تێدايە)[2].

چوارەم: هەندێک دەڵێن ئەمە تايبەت بوو بە پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵام ئەمە جێگای تێڕوانينە، چونكە تايبەت كردن بە پێغەمبەر پێويستی بە بەڵگەيە.

پێنجەم: هەندێ زانا دەڵێن ئەم دەقە حذفی مضافی تێدايە، تەقديرەكەی: (أَفْلَحَ وَرب أَبِيهِ إِنْ صَدَقَ)، بەڵام ئەمەش جێگای تێڕوانينە، چونكە ئەمە كێشە دروست دەكات ئەصڵ وايە حذف نيە و وتەكە لەسەر ڕووكەشی خۆيەتی، ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) ئەو مەبەستەی هەبوايا بە ڕوونی دەيگوت.

---

[1] معالم السنن (١٢١/١).
[2] شرح صحيح مسلم (١٦٨/١).

سەبارەت بەوەی خوای گەورە لە قورئان دا لە چەند شوێنێک سوێندی خواردوە بە دروستکراوەکان، ئەمە نابێتە بەڵگە دروست بێت سوێند بخۆیت بە بێجگە لەخوا، چونکە:

- ئەمە تایبەتە بەخوا، بەندە بۆی نییە شوێن خوای گەورە بکەوێت لەم سوێند خواردنە، خوای گەورە بە ئارەزووی خۆیەتی چ دەکات و حوکم بە چ دەدات و سوێند بە چی دەخوات.

میمون بن مهران دەفەرموویت: (خوای گەورە سوێند دەخوات بە هەر دروستکراوێکی خۆی بییەوێت، کەس بۆی نییە سوێند بخوات ئیلا بەخوا نەبێت)[١].

هەندێک دەڵێن ئەوەی لە قورئان باسکراوە حذف ی تێدایە، تەقدیرەکەی: (ورب الليل ورب النهار ورب الشمس)، بەڵام ئەم وەڵامە لاوازە لەبەر دوو شت:

أ- ئەصل وایە تەقدیر نیە.

ب- ئەگەر تەقدیر هاتەدی مەبەستی سوێندەکە فەراموش دەبێت.

ابن تيمية ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (دەقی ڕوون و ئاشکرا جێگیر بووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە نابێت سوێند بخۆیت بە هیچ یەکێک لە دروستکراوەکان، هیچ جیاوازی نییە لەنێوان فریشتە و پێغەمبەرەکان و پیاو چاکان و کەسانی تر)[٢].

ابن عبد البر ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (هەموو زانایان یەک دەنگن لەسەر ئەوەی سوێند خواردن بە بێجگە لەخوا مەکروهە و نەهی لێی کراوە)[٣].

---

[١] الاعلام (٢٦١/٩).
[٢] مجموع الفتاوى (٢١٩/١).
[٣] التمهيد (٣٦٧/١٤).

ابن تيمية ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (سەبارەت بە سوێند خواردن بە دروستکراوەکان، وەک: سوێند خواردن بە کەعبە یان گۆڕ یان نیعمەتی کاربەدەستان یان شمشێر یان بە جاهی دروستکراوەکان، نەم زانیوە جیاوازی هەبێت لەنێوان زانایان لەسەر مەکروهی ئەم سوێند خواردنانە و نەهیان لێی کراوە)[١].

ابن القیم ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (یەکێک لە تاوانە گەورەکان سوێند خواردنە بە بێجگە لەخوا، هەروەک پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (من حلف بغير الله، فقد أشرك))[٢].

[١] مجموع الفتاوى (٢٤٣/٣٥).

[٢] إعلام الموقعين (٥٧١/٦-٥٧٢).

**وقال ابن مسعود: لأن أحلف بالله كاذبا أحب إلي من أن أحلف بغيره صادقا.**

واتە: ابن مسعود خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: (ئەگەر سوێند بخۆم بە خوا بە درۆوە، لام باشترە یان خۆشەویستترە لەوەی سوێند بخۆم بە بێجگە لەخوا بە ڕاست).

**ڕاڤەی وشەكانی ئەثەرەكە:**

**(لأن أحلف بالله كاذبا):** واتە: ئەگەر سوێند بە درۆوە بە خواوە بخۆم.

**(أحب إلي من أن أحلف بغيره صادقا):** هەردووكیان لای ابن مسعود شتی خراپن و خۆشەویست نین، بەڵام مەبەستی ئەوەیە یەكێك گەورەترە و خراپترە لەوەی تر.

**هۆكاری باسكردنی ئەم ئەثەرە لەم بابە:**

دانەری كتاب لەبەر ئەوە ئەم ئەثەرەی باسكردوە بۆ ئەوەی ڕوونی بكاتەوە سوێند خواردن بە بێجگە لەخوا شیركە و لە تاوانە گەورەكانە.

**سوودەكانی ئەثەرەكە:**

**١-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە سوێند خواردن بە بێجگە لەخوا بە ڕاستگۆیی گەورەترە لە

سوێند خواردن بە خوا بە درۆ، چونكە سوێند خواردن بە بێجگە لەخوا شیركە، بەڵام سوێند خواردن بە خوا بە درۆ تاوانە.

**٢-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە شیركی بچووك گەورەترە لە تاوانی گەورە، چونكە سوێند خواردن بە بێجگە لەخوا شیركی بچووكە و سوێند خواردن بە خوا بە درۆ لە تاوانە گەورەكانە.

**٣-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە سویند خواردن بە بێجگە لەخوا حەڕامە، كە ئەمە وتەی ڕاستە.

**٤-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە سوێند خواردن بەخوا بە درۆ حەڕامە لە دوو ڕووەوە:

١- درۆی کردووە و درۆش حەڕامە.

٢- سوێند خواردن بەخوای تێدایە، سوێند بەگەورە دانانە بەڵام بە درۆ بە کەم دانانی خوای گەورەی تێدایە.

**٥-** ئەم ئەثەرە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە شیرکی بچووک لێ خۆش بوونی بۆ نیە لە ڕۆژی قیامەت دا ئەگەر تەوبەی نەکردبێت، بەڵکو دەبێت هەر سزا بدرێت ئینجا لە دۆزەخ دەردەهێنرێت.

**وعن حذيفة رضي الله عنه، عن النبي (ﷺ) قال: (لا تقولوا: ما شاء الله وشاء فلان، ولكن قولوا: ما شاء الله ثم شاء فلان) رواه أبو داود بسند صحيح.**

واتە: لە حوزەیفە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (مەڵێن خوا ویستی و فلان ویستی، بەڵكو بڵێن: خوا ویستی پاشان فڵان ویستی).

**ڕاڤەی وشەكانی فەرموودەكە:**

**(لا تقولوا):** واتە: مەڵێن، لا: ناهیە.

**(ما شاء الله وشاء فلان):** واتە: خوا ویستی و فڵان ویستی.

**هۆكاری باسكردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

لەبەر ئەوە باسكراوە بۆ ئەوەی حوكمی گوتنی: ما شاء الله وشاء فلان ڕوون بكاتەوە.

**سوودەكانی فەرموودەكە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە مرۆڤ ویستی هەیە و وەڵامە بۆ جەبری یەكان كە دەڵێن: مرۆڤ ویستی نیە و هەر كردەوەیەک كە دەیكات هیچی بە دەست نیە و ناچارە.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئەو كەسەی دەرگا لە خەڵک دادەخات بە حەڕام كردنی شتێک، دەبێت دەرگایەكی تر یان ڕێگای تریان بۆی باس بكات كە پێچەوانەی شەرع نەبێت و ڕێگەپێدراو بێت.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە گوتنی: (ما شاء الله وشاء فلان)، دروست نیە، ئەوەی دروست بێت بەم شێوەیە: **(**ما شاء الله ثم شاء فلان).

**وجاء عن إبراهيم النخعي، أنه يكره أن يقول: أعوذ بالله وبك، ويجوز أن يقول: بالله ثم بك، قال: ويقول: لولا الله ثم فلان، ولا تقولوا: لولا الله وفلان.**

واته: ئیبراهیمی نەخەعی بە مەکروهی زانیوە (واتە: بە حەڕامی زانیوە، چونکە پێشینەکان وشەی مەکروهیان بەکاردەهێنا بۆ حەڕام کە پیاوێک بڵێت: پەنا بەخوا و بە تۆ، وا بە دروستی زانیوە کە بڵێت: پەنا بەخوا پاشان بە تۆ، دەبێت بڵێیت: ئەگەر خوا پاشان فلان نەبوایە، وە نابێت بڵێیت: ئەگەر خوا و فلان نەبونایە.

**ڕاڤەی وشەکانی ئەثەرەکە:**

**(أنه يكره):** واتە: بە مەکروهی زانیوە.

**(أعوذ بالله وبك):** واتە: پەنا بەخوا و بە تۆ.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئەثەرە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئەثەرەی باسکردووە بۆ ئەوەی هەندێک جۆری شیرک لە وتەدا ڕوون بکاتەوە.

**سوودەکانی ئەثەرەکە:**

**١-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە گوتنی: (أعوذ بالله وبك)، دروست نییە، بەڵکو دەبێت بڵێیت: (أعوذ بالله ثم بك)، ئەمە لە تەواوی تەوحیدە، واجبە موسڵمان سوور بێت لەسەر تەواوی تەوحید و خۆ دورخستنەوە لە شیرک.

**٢-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە گوتنی: (لولا الله وفلان)، دروست نیە، بەڵکو دەبێت بڵێیت: (لولا الله ثم فلان).

## باب ما جاء فيمن لم يقنع بالحلف بالله

**عن ابن عمر رضي الله عنهما، أن رسول الله (ﷺ) قال: (لا تحلفوا بآبائكم، من حلف بالله فليصدق، ومن حلف له بالله فليرض. ومن لم يرض فليس من الله)، رواه ابن ماجه بسند حسن[1].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** النهي عن الحلف بالآباء.

**الثانية:** الأمر للمحلوف له بالله أن يرضى.

**الثالثة:** وعيد من لم يرض.

---

[1] أخرجه ابن ماجه (٢١٠١).

## باب ما جاء فیمن لم یقنع بالحلف بالله
## لەبارەی هەر کەسێکەوە کە قەناعەت نەکات بە سوێند خواردن بە الله لەکاتێکدا کە هەڕەشەیەکی لێکراوە

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (مناسبەی ئەم بابە لە کتابی تەوحید ئەوەیە قەناعەت کردن بە سوێند خواردن لە بە گەورە دانانی خوایە، چونکە ئەوەی سوێند بەخوا دەخوات تەئکید دەکاتەوە بە سوێند خواردن و بە گەورە دانانی سوێند پێ خوراو، کەواتە لەبەر گەورەیی سوێند پێ خوراو ئەو کەسە بەڕاست دادەنێیت کە سوێند دەخوات، کەواتە ڕازی نەبوون بە سوێند و بە کەم دانانی گەورەیی خوای تێدایە، ئەمەش نەفی تەواوی تەوحید دەکات.

قەناعەت کردن بە سوێند خواردن بەخوا لەم دوو شتە زیاتر نیە:

یەکەم: لەڕووی شەرعەوە واجبە ڕازی ببیت بە سوێند خواردن بە خوا ئەگەر ئاراستەی کەسی بەرامبەر کرا، واجبە ڕازی ببیت بەم سوێندە لە حوکمی شەرعی.

دووەم: لە ڕووی بەرجەستەوە، ئەگەر ئەو کەسەی سوێند دەخوات کەسێک بێت جێگای متمانە بێت و ڕاستگۆ بێت، ئەوا تۆ دەبێت ڕازی ببیت بەو سوێندە، ئەگەر ڕاستگۆ نەبێت و جیگای متمانە نەبێت ئەوا بۆت هەیە ڕازی بوون بە سوێندەکەی ڕەت بکەیتەوە، لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) بە موحەیسە و حوەیسەی گوت: (تبرئکم یهود بخمسین یمینا)، گوتیان: ئێمە چۆن ڕازی دەبین بە سوێندی جوولەکان ئەی نێردراوی خوا، پێغەمبەر (ﷺ) دانی بەمە نا).[1]

[1] القول المفید لاپەڕە (٢/٤٠٣).

عبدالله بن جار دەفەرمووێت: (قەناعەت نەکردن بە سوێند خواردن بەخوا و ڕازی نەبوون پێی نەفی تەواوی تەوحید دەکات، چونکە بە کەم دانانی خوای تێدایە)[1].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (کاتێک باسی ئەوە کرا بە گەورە دانانی خوا کە لە دڵی ئیمانداردا واجبە، ڕازی بوون بە وتەی خوای گەورە بە سوێند داواکراوە و فەرمان پێکراوە، هەر کەسێک قەناعەت نەکات بە سوێند خواردن بە خوا، ئەوا گەورەیی و خوا و شەرعی خوای لە دەست چووە.

واجبە قەناعەت بە کەسێک بکەیت ئەگەر سویندی بەخوا خوارد بۆت وەک بەگەورە دانانی خوای گەورە، هەروەک فەرموودە هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە خوا لێی رازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (عیسا پیاوێکی بینی دزی دەکرد و بە کەسەکەی گوت: تۆ دزی دەکەیت؟ کەسەکە گوتی: نەخێر سوێند بەو پەرستراوەی کە هیچ پەرستراوێکی بە حەق نیە جگە لە ئەو، عیسا گوتی: ئیمانم بەخوا هێناوە و چاوەکانم درۆی کرد)[2].

واجبە لەسەر بەندە ئەگەر کەسێک سوێندی بۆ خوارد بە خوا ڕازی بێت، چونکە ئەمە بەگەورە دانانی خوای تێدایە)[3].

---

[1] الجامع الفريد لاپەڕە (١٦٣)

[2] أخرجه البخاري (٣٤٤٤)، ومسلم (٢٣٦٨).

[3] التمهيد لاپەڕە (٤٣٦)

**عن ابن عمر رضي الله عنهما، أن رسول الله (ﷺ) قال: (لا تحلفوا بآبائكم، من حلف بالله فليصدق، ومن حلف له بالله فليرض. ومن لم يرض فليس من الله)، رواه ابن ماجه بسند حسن.**

واتە: لە ابن عمر دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (سوێند مەخۆن بە باوک و باپیرانتان، هەر کەس سوێندی خوارد بە خوا با ڕاستگۆ بێت، وە هەر کەس سوێندیان بۆ خوارد بەخوا با ڕازی بێت، هەر کەسیش ڕازی نەبێت بە سوێند خواردن بەخوا، ئەوە خوا لەو کەسە و کردەوەکەشی بەرییە).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(لا تحلفوا بآبائكم): واتە:** سوێند مەخۆن بە باوک و باپیرانتان، باوک و باپیر دەگرێتەوە بەرەو سەرەوە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە واجبە قەناعەت بکەیت بە سوێند خواردن بە خوا.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەرامە سوێند بخۆیت بە بێجگە لە خوا، لەبەر وتەی: (لا تحلفوا بآبائكم)[1].

---

[1] إعانة المستفيد (٢٢٩/٢).

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە ڕاستگۆ بیت لە سوێند خواردن و درۆ نەکەیت، چونکە ڕاستگۆیی لە سوێند خواردن بە گەورە دانانی خوایە و بەگەورە دانانی بەڵێنیەتی[1].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە قەناعەت بکەیت بە سوێند خواردن بە خوا.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (سەبارەت بەو کەسەی کە سوێندی بۆ خوراوە، ئایا واجبە کەسی بەرامبەر بە ڕاست دابنێت؟ ئەم بابەتە لەم پێنج حاڵەتە زیاتر نیە:

یەکەم: دەزانێت درۆ دەکات، کەس نەی گوتووە دەبێت بەڕاستی دابنێی.

دووەم: بەزۆری بۆ ئەوە دەچێت درۆ دەکات، ئەمەش بەهەمان شێوە واجب نییە بە ڕاستی دابنێی.

سێیەم: نیوە گومانی بۆ ئەوە دەچێت ڕاست دەکات وە نیوەی تر بۆ ئەوە دەچێت درۆ دەکات، ئەمەیان واجبە بە ڕاستی دابنێیت.

چوارەم: بەزۆری بۆ ئەوە دەچێت ڕاست دەکات، ئەمەیان واجبە بە ڕاستی دابنێیت.

پێنجەم: دەزانێت ڕاستگۆیە و ڕاست دەکات، ئەمەیان واجبە بە ڕاستی دابنێیت)[2].

---

[1] إعانة المستفيد (٢/٢٢٩).

[2] القول المفيد (٢/٤٠٦-٤٠٧).

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە قەناعەت بکەیت بە سوێند خواردن بە خوا، وە حەرامە قەناعەتت نەبێت بە سویند خواردن بە خوا، چونکە ئەمە لە بە گەورە دانانی خوایە و متمانە کردنە بە سوێند خواردن پێی)[1].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک قەناعەت نەکات بە سوێند خواردن بە خوا ئەوا تووشی تاوانێکی گەورە بووە، چونکە دەفەرموویێت: (ليس من الله).

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (هەر کەسێک ڕازی نەبێت بە سوێند خواردن بەخوا، دەفەرموویێت: (فليس من الله)، بەڵگەیە ئەم کردەوەیە لە تاوانە گەورەکانە)[2].

---

[1] إعانة المستفيد (٢/٢٢٩).

[2] التمهيد لاپەڕە (٤٣٨).

## باب قول: ما شاء الله وشئت

**عن قتيلة، أن يهوديا أتى النبي صلى الله عليه وسلم فقال: إنكم تشركون، تقولون ما شاء الله وشئت، وتقولون: والكعبة، فأمرهم النبي (ﷺ) إذا أرادوا أن يحلفوا أن يقولوا: (ورب الكعبة، وأن يقولوا: ما شاء ثم شئت) رواه النسائي وصححه[1].**

**وله أيضا عن ابن عباس رضي الله عنهما: أن رجلا قال للنبي (ﷺ): ما شاء الله وشئت، فقال: (أجعلتني لله ندا؟ ما شاء الله وحده)[2].**

**ولابن ماجه عن الطفيل أخي عائشة لأمها قال: رأيت كأني أتيت على نفر من اليهود، فقلت: إنكم لأنتم القوم، لولا أنكم تقولون: عزير ابن الله. قالوا: وإنكم لأنتم القوم لولا أنكم تقولون: ما شاء الله وشاء محمد. ثم مررت بنفر من النصارى فقلت: إنكم لأنتم القوم، لولا أنكم تقولون: المسيح ابن الله، قالوا: وإنكم لأنتم القوم، لولا أنكم تقولون: ما شاء الله وشاء محمد. فلما أصبحت أخبرت بها من أخبرت، ثم أتيت النبي (ﷺ) فأخبرته. قال: (هل أخبرت بها أحدا؟) قلت: نعم. قال: فحمد الله وأثنى عليه، ثم قال: (أما بعد؛ فإن طفيلا رأى رؤيا، أخبر بها من أخبر منكم، وإنكم قلتم كلمة كان يمنعني كذا وكذا أن أنهاكم عنها. فلا تقولوا: ما شاء الله وشاء محمد، ولكن قولوا: ما شاء الله وحده)[3].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** معرفة اليهود بالشرك الأصغر.

**الثانية:** فهم الإنسان إذا كان له هوى.

---

[1] أخرجه النسائي في "الكبرى" (٢٤٥/٦ رقم ١٠٨٢٥).

[2] أخرجه النسائي في "الكبرى" (٢٤٥/٦ رقم ١٠٨٢٢).

[3] أخرجه ابن ماجه (٢١١٨).

**الثالثة:** قوله (ﷺ): (أجعلتني لله ندا؟) فكيف بمن قال: يا أكرم الخلق ما لي من ألوذ به سواك .... والبيتين بعده.

**الرابعة:** أن هذا ليس من الشرك الأكبر، لقوله (يمنعني كذا وكذا).

**الخامسة:** أن الرؤيا الصالحة من أقسام الوحي.السادسة: أنها قد تكون سببا لشرع بعض الأحكام.

## باب قول: ما شاء الله وشئت
## باسكردنی گوتنی: خوا بییەوێت و تۆش بتەوێت.

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (دانەری کتاب دەیەوێت حوکمی وتەی: (ما شاء الله وشئت) روون بکاتەوە، چونکە دەبێت بڵێیت: پاشان فلانە کەس، ئەمە داواکراوی تەوحید و ئیخلاسە و تەواوی تەوحید و دوور کەوتنەوە لە شیرکی تێدایە، حوکمی ئەمە دروست نیە)[1].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەم بابەتە پێشتر قسەمان لەسەر کرد: (باب قول الله تعالى: ﴿فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ٢٢﴾ [البقرة: ٢٢]، وتەی: (ما شاء الله وشئت)، شیرکە لە وتەدا و شیرکە لە ویستندا، ئەمە شیرکی بچووکە)[2].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (وتەی: (ما شاء الله وشئت)، شیرکی بچووکە یان شیرکی گەورەیە، چونکە ئەگەر باوەڕی وابێت معطوف یەکسان بێت بە خوا ئەوا شیرکی گەورەیە، ئەگەر باوەڕیشی وابێت یەکسان نیە لەگەڵ خوا و لە ژێرەوەیەتی ئەوا شیرکە لە وتەدا و شیرکی بچووکە، هەندێک لە ئەهلی علم دەڵێن: ضوابطی شیرکی بچووک ئەوەیە هەر شتێک هۆکار بێت بۆ شیرکی گەورە ئەوا شیرکی بچووکە)[3].

---

[1] التعليق المفيد لاپەڕە (٢١٥).

[2] التمهيد لاپەڕە (٤٤٠).

[3] القول المفيد (٤٠٨/٢).

**عن قتيلة، أن يهوديا أتى النبي (ﷺ) فقال: إنكم تشركون، تقولون ما شاء الله وشئت، وتقولون: والكعبة، فأمرهم النبي (ﷺ) إذا أرادوا أن يحلفوا أن يقولوا: (ورب الكعبة، وأن يقولوا: ما شاء ثم شئت) رواه النسائي وصححه.**

واته: قوتەیلەی ئەنسارِی کچی سەیفی دەفەرموویْت: گەورە زانایەکی جوولەکە هات بۆ لای پێغەمبەر و گوتی: ئێوە شەریك بۆ خوا دادەنێن، دەڵێن: خوا ویستی و تۆ ویستت، هەروەها دەڵێن: سوێند بە کەعبە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمانی دا بە موسڵمانان ئەگەر سوێندیان خوارد بڵێن: (سوێند بە خوای کەعبە، هەروەها بڵێن خوا ویستی و پاشان تۆ ویستت).

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(إنكم تشركون):** واتە: ئێوە شەریك بۆ خوا دادەنێن.

**(والكعبة):** واتە: سوێند بە کەعبە.

### هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

قەرعاوی دەفەرموویْت: (ئەم فەرموودەیەی لەبەر ئەوە لەم بابە باسکردوە چونکە وتەی: (ماشاء الله وشئت)، شیرکی بچووکە)[1].

### سوودەکانی فەرموودەکە:

١- پێغەمبەر (ﷺ) ئینکاری جوولەکەکەی نەکرد لەگەڵ ئەوەش مەبەستیان زەم و لۆمە کردنی پێغەمبەر و هاوەڵان بوو)[2].

---

[1] الجديد لاپەڕە (٣٧٣).

[2] القول المفيد (٢/٤٠٩-٤١٠).

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ گەڕانەوە بۆ حەق ئەگەر چی ئەوەی ئاگاداریشت دەکاتەوە ئەهلی حەق نەبێت[(١)].

**٣-** ئەمە بەڵگەیە دەبێت کاتی گۆڕین دا شتێک بگۆڕدرێ بە شتێکی نزیك لەو شتە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بڵێن سوێند بە خوای کەعبە، نەی فەرموو بڵێن سوێند بە خوا، هەروەها فەرمانی کرد بڵێن: (ما شآء الله، ثم شئت)[(٢)].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی ویست بۆ خوای گەورە.

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە مرۆڤ ویستی هەیە بە پێچەوانەی وتەی جەبری یەکان.

**٦-** پێغەمبەر (ﷺ) موسڵمانانی ئاگادار نەکردەوە لەسەر ئەم کردەوەیە و لەوانەیە نەیزانی بێت دروست نیە، یان لەوانەیە تاقیکردنەوەیەک بێت بۆ جوولەکەکان.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (دەوترێ: چۆن پێغەمبەر (ﷺ) موسڵمانانی ئاگادار نەکردەوە لەسەر ئەم کردەوەیە کەچی ئەم جوولەکەیە ئاگاداری کردنەوە؟

وەڵام: دەکرێت پێغەمبەر (ﷺ) گوێی لێ نەبووبێت و نەیزانی بێت، بەڵام دەوترێ: خوا دەزانێت؛ چۆن دانیان پێنا؟ کێشە دەمێنێتەوە، بەڵام وەڵام دەدرێتەوە بەوەی ئەمە شیرکی بچووک بووە نەک شیرکی گەورە، کەواتە حیکمەتەکە تاقیکردنەوە بووە لە خواوە بۆ

---

(١) القول المفیدا (٤٠٩/٢-٤١٠).

(٢) القول المفید (٤٠٩/٢-٤١٠).

جووله‌كه‌كان ئه‌وان ڕه‌خنه‌ له‌ موسڵمانان ده‌گرن له‌سه‌ر ئه‌م وته‌یه‌ كه‌ شیركی بچووكه‌، له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌ش خۆیان تووشی شیركی گه‌وره‌ بوون و به‌ عه‌یبی نابینن)[1].

٧- ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ به‌ڵگه‌یه‌ جووله‌كه‌كان ڕاستی ده‌زانن، چونكه‌ ئه‌گه‌ر شیركی بچووك بزانن ئه‌وا شیركی گه‌وره‌ له‌ پێشتره‌ بزانرێت.

٨- ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ به‌ڵگه‌یه‌ سوێند خواردن به‌ بێجگه‌ له‌خوا شیركه‌.

---

[1] القول المفيد (٢/٤٠٩-٤١٠).

**وله أيضا عن ابن عباس رضي الله عنهما: أن رجلا قال للنبي (ﷺ): ما شاء الله وشئت، فقال: (أ جعلتني لله ندا؟ ما شاء الله وحده).**

واته: له ابن عباس دەگێڕنەوە خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت دەفەرموێت: پیاوێک بە پێغەمبەری گوت: خوا ویستی و تۆش ویستت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئایا منت کرد بە هاوتای خوا؟ بەڵکو بڵێ خوا ویستی بە تەنها).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(أن رجلا قال للنبي (ﷺ)):** واتە: پیاوێک بە پێغەمبەری گوت، ئەوەی دیار بێت

ئەمەی بە پێغەمبەر گوت وەک بە گەورە دانان.

**(أجعلتني لله ندا؟):** واتە: ئایا منت کرد بە هاوتای خوا.

**(ما شاء الله وحده):** واتە: بەڵکو بڵێ خوا ویستی بە تەنها، پێغەمبەر (ﷺ) ڕێنمووی کرد بۆ گوتنی ئەم وتەیە تا دەرگای تووش بوون بە شیرک دابخات، نەیفەرموو بڵێ: (ماشاء الله ثم شئت).

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

قەرعاوی دەفەرمووێت: (فەرموودەکە بەڵگەیە وتەی: (ماشاء الله وشئت)، شیرکی بچووکە)[1].

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

---

[1] الجديد لاپەڕە (٣٧٤).

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بەگەورە دانانی پێغەمبەر (ﷺ) بە وتە دەلالەت لەسەر یەکسان کردنی دەکات لەگەڵ خالق و شیرکە، ئەگەر باوەڕی وابێت یەکسانن ئەوا شیرکی گەورەیە، ئەگەر ئەم باوەڕەشی وانەبێت ئەوا شیرکی بچووکە[1].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئینکاری کردن لە خراپە، لەبەر وتەی: (أجعلتني لله ندا؟)، لەگەڵ ئەمەش ئەمەی کردووە وەک بەگەورە دانان بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، لەسەر ئەمە ئەگەر کەسێک بۆ تۆ خۆی نزم کردەوە لە کاتی سەلام کردن واجبە لەسەرت ئینکاری بکەیت[2].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لە جوانی بانگەواز کردن ئەوەیە باسی شتێکی ڕێگەپێدراو بکەیت ئەگەر باسی حەڕامێکت کرد، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێک ڕێگری کرد لە گوتنی: (ماشاء الله وشئت)، ڕێنموویی کرد بۆ شتێکی ڕێگەپێدراو، ئەویش وتەی: (ماشاء الله وحده)[3].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ داخستنی دەرگاکانی تووش بوون بە شیرک، پێغەبەر (ﷺ) ڕێنموویی کرد بۆ: (ماشاء الله وحده)، پێی نەفەرموو بڵێ: (ماشاء الله، ثم شئت).

---

[1] القول المفيد (٢/٤١١-٤١٢).

[2] القول المفيد (٢/٤١١-٤١٢).

[3] القول المفيد (٢/٤١١-٤١٢).

**ولابن ماجه عن الطفيـل أخـي عائشة لأمهـا قال: رأيت كأني أتيت على نفر من اليهود، فقلت: إنكم لأنتم القوم، لولا أنكم تقولون: عزير ابن الله. قالوا: وإنكم لأنتم القوم لولا أنكم تقولون: ما شاء الله وشاء محمد. ثم مررت بنفر من النصارى فقلت: إنكم لأنتم القوم، لولا أنكم تقولون: المسيح ابن الله، قالوا: وإنكم لأنتم القوم، لولا أنكم تقولون: ما شاء الله وشاء محمد. فلما أصبحت أخبرت بها من أخبرت، ثم أتيت النبي (ﷺ) فأخبرته. قال: (هل أخبرت بها أحدا؟) قلت: نعم. قال: فحمد الله وأثنى عليه، ثم قال: (أما بعد؛ فإن طفيلا رأى رؤيا، أخبر بها من أخبر منكم، وإنكم قلتم كلمة كان يمنعني كذا وكذا أن أنهاكم عنها. فلا تقولوا: ما شاء الله وشاء محمد، ولكن قولوا: ما شاء الله وحده).**

واته: له توفەیل دەگێڕنەوە کە برای عائیشەیە لە دایکەوە گوتی: لە خەودا بینیم بەلای کۆمەڵێک جوولەکەدا تێپەڕیم و گوتم: ئێوە قەومێکی باشن ئەگەر نەتان گوتایە عوزێر کوڕی خوایە، ئەوانیش گوتیان: ئێوەش قەومێکی باشن ئەگەر نەتان گوتایە خوا ویستی و محمد ویستی.

پاشان بەلای کۆمەڵێک گاوردا تێپەڕیم و پێیانم گوت: ئێوە قەومێکی باشن ئەگەر نەتان گوتایە مەسیح کوڕی خوایە، ئەوانیش گوتیان ئێوە قەومێکی باشن ئەگەر نەتان گوتایە خوا ویستی و محمد ویستی.

جا کاتێک ڕۆژ بووەوە، ئەو خەوەم بۆ چەند کەسێک گێرایەوە، پاشان چووم بۆ لای پێغەمبەر درود و سەلامی خوای لێ بێت وە خەوەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش گوتی: ئایا بۆ کەست گێراوەتەوە؟ گوتم: بەڵێ، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: (توفەیل خەوێکی بینیوە بۆ چەند کەسێکتانی گێراوەتەوە، ئێوەش وشەیەکتان دەگوت، شتێکی ئاوا و ئاوا ڕێگری لێکردم کە لێتانی حەرام بکەم، (واتە:

شەرمی کردووە بە بێ ئیزنی خوا حەڕامی بکات)، ئیتر مەڵێن: خوا ویستی و محمد ویستی، بەڵکو بڵێن خوا هەر خۆی ویستی).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(رأيت):** واتە: لە خەودا بینیم.

**(على نفر):** نفر: لە سێ کەسەوە بۆ نۆ کەس پێی دەڵێن: نفر.

**(عزير):** پیاوێکی باش بوە و جوولەکەکان دەیان گوت کوڕی خوایە، ئەمەش درۆیە و کوفرێکی ڕوون و ئاشکرایە، هەندێک دەڵێن پێغەمبەر بووە و هەندێکی تر دەڵێن زانایەک بوە لە زاناکانیان.

**(المسيح):** واتە: عیسای کوڕی مەریەم، مسیح بەمانای ماسح دێت، واتە: لەسەر وەزنی (فعیل)ە بە مانای فاعل دێت، چونکە کوێری زگماک و پێست بەڵەکاوی مەسح دەکرد و چاک دەبوەوە بە ئیزنی خوا.

**(كان يمنعني كذا وكذا):** واتە: شتێکی ئاوا و ئاوا ڕێگری لێکردم کە لێتانی حەڕام بکەم، واتە: شەرمی کردوە بە بێ ئیزنی خوا حەڕامی بکات، هەروەک ڕیوایەتی طبرانی لە (المعجم الكبير)دا (٨٢١٤) هاتووە و ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردوە بۆ ئەوەی حوکمی (ماشاء الله و وشئت)، ڕوون بکاتەوە.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ڕاستی خەون، بەشێکە لە (٦٤) بەشی پێغەمبەرایەتی.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە خەون حەقە، لەبەر ئەوە نابێت درۆ بکرێت لە خەون گێرانەوەدا، فەرموودە هاتووە وەعیدی باسکردوە لەسەری)[1].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ قبووڵ کردنی حەق ئەگەر چی ئەوەی بۆتی هێناوە دوژمنیش بێت، چونکە حەق شتی بزر بووی ئیمانداره، گەرانەوە بۆ حەق فەزڵ و پلەو پایەیە[2].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروست نیە زیادەڕەوی بکەیت لە پێغەمبەردا و دروست نیە بیکەیتە شەریک لەگەڵ خوا لە دوعا و دوعا کردن لە کاتی تەنگانە و شتی تر، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کردوە بڵێیت: (ماشاء الله وشاء محمد)، ئەی چێ دەڵێیت بۆ شتی توندتر لە زیادەرەوی کردن[3].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی ویست بۆ خوای گەورە.

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە سوننەتە وتار بە سوپاس و مەدح کردنی خوای گەورە دەست پێ بکەیت.

---

[1] إعانة المستفيد (٢/٢٣٩).

[2] إعانة المستفيد (٢/٢٣٩).

[3] إعانة المستفيد (٢/٢٤٠).

## باب من سب الدهر فقد آذى الله

وقول الله تعالى: ﴿وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ﴾ {الجاثيه:٢٤}.

في الصحيح عن أبي هريرة، عن النبي (ﷺ) قال: (قال الله تعالى: يؤذيني ابن آدم، يسب الدهر، وأنا الدهر، أقلب الليل والنهار)[١].

وفي رواية: (لا تسبوا الدهر، فإن الله هو الدهر)[٢].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** النهي عن سب الدهر.

**الثانية:** تسميته أذى لله.

**الثالثة:** التأمل في قوله: (فإن الله هو الدهر).

**الرابعة:** أنه قد يكون سابا ولو لم يقصده بقلبه.

---

[١] أخرجه البخاري (٤٨٢٦)، ومسلم (٢٢٤٦).

[٢] أخرجه (٥/٢٢٤٦).

## باب من سب الدهر فقد آذى الله
## هەر كەسێک جنێو بدات بە زەمانە ئەزیەتی خوای گەورەی داوە.

دانەری كتاب لەبەر دوو شت ئەم بابەی باسكردووە لە كتابی تەوحید:

١- ئەمەش داخلی وتەی خوای گەورە دەبێت: ﴿فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادًا﴾.

٢- ئەم وتەیە نەهی لێكراوە و پێچەوانەی تەوحیدە.

سلیمان ال الشیخ ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (مناسبەی ئەم بابە لە كتابی تەوحید دیارە، چونكە جنێودان بە زەمانە شیركی تێدایە و دواتر باسی دەكەین إن شاء الله)[١].

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (مناسبەی باسكردنی ئەم بابە لە كتابی تەوحیدا دیارە ئەوەیە، جنێودان بە كات لەو وشانەیە كە دروست نین، لێ ڕزگار بوونی واجبە و بەكارهێنانی نەفی تەواوی تەوحید دەكات)[٢].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: ((السب): جنێودان و زەم كردن و وشەی تری هاوشێوەی ئەمانەیە، الدهر: كات و زەمانە.

جنێودان و زەم كردنی كات دابەش دەبێت بۆ سێ بەش:

یەكەم: مەبەست پێی تەنها خەبەرە و بێ ئەوەی لەومەی بكات، ئەمەیان دروستە، وەک ئەوەی بڵێت ئێمە ماندوو بووین لەبەر توندی گەرمایی ئەم ڕۆژە یان ساردی ئەم ڕۆژە

---

[١] التیسیر العزیز الحمید (٤٥٧).

[٢] التمهید لاپەڕە (٤٤٥).

یان قسەی تری وەک ئەمانە، چونکە هەموو کردەوەیەک مەرج تیایدا نییەتە، ئەم وتەیە هیچی تێدا نیە و گونجاوە، لەوانە وتەی لوط (علیه السلام): ﴿هَٰذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ﴾ [هود: ٧٧].

دووەم: جنێو دەدات بە کات لەسەر ئەوەی کات بکەرە، وەک ئەوەی باوەڕی وابێت کات خۆی کاروبارەکان وەردەگێڕێت بۆ خێر و شەڕ، ئەمەیان شیرکی گەورەیە چونکە باوەڕی وایە دروستکارێک لەگەڵ خوا هەیە، چونکە ڕووداوەکان دراونەتە پاڵ بێجگە لەخوا، هەرکەسێک باوەڕی وابێت لەگەڵ خوا دروستکارێکی تر هەیە ئەوا کافرە، هەروەک چۆن ئەگەر کەسێک باوەڕی وابێت لەگەڵ خوا خوایەکی تر هەیە و شایستەی ئەوەیە بپەرسترێت ئەوا کافرە.

سێیەم: جنێو بە کات دەدات نەک لەبەر ئەوەی باوەری وایە کات کارایە بەڵکو باوەڕی وایە خوای گەورە هەر خۆی کارایە بەڵام لەبەر شتە ناخۆشەکان جنێو دەدات، ئەمەیان حەڕامە و ناگاتە پلەی شیرک، ئەمەیان لە بێ عەقڵی و ساویلکەیی و گومڕاییە لە دیندا، چونکە لە ڕاستیدا جنێوەکە بۆ خوا دەگەڕێتەوە، چونکە خوای گەورە کات بەڕێوە دەبات)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (حەڕامە جنێو بە زەمانە بدەیت، جنێودان بە زەمانە دوو جۆرە:

یەکەم: هەیە کوفر و شیرکی گەورەیە، ئەگەر باوەڕی وابێت زەمانە خۆی کارایە، زەمانە خۆی بەڵاو ناخۆشی دەهێنێت و لەبەر ئەمە زەمی بکات، ئەمەیان شیرکی گەورەیە چونکە شەریکی داناوە لەگەڵ خوا.

---

[1] القول المفيد (٢/٤٢٢-٤٢٣).

دووەم: باوەڕی وایە بکەر (کارا) خوای گەورەیە بەڵام خراپە دەداتە پاڵ زەمانە یان زەم کردن دەداتە پاڵ زەمانە لە بابەتی ئاسانکاری کردن لە وتەدا، ئەمەیان حەڕامە و بە شیرکی بچووک دادەنرێت، هەتا ئەگەر چی هیچ مەبەستێکیشی نەبێت و بەڵکو تەنها سەر زارەکی بێت، بە شیرك دادەنرێت لە وتەدا)[1].

وەسف کردنی شەڕ دانە پاڵ هۆکار بە شیرکی بچووک جێگای تێڕوانینە، چونکە وەک ئەدەب جوان نییە شەڕ بدەیتە پاڵ خوا، والله أعلم.

[1] إعانة المستفيد (٢٤٧/٢).

**وقول الله تعالى:** ﴿وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ﴾ {الجاثيه:٢٤}.

خوای گەورە دەفەرموویت: (موشریکەکان گوتیان ژیانمان تەنها ژیانی دونیایە، دەمرین و دەژین و ژیان بەسەر دەبەین، کەس لەناومان نابات تەنها زەمانە نەبێت، ئەوان لەو بارەوە هیچ زانستێکیان لەلا نییە نە کەم و نە زۆر، تەنها ئەوەیە کە ئەوان مەزەنە دەکەن و هەرچی لەو بارەوە دەیڵێن وەهم و خەیاڵە).

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ﴾: واتە: کەس لەناومان نابات تەنها زەمانە نەبێت، واتە: لەناوچوونی ئێمە بە فەرمانی خوا و توانای خوا نەبووە.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (مناسبەی باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە ئەوەیە: لەم ئایەتەدا ڕووداوەکانی داوەتە پاڵ کات، هەر کەسێک ڕووداوەکان بداتە پاڵ کات ئەوە جنێویشی پێی دەدات ئەگەر تووشی شتێکی ناخۆش بوو)[1].

### سوودەکانی ئایەتەکە:

١- ئەم ئایەتە بەڵگەیە شت دانە پاڵ زەمانە سیفەتی موشریکەکان و دوژمنانی تەوحیدە، نەفی کردن و دانە پاڵ خوای گەورە سیفەتی یەک خوا پەرستانە.

---

[1] القول المفيد (٢/٤٢٥-٤٢٦).

صالح ال الشيخ خوا بيپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم ئایەتە دیارە شت دانە پاڵ زەمانە سیفەتی موشریکەکان و دوژمانی تەوحیدە، نەفی کردن و دانە پاڵ خوای گەورە سیفەتی یەک خوا پەرستانە، بەهیلاک چوون نادەنە پاڵ زەمانە بەڵکو خوای گەورە مرۆڤ دەژێنێت و دەی مرێنێت)[1].

**٢-** ئەم ئایەتە بەلگەیە ئەم موشریکانە ئینکاری قیامەت و زیندوو بوونەوەیان دەکرد.

---

[1] التمهید لاپەڕە (٤٤٦).

**في الصحيح عن أبي هريرة، عن النبي (ﷺ) قال: (قال الله تعالى: يؤذيني ابن آدم، يسب الدهر، وأنا الدهر، أقلب الليل والنهار)[(١)].**

**وفي رواية: (لا تسبوا الدهر، فإن الله هو الدهر)[(٢)].**

واتە: لە ئەبو هوڕیڕە دەگێرنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە فەرمووی: نەوەی ئادەم ئەزیەتم دەدەن بەوەی کە جنێو بە زەمانە دەدەن، زەمانەش خۆمم کە شەو ڕۆژ بەسەر یەکدا دەهێنم).

ڕیوایەتی تر هاتووە دەفەرموویێت: (جنێو مەدەن بە زەمانە، چونکە خوا هەر خۆی زەمانەیە).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(يؤذيني ابن آدم):** واتە: نەوەی ئادەم ئەزیەتم دەدات.

**(وأنا الدهر):** واتە: من زەمانەم، واتە زەمانەش خۆمم کە شەو ڕۆژ بەسەر یەکدا دەهێنم.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردوە بۆ ئەوەی حوکمی جنێودان بە زەمانە ڕوون بکاتەوە.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکرنی ئەزیەت دان بۆ خوای گەورە.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکرنی ئەزیەت دان بۆ خوای گەورە دەبێت ئێمەش جێگیری بکەین، چونکە خوای

---

(١) أخرجه البخاري (٤٨٢٦)، ومسلم (٢٢٤٦).

(٢) أخرجه (٥/٢٢٤٦).

گەورە بۆ نەفسی خۆی جێگیری کردووە، بەڵام وەک ئەزیەت دانی دروستکراوەکان نیە، بە بەڵگەی وتەی خوای گەورە: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ [الشورى: ١١]، لەم ئایەتە نەفی پێش جێگیرکردنی خستووە)[١].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئەزیەت دەدرێت بە کردەوە خراپەکانی بەندە، بەڵام زیانی پێ ناگات بەمە)[٢].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دهر ناوی خوای گەورە نیە، لێرە ڕستەکە محذوفی تێدایە تەقدیرەکەی: من خۆم بەڕێوەی دەبەم و شەو ڕۆژ بەسەر یەکدا دەهێنم، شەو و ڕۆژ هەردووکیان کاتن، لە ڕووی عەقڵەوە ناکرێت دروستکاری بکەر خۆی دروستکراوی بەرکار بێت، بەمە هەڵەی ئەوانە بەدیار دەکەوێت کە دەڵێن: الدهر ناوێکە لە ناوەکانی خوای گەورە، وەک ابن حزم ڕەحمەتی خوای لێ بێت کە دەفەرمووێت: (الدهر لە ناوەکانی خوای گەورەیە)، ئەم غافلی یە لە تێگەیشتنی ئەم فەرموودەیە...

کەواتە نەفی ناوی دهر دەکەین بۆ خوا لەبەر دوو ڕوو:

یەکەم: سیاقی فەرموودەکە قبوڵ ناکات ئەم مانایە هەڵبگرێت.

دووەم: ناوەکانی خوای گەورە هەموویان جوانن و مانایان هەیە، دهر ناوێکی جامدە و هیچ مانایەک هەڵناگرێت ئیلا ئەوە نەبێت کە ناوی کاتە[٣].

---

[١] القول المفيد (٤٢٧/٢-٤٢٩).

[٢] إعانة المستفيد (٢٤٧/٢).

[٣] القول المفيد (٤٢٩/٢-٤٣٠).

صالح الفوزان خوا بيپارێزێت دەفەرمووێت: (دهر لە ناوەکانی خوای گەورە نیە، فەرموودەکە هەندێکی هەندێکی تر تەفسیر دەکات، هەر کەسێک بڵێت دهر ناوی خوای گەورەیە ئەوە بە هەڵە داچووە)[1].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە جنێودان بە زەمانە حەڕامە، زانایان دەڵێن جنێودان بە کات و زەم کردن ئەم چوار حاڵەتانەن:

یەکەم: ئەگەر مەبەست پێی خوای گەورە بێت، ئەمەیان کوفرە و لە دین دەردەچێت.

دوووە: ئەگەر مەبەست پێی تەنها خەبەر بێت و بێ ئەوەی لەومەی بکات ئەمەیان دروستە.

سێیەم: ئەگەر جنێو بدات بە کات لەسەر ئەوەی کات بکەرە وەک ئەوەیە باوەڕی وابێت کاتی خۆی کاروبارەکان وەردەگێڕێت بۆ خێر و شەڕ، ئەمەیان شیرکی گەورەیە.

چوارەم: جنێو بە کات دەدات نەک لەبەر ئەوە کە باوەڕی وایە بکەرە، بەڵکو باوەڕی وایە خوا هەر خۆی بکەرە بەڵام جنێو دەدات لەبەر شتە ناخۆشەکان، ئەمەیان حەڕامە.

---

[1] إعانة المستفيد (٢/٢٤٧).

## باب التسمي بقاضي القضاة ونحوه

**فى الصحيح عن أبي هريرة رضي الله عنه، عن النبي (ﷺ) قال: (إن أخنع اسم عند الله: رجل تسمى ملك الأملاك، لا مالك إلا الله).[١]**

**قال سفيان: مثل (شاهان شاه).**

**وفي رواية: (أغيظ رجل على الله يوم القيامة وأخبثه)[٢].**

**قوله (أخنع) يعني أوضع.**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** النهي عن التسمي بملك الأملاك.

**الثانية:** أن ما في معناه مثله، كما قال سفيان.

**الثالثة:** التفطن للتغليظ في هذا ونحوه، مع القطع بأن القلب لم يقصد معناه.

**الرابعة:** التفطن أن هذا لإجلال الله سبحانه.

---

[١] أخرجه البخاري (٦٢٠٦)، ومسلم (٢١٤٣).

[٢] أخرجه مسلم (٢١/٢١٤٣).

## باب التسمي بقاضي القضاة ونحوه
## باسی ناونان بە قازی قازی یەکان و هاوشیوەکانی

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (مناسبەی باسکردنی ئەم بابە لە کتابی تەوحید ئەوەیە: هەر کەسێک ئەم ناوە لە خۆی بنێت ئەوا نەفسی خۆی کردۆتە شەریک لەگەڵ خوا لە شتێک دا کە کەس شایستە نیە ئیلا خوا نەبێت، چونکە شایستەی ئەوە نیە قازی قازی یەکان بێت یان حاکمی حاکمەکان بێت یان مەلیکی مەلیکەکان بێت، ئیلا خوای گەورە نەبێت کە شاییستەی ئەمەیە، خوای گەورە قازی سەرووی قازی یەکانە، حوکم هەموو هی خۆیەتی و هەموو کارەکان بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە هەروەک لە قورئان باسکراوە.

ئەگەر گوترا: ئەگەر قازی حصر کرا بە کۆمەڵێکی دیاریکراو، یان شارێکی دیاریکراو، یان کاتێکی دیاری کراو، وەک: قازی قازی یەکان لە فقهـ، یان قازی قازی یەکان لە مەملەکەتی عەرەبی سعودی، یان قازی قازی یەکانی میسر و شام یان شتی تری هاوشێوەی ئەمانە؟

وەڵام: ئەمە دروستە چونکە مقید کراوە، ئەوەی زانراو بێت قەزای خوای گەورە مقید ناکرێت، ئەو کاتە نابێتە شەریک لەگەڵ خوای گەورە، لەسەر ئەوەش باشتر وایە ئەم ناوانە بەکارنەهێنرێت ئەگەر چی دروستیشن، چونکە زۆر جار مرۆڤ سەرسام دەبێت بە نەفسی خۆی و حەق وەرناگرێت ئەگەر پێچەوانەی وتەی بوو، ئەم بابەتە گەورەیە و ترسناکە ئەگەر مرۆڤ گەیشتە ئەو ڕادەییەی ڕای خۆی وا ببینێت واجب کراوە بەسەر کەسانی تر، ئەمە ترسناکی یەکی گەورەیە، لەگەڵ ئەمەش دروستە بەڵام نابێت مرۆڤ هیچ ناوێک یان وەسفێک لە خۆی بنێت، ئەگەر مقید کرا بە کات یان شوێن یان شتی تر دەڵێین دروستە، بەڵام باشتر وایە ئەمە نەکات.

ناونان به (شيخ الإسلام) وەک ئەوەی بڵێیت: شيخ الإسلام ابن تيميه يان شيخ الإسلام محمد بن عبدالوهاب، واته مەبەست پێی مطلق بێت و بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام ئەمەیان دروست نیە، چونکە ئەبو بکر خوا لێی ڕازی بێت لەپێشترە بۆ ئەم وەسفە، چونکە باشترین دروست کراوە لە پاش پێغەمبەران، بەڵام ئەگەر مەبەست پێی وەسف کردن بێت بە نوێکەرەوەی ئیسلام و پاشماوەی باشی هەبووبێت و ڕۆڵێکی چاکی هەبووبێت بۆ پارێزگاری کردن لە دین ئەوا هیچی تێدا نیە و دروستە)[1].

هەروەها دەفەرموویێت: (لەقەبی شيخ الإسلام بە مطلقی دروست نیە، واتە شیخ بە مطلقی بۆ ئیسلام دەگەڕێتەوە و نابێت کەسی پێ وەسف بکرێت، چونکە کەس معصوم و پارێزراو نیە لە هەڵە لەوەی کە بۆ ئیسلام دەیڵێت ئیلا پێغەمبەران نەبن. بەلام ئەگەر مەبەست بە شيخ الإسلام کەسێک بێت کە گەورە بێت لە ناو ئیسلام و ڕۆلی هەبێت و دینی نوێ کردبێتەوە لە شیرک و بیدعە و وە ڕاسگۆ بێت ئەوا دروستە وەسفی بکەیت بەم لەقەبە)[2].

---

[1] القول المفيد.

[2] مجموع فتاوى و رسائل الشيخ محمد صالح العثيمين المجلد الثالث - باب المناهي اللفظية.

**فی الصحيح عن أبي هريرة رضي الله عنه، عن النبي (ﷺ) قال: (إن أخنع اسم عند الله: رجل تسمى ملك الأملاك، لا مالك إلا الله).**

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بە تەئكيد سوكترين و بێ ڕێزترين ناو لای خوای گەورە ئەوەیە پیاوێک ناو لە خۆی بنێت مەليكی مەليكەكان، چونكە هيچ كەسێک بە تەواوی خاوەنی هيچ شتێک نيە جگە لەخوا).

**قال سفيان: مثل (شاهان شاه).**

سوفيان دەفەرمووێت: (وەک شاهان شاهـ).

**وفي رواية: (أغيظ رجل على الله يوم القيامة وأخبثه).**

واتە: ڕيوايەت هاتووە دەفەرمووێت: (تووڕەيی و غەزەبی خوا لە ڕۆژی قيامەت دا لەسەر ئەو كەسە زۆر سەختە و ناوەكەشی لە ناوی هەموو خەڵكی پيسترە).

**ڕاڤەی وشەكانی فەرموودەكە:**

**(إن أخنع اسم عند الله):** واتە: بە تەئكيد سوكترين و بێ ڕێزترين ناوە لای خوای گەورە.

**(رجل تسمى ملك الأملاك):** واتە: پياوێک ناو لەخۆی بنێت مەليكی مەليكەكان.

**هۆكاری باسكردنی ئەم فەرموودەيە لەم بابە:**

قەرعاوی دەفەرموویت: (فەرموودەکە ڕێگری کردنە  لە ناونان بە مەلیکی مەلیکەکان و شتی تری هاوشیوەی ئەمانە، چونکە شەریک دانانە لەگەڵ خوا لە پەروەردگارییەتی دا)[1].

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەڕامە ناوی مەلیکی مەلیکەکان لە خۆت بنێیت[2].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (لەناو وڵاتانی موسڵمانان ناوی قازی قازی یەکان و شتی تر بڵاوبوونەتەوە لە قەڕنی چوارەمی هیجری، واجبە لەسەر بەندە خۆی بپاریزێت لەم ناوە و بەسەر زاریدا نەیەت و ڕازی نەبێت بەمە.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی سیفەتی غەزەب بۆ خوای گەورە[3].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ حیکمەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە فێرکردن، چونکە کاتێک باسی سوکترین و بێ ڕێزترین ناوی کرد لای خوای گەورە ئاماژەی  بۆ عیلەتەکەش  کرد، ئەویش ئەوەیە گوتی: (لا مالك الا الله)، ئەمە لەجوانترینی شێوازی فێرکردن و دەربڕینە[4].

---

[1] الجديد لاپەڕە (٣٨٤).

[2] الجديد لاپەڕە (٣٨٤)

[3] القول المفيد (٣/١٠-١١).

[4] القول المفيد (٣/١٠-١١).

## باب احترام أسماء الله وتغيير الاسم لأجل ذلك

**عن أبي شريح: أنه كان يكنى أبا الحكم؛ فقال له النبي (ﷺ): (إن الله هو الحكم، وإليه الحكم) فقال: إن قومي إذا اختلفوا في شيء أتوني، فحكمت بينهم، فرضي كلا الفريقين فقال: (ما أحسن هذا فمالك من الولد؟) قلت: شريح، ومسلم، وعبد الله. قال:(فمن أكبرهم؟) قلت: شريح، قال: (فأنت أبو شريح)، رواه أبو داود وغيره[1].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** احترام أسماء الله وصفاته ولو لم يقصد معناه.

**الثانية:** تغيير الاسم لأجل ذلك.

**الثالثة:** اختيار أكبر الأبناء للكنية.

---

[1] أخرجه أبوداود (٤٩٥٥)، والنسائي (٥٣٨٧)، وابن حبان (٢٥٧/٢ رقم ٥٠٤).

## باب احترام أسماء الله وتغيير الاسم لأجل ذلك
## باسی ڕێزگرتن له ناوەکانی خوای گەورە و گۆڕینی ناویش لەپێناو ئەوەدا واجبە.

هەرناوێک تایبەت بێت بەخوا حەڕامە ئەو ناوە لە خۆت بنێیت یان لە منالّی بنێیت، وەک: (خالق و قدوس)، یان ناوێک کە شیاوی کەس نەبێت ئیلا خوا نەبێ، وەک (مالك الملوك)، ئەمەیان هەموو زانایان یەک دەنگن لەسەری.

ابن القيم ڕەحمەتی خوای ێ بێت دەفەرمووێت: (ئەم ناوانە تایبەتن بەخوا: (الله والرحمن والحكم والأحد، والصمد، والخالق، والرزاق، والجبار، والمتكبر، والأول، والآخر، والباطن، وعلام الغيوب))[1].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (دانەری کتاب دەیەوێت ڕوونی بکاتەوە واجبە ڕێز لە ناوەکانی خوای گەورە بگریت و خۆت بپارێزی لە بەکەم دانانی، یان بەکەمی دابنێیت، یان هەندێک ناو لەخۆت بنێیت کە تایبەت بێت بە خوای گەورە، لەبەر ئەوە ناو دەبێت بگۆڕدرێت لەبەر ڕێز و گەورەیی خوا، ناوەکان دوو جۆرن:

١- هەندێک ناو هەن نابێت کەس لەخۆی بنێت بێجگە لەخوا، وەک: )الرحمن، والخالق، ورب العالمين) و ناوی تر.

٢- هەندێک ناوی تر هەن دروستە لەخۆتی بنێیت)[2].

---

[1] تحفة المودود لاپەڕە (٩٨).

[2] التعليق المفيد لاپەڕە (٢٢٣).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (واتە: واجبە ڕێز لە ناوەکانی خوای گەورە بگیرێت، چونکە ڕێزگرتن لە ناوەکانی خوای گەورە لە بەگەورە دانانی خوایە و نابێت کەس ناوی خوا لە خۆی بنێت لەوانەی کە تایبەتن بە خوا، ناوەکانی خوای گەورە دابەش دەکرێن بۆ دوو بەش:

یەکەم: هەندێک ناو هەن بۆ کەس دروست نیە ئەم ناوانە لەخۆی بنێت بێجگە لەخوا، ئەگەر ئەم ناوانە لەخۆی بنێ واجبە بیگۆڕێ، وەک: )الله، الرحمان، رب العالمين) و ناوی تری وەک ئەمانە.

دووەم: هەندێک ناوی تر هەن دروستە کەسانی تر لەخۆیان بنێن، وەک: (الرحيم والسميع والبصير))[١].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم ڕێزگرتنە لە ناوەکانی خوای گەورە حاڵەت هەیە سوننەتە و هەیە واجبە، ناوەکانی خوای گەورە دەبێت ڕێزی لێ بیگریت، واتە: دەبێت ئیهانە نەکرێن، وە سوننەتە ڕێزیان لێ بگریت وەک ئەدەب و نابێت بێجگە لەخوا پێی وەسف بکرێت، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ بە گەورە دانانی شعائیری خوای گەورە)[٢].

---

[١] القول المفيد (٣/١٥-٢٣).

[٢] التمهيد لاپەڕە (٤٥٢).

**عن أبي شريح: أنه كان يكنى أبا الحكم؛ فقال له النبي (ﷺ): (إن الله هو الحكم، وإليه الحكم) فقال: إن قومي إذا اختلفوا في شيء أتوني، فحكمت بينهم، فرضي كلا الفريقين فقال: (ما أحسن هذا فمالك من الولد؟) قلت: شريح، ومسلم، وعبد الله. قال:(فمن أكبرهم؟) قلت: شريح، قال: (فأنت أبو شريح)، رواه أبو داود وغيره.**

واته: له باوكی شورەیح دەگێڕنەوە: كه به كونییەی (ابو الحكم) بانگ دەكرا، جا لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: (خوا هەر خۆی حەكەمە، هەرچی حوكمیشە بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە).

ئەبو شورەیح گوتی: (ئەگەر قەومەكەم له هەر شتێكدا ناكۆكیان تێ بكەوتایە دەهاتن بۆ لام، منیش لەنێوانیادا حوكمم دەدا واتە سوڵحم دەكرد لەنێوانیان، هەردوو لاش ڕازی دەبوون بەو سولحە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەمە چەند جوانە! ئەی چەند منالّت هەیە؟ گوتم: شورەیح و موسلیم و عبدالله.

فەرمووی: كامەیان گەورەكەیە؟، گوتم شورەیح، فەرمووی: (كەواتە تۆ ئەبو شورەیحیت).

**ڕاڤەی وشەكانی فەرموودەكە:**

**(إن قومي إذا اختلفوا في شيء أتوني):** ئەمە هۆكاری ناونان بوو به ئەبو الحكم.

**(ما أحسن هذا):** ئەمە بۆ سوڵح كردن دەگەڕێتەوە نەك بۆ ناوەكە.

**هۆكاری باسكردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردوە تاوەکو ڕوونی بکاتەوە نابێت لێکچوون هەبێت لەنێوان ناوەکانی خوا و ناوەکانی بەندە، چونکە ئەمە شیرکە لە ناو و سیفەتدا لەگەڵ خوای گەورە.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ڕێزگرتن لە ناوەکانی خوای گەورە و بە گەورە دانانی و گۆڕینی ناو لەبەر گەورەیی خوا، پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ناوەی گۆڕی لەبەر دوو شت:

١- (الحکم) خوای گەورەیە، ئەگەر بڵێی: (یا ابا الحکم)، وەک ئەوە وایە بڵێی: (یا ابا الله).

٢- ئەگەر ئەم ناوە بکەیتە کونیە بۆ ئەم پیاوە ئەوە بەشێکت پێداوە لە سیفەت، بەمەش مطابقی ناوی خوای گەورە دەبێت، لەم حاڵەتە تەنها ناو نیە بەڵکو ماناشە، بەمە دەبێتە شەریک لەگەڵ خوای گەورە، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی گۆڕی)[١].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ڕێزگرتن لە ناوەکانی خوای گەورە و بە گەورە دانانی، هەروەها گۆڕینی ناو لەبەر گەورەیی خوا، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ناوی (أبی الحکم) ی گۆڕی بۆ (أبی شریح) وەک ڕێزگرتن لە ناوەکانی خوای گەورە)[٢].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فێرکردنی نەزان، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ئەبو شورەیحی فێرکرد و ڕوونی کردەوە کە کونییەکەی هەڵە بوو[٣].

---

[١] القول المفید (٣/٢٥-٢٩).

[٢] إعانة المستفید (٢/٢٥٩).

[٣] إعانة المستفید (٢/٢٥٩).

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە مرۆڤ ئەگەر مەنعی شتێکی خراپی کرد دەبێت جێگرەوەیەکی بۆ بدۆزێتەوە کە گونجاو بێت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێک ڕێگری کرد لە کونییەی (أبی الحکم) بەدیلی بۆ دانا کە (أبی شریح) بوو)[١].

قەرعاوی دەفەرموویێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ واجبی ئینکاری کردنی خراپە)[٢].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ سوڵح کردن لەنێوان خەڵک ئەگەر ناکۆکی کەوتە نێوانیان، هەروەها سوڵح بنیات نراوە لەسەر ڕازی بوونی هەردوولا نەک ناچار کردنی هەردوولا بێت، چونکە ئەبو شورەیح دەڵێت: (فرضي كلا الفريقين)، ئەوەی سوڵح دەکات خەڵک پابەند ناکات بەڵکو ڕێگە چارەیەکی بە سوودیان پێشکەش دەکات، ئەگەر قبوڵ کرا سوپاس بۆ خوا، ئەگەر نا بۆ کتابی خوا و سوننەتی پێغەمبەری خوا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کێشەکە بنبڕ بکرێت، سەبارەت بەو کەسەی خەڵک پابەند دەکات بە حوکمی بێجگە لەخوا ئەوا تاغوتە)[٣].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کونییە بە ناوی گەورەترین مناڵ دادەنرێت، وە دروستە بە ناوی کچیش دابنرێت.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کونییە بە ناوی گەورەترین مناڵ دادەنرێت)[٤].

---

[١] إعانة المستفيد (٢/٢٥٩).

[٢] الجديد لاپەڕە (٣٨٦).

[٣] اعانة المستفيد (٢/٢٦٠).

[٤] إعانة المستفيد (٢/٢٦٠).

قەرعاوی دەفەرموویێت: (دروستە كونییە بەناوی كچ دابنرێت، چونكە وشەی (ولد) بۆ نێر و مێ بەكاردێت)[١].

زانایانی اللجنة الدائمة دەڵێن: (باشتر وایە مرۆڤ كونیە لەخۆی بنێت بە منالی گەورە، جا زیندوو بێت یان مردوو بێت و بەم كونییەیە بانگ بكرێت، بەڵام ئەگەر یەكێك كونیە لەخۆێ بنێت بە ناوی منالێكی بچووكتر و بەمەش بانگ بكرێت ئەوا هیچی تێدا نیە و تاوانبار نابێت، ئەگەر چی منالی گەورە زیندوو بێت یان مردوو)[٢].

ئیمام النووی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (باسكردنی ئەوە كە دروستە پیاو كونییە لەخۆی بنێت بە باوكی فلانە كچ و فلانە كوڕ، وە ئافرەتیش كونییە لەخۆی بنێت دایكی فلانە كوڕ و دایكی فلانە كچ.

بزانە هەموو ئەمانە حجری تێدا نییە، كۆمەڵێك لە پێشینەكانی ئەم ئوممەتە لە هاوەڵان و تابعی یەكان و ئەوانەی دواتر كونییەیان لەخۆ ناوە بە (باوكی فلانە كچ)، لەوانە عوثمان خوا لێی ڕازی بێت سێ كونییەی هەبوو: أبو عمرو و وأبو عبد الله و وأبو ليلى، وە أبو الدرداء خێزانیشی أم الدرداء الكبرى بوو)[٣].

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیركردنی ناوی (الحكم) بۆ خوای گەورە[٤].

---

[١] الجديد لاپەڕە (٣٨٦).

[٢] فتاوى اللجنة الدائمة (٤٨٧/١١).

[٣] الأذكار لاپەڕە (٢٩٦).

[٤] القول المفيد (٢٣/٣-٢٥).

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە سوننەتە عوزر لە موسڵمان وەربگریت ئەگەر عوزرەکە ڕووی هەبوو[1].

[1] الجدید لاپەڕە (٣٨٦).

## باب من هزل بشيء فيه ذكر الله أو القرآن أو الرسول

وقول الله تعالي: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ﴾ {التوبة:٦٥}.

عن ابن عمر، ومحمد بن كعب، وزيد بن أسلم، وقتادة – دخل حديث بعضهم في بعض - : أنه قال رجل في غزوة تبوك: ما رأينا مثل قرائنا هؤلاء، أرغب بطونا، ولا أكذب ألسنا، ولا أجبن عند اللقاء ـ يعني رسول الله (ﷺ) وأصحابه القراء ـ فقال له عوف بن مالك: كذبت، ولكنك منافق، لأخبرن رسول الله (ﷺ). فذهب عوف إلى رسول الله (ﷺ) ليخبره فوجد القرآن قد سبقه. فجاء ذلك الرجل إلى رسول الله (ﷺ) وقد ارتحل وركب ناقته، فقال: يا رسول الله! إنما كنا نخوض ونتحدث حديث الركب، نقطع به عنا الطريق.

فقال ابن عمر: كأني أنظر إليه متعلقا بنسعة ناقة رسول الله (ﷺ)، وإن الحجارة تنكب رجليه – وهو يقول: إنما كنا نخوض ونلعب – فيقول له رسول الله (ﷺ): ﴿أَبِاللّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِؤُونَ﴾ ما يتلفت إليه وما يزيده عليه[١].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** وهي العظيمة: أن من هزل بهذا فهو كافر.

**الثانية:** أن هذا هو تفسير الآية فيمن فعل ذلك كائناً من كان.

**الثالثة:** الفرق بين النميمة والنصيحة لله ولرسوله.

---

[١] أخرجه ابن جرير في (التفسير) (١٠/١٧٢-١٧٣).

**الرابعة:** الفرق بين العفو الذي يحبه الله وبين الغلظة على أعداء الله.

**الخامسة:** أن من الأعذار ما لا ينبغي أن يقبل.

## باب من هزل بشيء فيه ذكر الله أو القرآن أو الرسول
## هەر کەسێک گاڵتە بە هەر شتێک بکات کە ناوی خوا یان قورئان یان هەر پێغەمبەرێکی تێدا بێت ئەوا کافر بوە.

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەم بابە باسی حوکمی ئەوانە دەکات کە گاڵتە بەخوا و قورئان و پێغەمبەر دەکەن، حوکمەکەیان ئەوەیە هەڵگەڕاونەتەوە لە ئیسلام ئەگەر موسڵمان بن، گاڵتە کردن بە دین هەڵگەڕانەوە و کوفرە)[1].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (تەوحیدی پاک لە دڵدا، بەڵکو ئەسڵی تەوحید و گاڵتەکردن بە خوا و پێغەمبەر و قورئان پێکەوە کۆنابنەوە، چونکە گاڵتەکردن پێچەوانەیەتی، لەبەر ئەوە هەندێک لە ئەهلی عیلم دەڵێن: کافر دوو جۆرن: هەیە پشتی لە دین کردووە و دژی دەوەستێت، وەک ئەوانەی خوای گەورە لەدەربارەیاندا دەفەرموویێت: ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْلَمُونَ الْحَقَّ فَهُمْ مُعْرِضُونَ﴾ {الانبياء:٢٤}، دژی دین دەوەستن و بە هەموو جۆرێک قسە دەکەن بۆ کوژاندنەوەی ڕووناکی خوای گەورە، لەوانە گاڵتە کردن بە دین و شتی تر.

تەوحید ملکەچ بوون و قبوڵ کردن و بەگەورە دانانی خوای گەورەیە، گاڵتە کردن بە خوا یان قورئان یان پێغەمبەر پێچەوانەیەتی و نەفی ئەسڵی تەوحید دەکات، لەبەر ئەوە کوفری گەورەیە بە خوا و ناکرێت گاڵتە کردن بەخوا و پێغەمبەر و قورئان لە دڵی یەکخواپەرستێک دەربچێت، دەبێت ئیلا دووڕوو یان کافر بێت.

مناسبەی ئەم بابە لە کتابی تەوحید دا دیارە: گاڵتە کردن بە خوا و پێغەمبەر و قورئان نەفی ئەسڵی تەوحید دەکات، کوفرە و لە دین دەردەچێت)[2].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەوەی دیار بێت ئەم بابە مەبەست پێی زیکری خوا واتە ئەحکامی شەرعی یان گاڵتە کردن بە قورئان یان بە پێغەمبەرە، مەبەست بە (الرسول) لێرە اسم جنسە، هەموو پێغەمبەرێک دەگرێتەوە، تەنها مەبەست پێی محمد نیە، کەواتە (ال) بۆ جنسە نەک بۆ عهد بێت، وتەی (من هزل) گاڵتە دەکات و

---

[1] التعليق المفيد لاپەڕە (٢٢٥).
[2] التمهيد لاپەڕە (٤٥٦-٤٥٧).

یاری پێ دەکات و پێی وایە جدی نیە، هەر کەسێک گاڵتە بە ئایەتەکانی خوا بکات جا ئایەتی شەرعی بێت یان کەونی ئەوا کافرە، چونکە گاڵتە کردن بە دین نەفی دین دەکات بە نەفی کردنێکی گەورە، کەوابوو چۆن گاڵتە بە شتێک دەکات کە ئیمانی پێ هێناوە ئەوەی ئیمانی بە شتێک هێنابێت دەبێت ئیلا لە دڵی خۆیدا بە گەورەی دابنێت.
کوفر دوو جۆرە: کوفری پشت لە دین کردن و کوفری لە دژ وەستان، ئەوەی گاڵتە بەدین بکات تووشی کوفری لە دژ وەستان بووە، ئەمە گەورەترە لەوەی کەسێک سوجدە بۆ پەیکەرێک ببات، ئەم بابەتە زۆر ترسناکە هەندێک جار وشەیەک خاوەنەکەی تووشی بەڵا و بەهیلاک چوون دەبات و هەستی پێ ناکات، مرۆڤ قسەیەک دەکات لای هیچ نیە و گوێی پێ نادات کەچی بەهۆی ئەم قسەوە چەند لەناو ئاگر دەمێنێتەوە، هەر کەسێک گاڵتە بە نوێژ بکات ئەگەر چی نوێژی سوننەتیش بێت یان زەکات یان ڕۆژوو یان حەج ئەوا کافرە بە یەک دەنگی هەموو موسڵمانان، هەروەها ئەوەی گاڵتە بە ئایەتی کەونی بکات وەک ئەوەی بڵێت: بوونی گەرما لە ڕۆژەکانی هاویندا کەم ئەقڵی و ساویلکەییە، یان بوونی سەرما لە ڕۆژەکانی زستاندا کەم ئەقڵی و ساویلکەییە، ئەمە کوفرە و پێی لە دین دەردەچێت، چونکە خوای گەورە کردەوەکانی بنیات نراوە لەسەر حیکمەت و ئێمە ناتوانین بگەین بە هەمووان)[1].

---

[1] القول المفيد (٣/٣٠-٣٦).

**وقول الله تعالي:** ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ﴾ {التوبة:٦٥}.

واتە: خوای گەورە دەفەرموویێت: ( ئەگەر پرسیار بکەیت لەو دووڕووانە دەڵێن: ئێمە گاڵتەمان کردوە و مەبەستمان تەنها کات بەسەر بردن بوو، مەبەستمان گاڵتە پێکردن و سوکایەتی نەبوو، تۆش بڵێ: ئایا بەخوا و بە ئایەت و نیشانەکانی و بە پێغەمبەرەکانی گاڵتەجاڕی و سوکایەتی دەکەن، هیچ عوزرێک مەهێننەوە و لێتان قبوڵ ناکرێت، ئێوە کافر بوون دوای ئەوەی کە ئیماندار بوون.

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ﴾: خطاب بۆ پێغەمبەرە، واتە ئەی محمد ئەگەر پرسیار لەو دووڕووانە بکەیت.

﴿لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ﴾: واتە دەڵێن: ئێمە گاڵتەمان کردوە و مەبەستمان تەنها کات بەسەر بردن بوو، مەبەستمان گاڵتە پێکردن و سوکایەتی نەبوو.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

قەرعاوی دەفەرموێت: (ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر کوفری ئەو کەسەی کە گاڵتە دەکات بە خوا و ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکانی)[1].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

١- ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ ڕوونکردنەوەی زانستی خوای گەورە بەوەی کە چ ڕوودەدات لە داهاتوودا، لەبەر وتەی: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ﴾.

[1] الجديد لاپەڕە (٣٨٩).

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە گاڵتە کردن بەخوا و ئایەتەکانی و پێغەمبەرانی کوفرە و لەدین دەردەچیت پێی، چونکە ئەسڵی دین بنیات نراوە لەسەر بە گەورە دانانی خوا و دینەکەیی و پێغەمبەرەکەی، گاڵتە کردن بەم شتانە نەفی ئەسڵی تەوحید دەکات و لە توندترینی هەڵوەشێنەرەوەکانە»[1].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەم ئایەتە بەڵگەیە گاڵتە کردن بەخوا و ئایەتەکان و پێغەمبەر لە گەورەترینی کوفرە، بە بەڵگەی استفهام و توبيخ)[2].

پرسیار لە عبد العزيز بن باز کراوە ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئایا ئەو کەسەی گاڵتە بەدین دەکات، گاڵتە بە ڕیش دەکات یان کەسێک کە جل و بەرگی کورت بێت، ئایا بە کوفر حساب دەکرێت؟

لە وەڵام دا دەفەرمووێت: (ئەمەیان حاڵەت لە بۆ حاڵەت جیاوازە:

١- ئەگەر مەبەستی گاڵتە کردن بێت بە دین ئەوا هەڵگەڕانەوەیە لەدین، هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَـٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ۝ لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ﴾ [التوبة: ٦٥-٦٦]

٢- بەڵام ئەگەر گاڵتە بە کەسێک بکات بە خودی کەسەکە بەهۆی ڕیش یان جل و بەرگ کورت کردن گاڵتەی پێ دەکات لە هەندێک شت توندی کردووە و هەندێک شتی تر شلی کردووە، وە دەزانێت ئەمەش دینە و مەبەستی گاڵتە کردن بەدین نیە بەڵکو مەبەستی گاڵتە کردنە بە خودی کەسەکە لەبەر جل و بەرگ کورت کردنەکە یان

[1] تيسير الكريم الرحمن لاپەڕە (٢٥٥).

[2] القول المفيد (٣/٣٦-٣٨).

هۆکاری تر، بەڵام ئەگەر مەبەستی گاڵتە کردن بە دین و بەکەم دانانی بێت ئەوا هەڵگەڕانەوەیە لەدین)[١].

ابن حزم ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (دەق هاتووە بە صحیحی هەر کەسێک گاڵتە بەخوا بکات یان بە فریشتەیەک لە فریشتەکان یان بە پێغەمبەرێک لە پێغەمبەرەکان یان بە ئایەتێک لە ئایەتەکانی قورئان یان واجبێک لە واجبەکانی دین دوای ئەوەی پێی گەیشتبێت و بۆی ڕوون بوو بێتەوە ئەوا کافر دەبێت)[٢].

زانایانی اللجنه الدائمة دەڵێن: (یەکەم: بانگەوازی کردن بۆ دینی خوا دەبێت بە حیکمەت و ئامۆژگاری باش و بەشێوەی جوان بێت و بە جوانی گفتوگۆی لەگەڵ بکەیت، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ [النحل:١٢٥].

دووەم: دەبێت بانگخواز ئەوەی بانگەواز بۆ دینی خوا دەکات شارەزا بێت بە فەرمان و نەهی، هەیە سوورە لەسەر خێر و چاکە و حەز دەکات سوود بە خەڵک بگەیەنێت بەڵام نەزانینی لەلایە، حەڵاڵ حەرام دەکات و حەرام حەڵاڵ دەکات و وا گومان دەبات لەسەر هیدایەتیشە.

سێیەم: جنێودان بە دین و گاڵتە کردن بە شتێک لە قورئان و سوننەت، وە گاڵتە کردن بەوانەی دەستیان گرتووە بە قورئان و سوننەتەوە گرتووە و جێ بەجێی دەکەن، وەک ڕیش و حیجاب، ئەمەیان کوفرە، ئەگەر موکەلەف ئەمەی کرد دەبێت ئەم کوفرە بۆ ڕوون بکرێتەوە، ئەگەر هەر سوور بوو لەسەر کردەوەی خۆی دوای زانست ئەوا کافرە،

---

[١] فتاوى الشيخ ابن باز (٢٨ / ٣٦٥،٣٦٦ ).

[٢] الفصل في الملل والأهواء والنحل (٣/١٤٢).

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ۝٦٥ لَا تَعْتَذِرُواْ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْۚ﴾ [التوبة: ٦٥-٦٦][١].

**٣-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە دووڕووەکان تووشی کوفر بوون ئەگەر چی دووڕوو لە بنەرەتدا کافر بوون، بەڵام دەکرێت جارێکی تر کوفرەکەیان نوێ بووبێتەوە بە کوفر لەسەر کوفر، هەروەک خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّمَا ٱلنَّسِىٓءُ زِيَادَةٌ فِى ٱلْكُفْرِۖ﴾ [التوبة: ٣٧]

**٤-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە دووڕووەکان تووشی کوفر بوون دوای ئەوەی کە ئیمانیان هێنابوو، مەبەستی ئەوە نیە دووڕوو ئیماندارە بەڵکو ماناکەی بەم شیوەیەیە:

- ئێوە کافر بوون دوای ئەوەی ئیمانتان بەدیارخستبوو.

- کوفری ئێوە بەدیار کەوت بۆ ئیمانداران دوای ئەوەی ئێوە لای ئەوان موسڵمان بوون.

**٥-** لەگەڵ ئەوەش توندترین و گەورەترین کوفر گاڵتە کردنە بە خوا و دینی خوا و

پێغەمبەران، بەڵام تەوبەی بۆ هەیە ئەگەر بگەڕێتەوە، چونکە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِنْ نَعْفُ عَنْ طَائِفَةٍ مِنْكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ﴾.

[١] مجموع فتاوى اللجنة الدائمة بالسعودية - المجلد الخامس عشر (العقيدة).

**عن ابن عمر، ومحمد بن كعب، وزيد بن أسلم، وقتادة – دخل حديث بعضهم في بعض - : أنه قال رجل في غزوة تبوك: ما رأينا مثل قرائنا هؤلاء، أرغب بطونا، ولا أكذب ألسنا، ولا أجبن عند اللقاء ـ يعني رسول الله (ﷺ) وأصحابه القراء ـ فقال له عوف بن مالك: كذبت، ولكنك منافق، لأخبرن رسول الله (ﷺ). فذهب عوف إلى رسول الله (ﷺ) ليخبره فوجد القرآن قد سبقه. فجاء ذلك الرجل إلى رسول الله (ﷺ) وقد ارتحل وركب ناقته، فقال: يا رسول الله! إنما كنا نخوض ونتحدث حديث الركب، نقطع به عنا الطريق.**

**فقال ابن عمر: كأني أنظر إليه متعلقا بنسعة ناقة رسول الله (ﷺ)، وإن الحجارة تنكب رجليه – وهو يقول: إنما كنا نخوض ونلعب – فيقول له رسول الله (ﷺ): ﴿أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِؤُنَ﴾ ما يلتفت إليه وما يزيده عليه[١].**

واتە: ابن عمر و محمد بن كعب و زيد بن أسلم و قتادة دەگێڕنەوە كە كۆی فەرموودەكان بەم جۆرەیە: لە غەزای تەبوكدا پیاوێک گوتی: کەسمان نەبینیووە وەک ئەم قورئان خوێنانە ورگ زل و درۆزن و ترسنۆک بن لە جەنگدا، مەبەستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵانی بوو، عەوفی كوڕی مالیک كە لەو مەجلیسە ئامادەبوو پێی گوت: درۆت كرد بەڵكو تۆ دووڕوویت، سوێند بەخوا دەڕۆم بۆ پێغەمبەری خوای دەگێڕمەوە.

ئینجا عەوف چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئەوەی ئاگاداری بكاتەوە، دەبینێ پێش ئەوەی بگاتە ئەوێ قورئان دابەزیوە.

[١] أخرجه ابن جرير في (التفسير) (١٠/١٧٢-١٧٣).

ئەوجا پیاوەکە چوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) لەو کاتە دەبینێ پێغەمبەری خوا شوێنەکەی جی هێشتووە و سواری وشترەکەی بوە.

پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە ئەو قسانەمان تەنها بۆ خۆشی و گاڵتە کردووە، ماندوو بوونی ڕێگەمانی پێ لەبیر دەبەینەوە.

ابن عمر دەفەرموویێت: لەبەر چاومە ئەو پیاوە خۆی بە قایشی ژێر سکی وشتری پێغەمبەرەوە هەڵواسی بوو، بەدەم ڕێوە قاچی لە بەردەڵان هەڵدەکەوت و دەیگوت: ئێمە تەنها کاتمان بەو گوتانە بەسەر بردوە و گاڵتەمان کردوە واتە بە ڕاستمان نەبوە.

پێغەمبەریش (ﷺ) لە وەڵام دا ئەو ئایەتەی خوێندەوە: (ئایا بەخوا و بە ئایەت و بە نیشانەکانی و بە پێغەمبەرەکانی گاڵتەجاڕی و سوکایەتی دەکەن، هیچ عوزرێک مەهێننەوە و لێتان قبوڵ ناکرێت، ئێوە کافر بوون دوای ئەوە کە ئیماندار بوون، پێغەمبەر (ﷺ) نە لای کردەوە بەلایاندا و نە لەوە زیاتری پێیان گوت).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(عن ابن عمر، ومحمد بن كعب، وزيد بن أسلم، وقتادة):** سێیان تابعین و ابن عمر صحابی یە، کەواتە ڕیوایەتی ابن عمر مەرفوعە و ئەوانی تر مرسلن.

**(قرائنا هؤلاء):** واتە: وەک ئەم قورئان خوێنانە، مەبەست پێی پێغەمبەر و هاوەڵان بوو.

**(بنسعة ناقة):** واتە: خۆی بە قایشی ژێر سکی وشتری پێغەمبەرەوە هەڵواسی بوو.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە گاڵتە کردن بە خوا و پێغەمبەری خوا و دینی خوا کوفرە.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک گاڵتە بەخوا و پێغەمبەری خوا و قورئان بکات هەڵگەڕاوەتەوە لە ئیسلام و نەفی تەوحید دەکات، ئەمە رووی باسکردنی ئەم فەرموودەیەیە لەم بابە لەبەر ئەوە دانەری کتاب ئەمەی باسکردوە)[١].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە ئینکاری خراپە بکرێت، چونکە عەوفی کوڕی مالک خوا لێی ڕازی بێت ئینکاری کرد و پێغەمبەریش (ﷺ) دانی پێنا لەسەر ئەمە)[٢].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک ئینکاری کوفرو شیرک نەکات کافرە، واجبە لەسەر ئیماندار ئەگەر گوێی لە گاڵتە کردن بوو بە دین یان شتێکی بینی کە گاڵتە کردن بێت بە دین، دەبێت بە توندی ئینکاری بکەر بکات، ئەگەر نەیتوانی دەبێت شوێنەکە جێ بهێڵێت، چونکە خوا دەفەرموویت: ﴿وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا﴾ {النساء:١٤٠}.

سەبارەت بە زەردەخەنە و پێکەنین لە کاتی گوێ لێ بوونی گاڵتە کردن بە دین خاوەنەکەی شەریکە لە تاوان و ڕازی بوون و قبوڵ کردنی ئەم کوفرە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ﴾، سەبارەت بەوەی ئەگەر ڕازی نەبێت و قبووڵی نەکات ئەوا تووشی تاوانێکی گەورە بووە و بەڵگەیە گەورەیی شەعائیری دینی خوای وەک پێویست لە دڵدا جێگیر نەبوە، واجبە لەسەر ئیماندار شەعائیری دینی خوا وئایەتەکان بە

---

[١] اعانة المستفيد (٢٦٥/٢).

[٢] إعانة المستفيد (٢٦٦/٢).

گەورە دابنێت، هەروەک خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمَنْ يُعَظِّمْ شَعَائِرَ اللَّهِ فَإِنَّهَا مِنْ تَقْوَى الْقُلُوبِ﴾.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (هەر کەسێک ئینکاری کوفرو شیرک نەکات کافرە، چونکە ئەوەی قسەی کرد لەم مەجلیسە یەک کەس بوو، خوای گەورە ئەم کردەوەیەی داوەتە پاڵ هەمووان و دەفەرموویێت: ﴿قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ. لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾، چونکە ئەوەی ڕازی یە وەک بکەر وایە، ئەمەش ترسناکییەکی گەورەیە)[1].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ڕێزگرتن لە ئەهلی عیلم و گاڵتە پێ نەکردنیان، باس کردنی بانگخوازو زانایان بە خراپە و گاڵتە پێ کردنیان کەمترین شتی ئەوەیە بڵێین یەکێکە لە تاوانە گەورەکان و حاڵەت هەیە گاڵتە پێ کردنیان دەگاتە کوفر پەنا بەخوا.

حاڵەتی کوفر: هەر کەسێک گاڵتە بە زانایان بکات و بە خراپی باسیان بکات لەبەر ئەوەی ئیمانی هێناوە و بانگەواز بۆ حەق و دین دەکات، ئەوا تووشی کوفر بووە، چونکە گاڵتە پێ کردن و بە خراپە باس کردنیان بۆ دین دەگەڕێتەوە، گاڵتە بە دین دەکات نەک بە خودی کەسەکە، هەروەک چۆن ئەگەر کەسێک ئیماندارێک بکوژێت لەبەر ئەوەی ئیمانی هێناوە بەم کوشتنە تووشی کوفر بووە، زانایان دەڵێن هیچ موسڵمانێک بە کوشتن کافر نابێت ئیلا لە دوو حاڵەت نەبێت:

---

[1] إعانة المستفيد (٢/٢٦٦).

حاڵەتی یەکەم: کەسێک کەسێکی موسڵمان دەکوژێ و کوشتنی بەحەڵاڵ دەزانێ، ئەو کات حەڵاڵ کردنی هەر حەڕامێک یان حەڕام کردنی هەر حەڵاڵێک بێ بەڵگە یان بێ تاویل کوفرە.

حاڵەتی دووەم: کەسێک کەسێک دەکوژێ لەبەر ئیمان، چونکە ئیمانی هێناوە.

ئیمام ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (گۆشتی زانایان ژەهراوییە هەرکەسێک بۆنی بکات نەخۆش دەکەوێت و هەر کەسێک بیخوات دەمرێت).

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (لا تسبوا الديك فإنه يوقظ للصلاة). رواه ابو داود.

واتە: (جنێو بە کەڵەباب مەدەن، چونکە خەڵک بەئاگا دێنێت بۆ نوێژی بەیانی).

ئەی چۆن دەبێت جنێو بە زانایان بدەیت کە میراتگری پێغەمبەرانن و بانگەوازی خەڵک دەکەن بۆ ڕێگای ڕاست و خەڵک بەئاگا دێنن بۆ هەموو نوێژەکان و هەموو دەرگاکانی خێر و چاکە؟! بەداخەوە ئەوانەی ئەمڕۆ جنێو بە زانایانی ئەهلی سوننە دەدەن و کافریان دەکەن، هەر ئەمانەن موسڵمانانیش کافر دەکەن و خوێنیان دەڕێژن و دینیان لە پێش چاوی خەڵک ناشرین کردووە و پیشەیان بۆتە باسکردنی خەڵک، دەڵێن گرینگترین شت بیروباوەڕە کەچی لە بیروباوەڕیشدا شارەزا نین، بیروباوەڕێکی پووچ و دوور لە بەزەیی و دڕندانەیان هەیە پەنا بەخوا.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ڕێزگرتن لە ئەهلی عیلم و گاڵتە پێ نەکردنیان، چونکە دووڕووەکان گوتیان: (کەسمان نەبینیوە وەک ئەم قورئان خوێنانە)، مەبەست پێی زانایەکان بوو، زانایان میراتگری پێغەمبەرانن و پێشەنگن بۆ خەڵک، ئەگەر تانە و تەشەر لە زانایان بدەن ئەوا خەلەل دەکەوێتە کۆمەڵگای ئیسلامی و پلە و پایەی زانایان کەم دەبێتەوە و ئاڵۆزی دروست دەبێت.

گوێمان لێ دەبێت هەندێک بانگخوازی خراپ دەڵێن: (ئەمانە زانای حەیز و نیفاسن، ئەمانە زانای بەکرێ گیراوی کاربەدەستانن)، شتی تری وەک ئەمانە دەڵێن, زانایان هیچ تاوانیان نیە لای ئەو فاسقانە ئیلا ئەوە نەبێت یەک نین لەگەڵ مەنهەجە خراپەکەیان)[1].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ موعجیزەیەک لە موعجیزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بە جۆرێک وەحی پێی گەیشت پێش ئەوەی عەوفی کوری مالک بگات بە پێغەمبەر، ئەمەش بەراست دانەری ئەم وتەی خوای گەورەیە: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ٣ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ٤﴾ [النجم: ٣-٤][2].

**٦-** زەم کردن و جنێودان بە هاوەڵان کوفرە، زانایان دەڵێن جنێو دان بە هاوەڵان ئەم پێنج حاڵەتەیە:

یەکەم: ئەگەر جنێو بە هەندێک لە هاوەڵان بدات و طعن لە دینداری یەکەی و عەدالەتی بدات، ئەگەر ئەو هاوەڵانە لەوانە بن کە بە متواتری دەق لەسەر فەزڵ و باشی یەکانیان هاتبێت، ئەوە کوفر و نیفاق و سنور بەزاندنە، وە ئەو زانایانەی دەڵێن کافر نابێت هەموویان یەک دەنگن کە دەبێت سزا بدرێت و تەمبێ بکرێت، نابێت چاوپۆشی لێی بکرێت و عەفو بکرێت بە هیچ شێوەیەک

دووەم: ئەگەر جنێو بە هەندێک لە هاوەڵان بدات و طعن لە دین و عەدالەتیان بدات، ئەگەر ئەو هاوەڵانە لەوانە نەبوون کە بە متواتری دەق لەسەر فەزڵ و باشی یەکانیان هاتبێت، زۆربەی زانایان دەڵێن کوفر نیە.

---

[1] إعانة المستفيد (٢/٢٦٦-٢٦٧).

[2] إعانة المستفيد (٢/٢٦٧).

محمدی بن عبدالوهاب ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەگەر ئەو هاوەڵە لەوانە نەبوو کە بە متواتری دەق نەقل کرا بێت بۆ فەزڵ و باشییەکەی، ئەوەی دیار بێت جنێو پێدانی فاسقی یە، مەگەر جنێو پێی بدات لەبەر ئەوەی هاوەلایەتی پێغەمبەری خوای کردووە، ئەوە کوفرە).

سێیەم: ئەگەر کەسێک جنێو بە هەندێک لە هاوەڵان بدات و بەحەلاڵی بزانێت ئەوا کوفرە، چونکە حەڵاڵ کردنی هەر حەڕامێک و حەڕام کردنی هەر حەلاڵێک بێ بەڵگە و شوێن هەواو ئارەزوو کەوتن کوفر .

چوارەم: کەسێک جنێو بە هەندێک یان هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر بدات لەبەر ئەوەی هاوەڵایەتی پێغەمبەریان کردووە ئەمە کوفرە.

پێنجەم: ئەگەر کەسێک جنێو بە هەندێک هاوەڵان بدات و طعن لە دین و عەدالەتی نادات، وەک ئەوەی وەسفی بکات بە ترسنۆک و بەخیل و کەم زانست و کەم زوهد، ئەمەیان کوفر نیە بەڵام دەبێت سزا بدرێت و تەمبێ بکرێت

ابن تیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (بەڵام ئەگەر جنێویان پێ بدات لە دین و عەدالەتی نەبێت، وەک وەسف کردنی هەندێکیان بە بەخیلی و ترسنۆکی و کەم زانستی و کەم زوهدی، ... هتد، ئەوا شایستەی سزا دان و تەمبێ کردنە، حوکمی کوفر نادەین بەسەری)[1].

---

[1] الصارم المسلول لاپەڕە (٥٨٦-٥٨٧).

هەیتەمی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بە جنێودان بە هەندێک لە هاوەڵان، سەبارەت بەوەی جنێو بە هەموو هاوەڵان دەدات، گومانی نیە لە کوفرەکەی (واتە: ئەوەی جنێو بە هەموو هاوەڵان دەدات))[1].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (هەر کەسێک سنوور ببەزێنێت و بڵێت: هاوەڵان هەموویان هەڵگەڕاونەتەوە ئیلا یازدە تا بیست کەس نەبێت، یان زۆرینەیان کافرن، ئەمەیان کوفرەکەی گومانی تێدا نیە، چونکە دەقی قورئانی بەدرۆ خستۆتەوە کە خوای گەورە لە چەندین جێگا مەدحیان دەکات)[2].

---

[1] الصواعق المحرقه لاپەڕە (٣٧٩).

[2] القول المفید (٤٣/٣).

## باب ما جاء في قول الله تعالى:

﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِن بَعْدِ ضَرَّاء مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَذَا لِي﴾ {فصلت:٥٠}.

قال مجاهد: هذا بعملي وأنا محقوق به. وقال ابن عباس: يريد من عندي.

وقوله: ﴿قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي﴾ قال قتادة: على علم مني بوجوه المكاسب. وقال آخرون: على علم من الله أني له أهل. وهذا معنى قول مجاهد: أوتيته على شرف.

وعن أبي هريرة رضي الله عنه أنه سمع رسول الله (ﷺ) يقول: (إن ثلاثة من بني إسرائيل: أبرص، وأقرع، وأعمى. فأراد الله أن يبتليهم، فبعث إليهم ملكا، فأتى الأبرص، فقال: أي شيء أحب إليك؟ قال: لون حسن، وجلد حسن، ويذهب عني الذي قد قذرني الناس به قال: فمسحه، فذهب عنه قذره، وأعطي لونا حسنا وجلدا حسنا.

قال: فأي المال أحب إليك؟ قال: الإبل أو البقر ـ شك إسحاق ـ فأعطي ناقة عشراء، وقال: بارك الله لك فيها.

قال: فأتى الأقرع، فقال أي شيء أحب إليك قال: شعر حسن، ويذهب عني الذي قد قذرني الناس به فمسحه، فذهب عنه، وأعطي شعرا حسنا، فقال: أي المال أحب إليك؟ قال: البقر، أو الإبل، فأعطي بقرة حاملا، قال: بارك الله لك فيها.

فأتى الأعمى، فقال: أي شيء أحب إليك؟ قال: أن يرد الله إلي بصري؛ فأبصر به الناس، فمسحه، فرد الله إليه بصره، قال: فأي المال أحب إليك؟ قال: الغنم، فأعطي شاة والداً؛ فأنتج هذان وولد هذا، فكان لهذا وادٍ من الإبل، ولهذا وادٍ من البقر، ولهذا واد من الغنم.

**قال: ثم إنه أتى الأبرص في صورته وهيئته، فقال: رجل مسكين، قد انقطعت بي الحبال في سفري، فلا بلاغ لي اليوم إلا بالله ثم بك، أسألك بالذي أعطاك اللون الحسن، والجلد الحسن، والمال، بعيرا أتبلغ به في سفري، فقال: الحقوق كثيرة.**

**فقال له: كأني أعرفك، ألم تكن أبرص يقذرك الناس، فقيرا، فأعطاك الله عز وجل المال؟ فقال: إنما ورثت هذا المال كابرا عن كابر، فقال: إن كنت كاذبا فصيرك الله إلى ما كنت.**

**قال: وأتى الأقرع في صورته، فقال له مثل ما قال لهذا، ورد عليه مثل ما رد عليه هذا، فقال: إن كنت كاذبا فصيرك الله إلى ما كنت.**

**وأتى الأعمى في صورته، فقال: رجل مسكين وابن سبيل، قد انقطعت بي الحبال في سفري، فلا بلاغ لي اليوم إلا بالله ثم بك. أسألك بالذي رد عليك بصرك شاة أتبلغ بها في سفري، فقال: كنت أعمى فرد الله إلي بصري، فخذ ما شئت ودع ما شئت، فوالله لا أجهدك اليوم بشيء أخذته لله. فقال: أمسك مالك، فإنما ابتليتم فقد رضي الله عنك، وسخط على صاحبيك) أخرجاه[1].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير الآية.

**الثانية:** ما معنى: ﴿لَيَقُولَنَّ هَذَا لِي﴾.

---

[1] أخرجه البخارى (٣٤٦٤)، ومسلم (٢٩٦٤).

**الثالثة:** ما معنى قوله: ﴿أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِى﴾.

**الرابعة:** ما في هذه القصة العجيبة من العبر العظيمة

## باب ما جاء في قول الله تعالى:
## ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِن بَعْدِ ضَرَّاء مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَذَا لِي﴾ {فصلت:٥٠}.

تەفسیری ئەو ئایەتەی خوای گەورە دەفەرموویت: (سوێند بە خوا ئەگەر ئادەمیزاد خێرو خۆشی بەسەردا برِێژین و پێ بچێژین لە دوای ئەو تەنگانەیەی کە تووشی هاتبوو، بە متمانەیەکی زۆرەوە دەڵێت: ئەمە بە رِەنجی شانی خۆم پەیدام کردووە و خوا خۆشی دەویم، وا بزانم قیامەت زۆر دوورە و رِەنگە هەر نەشبێت، خۆ ئەگەر بمگێرنەوە بۆ لای پەروەردگارم، ئەوا دڵنیام کە خۆشی و ناز و نیعمەتم لای ئەو بۆ ئامادەیە، بێگومان ئەوانەی کە بێ باوەرِ بوون ئەو کارو کردەوە ناشیرینانەیان دەخەینە رِوو و هەواڵیان پێ دەدەین، هەروەها سزای سەخت و دژوارو ناخۆشیان پێ دەچێژین لە ناو دۆزەخدا).

دانەری کتاب بۆ ئەم ئایەتە سێ تەفسیری باسکردووە.

**قال مجاهد: هذا بعملي وأنا محقوق به.**

واتە: موجاهد دەفەرموویت: (هَذَا لِي)، واتە: ئەمە بەهۆی کار و کاسبی و شارەزایی و کردەوەی خۆمەوە دەستم کەوتووە، خۆشم شایستەی ئەو نیعمەتانەم.

**وقال ابن عباس: يريد من عندي.**

ابن عباس دەفەرموویت: (هَذَا لِي)، واتە: ئەمانە بەهۆی کردەوەی خۆم بە دەستم هێناوە و تیایدا ماندوو بووم.

**وقوله:** ﴿قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِى﴾، **قال قتادة: على علم مني بوجوه المكاسب. وقال آخرون: على علم من الله أني له أهل. وهذا معنى قول مجاهد: أوتيته على شرف.**

واتە: خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِي﴾، قەتادە لەبارەی تەفسیری ئەو ئایەتەوە دەفەرمووێت: خوا لەبەر ئەوە ئەو سەروەت و سامانەی پێم داوە چونکە دەزانم چۆن کاسبی دەکەم.

هەندێک لە پێشینان گوتویانە واتە کە ئەم نیعمەتانەم پێدراوە لەبەر ئەوەیە کە خوا عیلمی هەبووە کە من شایستەی ئەم شتانەم، ئەمەش هەمان مانای تەفسیرەکەی موجاهیدە کە دەفەرمووێت: لەبەر ئەوە پێم دراوە کە من خاوەنی پلە و پایەی بەرز و ڕێزدارم.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (مرۆڤ ئەگەر نیعمەت بداتە پاڵ کردەوە و کەسابەتی خۆی، ئەوا ئەمەیان جۆرێک لە جۆرەکانی شیرکی تێدایە لە پەروەردگاریەتیدا، ئەگەر بیداتە پاڵ خوا بەڵام بڵێت من شایستەی ئەوەم ئەوەی خوا بەمنی داوە فەزڵێکی سافی تێدا نیە، بەڵکو منیش شایستەی ئەوەم ئەمەیان جۆرێک لە جۆرەکانی خۆ بەگەورە دانان و بەرز زانینی تێدایە لە لایەنی عبودییەت)[1].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم بابە وەک بابەکانی پێشووترە بۆ ڕوونکردنەوەی بەگەورە دانانی خوای گەورە لە وتەدا و دەبێت نیعمەت بدرێتە پاڵ خوای گەورە و سوپاسی بکرێت، بەندە دەڵێت خوای گەورە نیعمەتی لەگەڵم کردووە بە فلانە شت، درۆکردن لەم بابەتە یان قسەکردن سەبارەت بە شتێک کە موافقی حەقیقەت نەبێت، یان پێچەوانەی ئەوە بێت کە خوای گەورە نیعمەتی لەگەڵت کردووە، ئەمە سەردەکێشێت بۆ بە هیلاک چوون و خوای گەورە نیعمەتت لەسەر لادەدات بەهۆی ئەم وتەیە.

واجبە لەسەر بەندە خۆی بپارێزێت لەم وتانە بەتایبەت ئەوانەی پەیوەندییان بە خوا یان بە ناو و سیفەتەکان یان کردەوە و نیعمەتەکانی یان دادپەروەری و حیکمەتەکانییەوە هەیە،

---

[1] القول المفيد.

خۆپاراستن لەم شتانە لە تەواوی تەوحیدە، چونکە خۆپاراستن لەم شتانە نایێتە دی مەگەر لە دڵێک خوای بە گەورە دانابێت و بەردەوام ڕووی لەو بێت، دەزانێت خوای گەورە باڵادەستە بەسەری و خاوەنی فەزڵ و چاکەیە، ئەو شایستەیە بە گەورە دابنرێت و لەسەرووی هەمووان بێت، هەروەها زیاتر لە هەموو خۆشویستراوەکان خۆشت بوێت و بە گەورەی دابنێیت بەسەرهەموو بە گەورە دانراوەکان)[1].

## ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ﴾: ضمیر بۆ مرۆڤ دەگەڕێتەوە و مەبەست پێی جنسە، وتراوە مەبەست پێی کافرە، بەڵام ئەوەی دیار بێت مەبەست پێی جنسە.

﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ رَحْمَةً مِنَّا﴾: لەم ئایەتە بە (الإذاقة) دەری بڕیوە نەک (الإيتاء)، چونکە بەهێزترە بۆ سوود وەرگرتن لە شتەکە.

﴿منا﴾: دراوەتە پاڵ خوای گەورە، لەبەر ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە لە خواوەیە و لەبەر تەواوی منەتی خوای گەورە بەسەر بەندەکانی.

﴿لَيَقُولَنَّ هَذَا لِي﴾: ئەمە کوفرە بە نیعمەتەکانی خوای گەورە و سەرسام بوونە بە نەفس.

## هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

قەرعاوی دەفەرموویێت: (ئایەتەکە بەڵگەیە نیعمەت دانە پاڵ بێجگە لەخوا کوفرە و شیرکە لە پەروەردگاریەتیدا)[2].

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٤٦٣-٤٦٤).

[2] الجديد لاپەڕە (٣٩٤).

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە نیعمەت دانە پاڵ بێجگە لەخوا زەمکراوە، واجبە لەسەر بەندە هەموو نیعمەتەکان بداتە پاڵ خوای گەورە و هەست بەوە بکات خۆی شایستەی هیچ نیە، بەڵکو تەنها خوا شایستەی بەندایەتی کردن و سوپاس کردن و بەگەورە دانانە، بەندە هەژارە و تاوانبارە ئەگەر چی پلەی چەند بەرز بێت، سەیری حالی ئەبوبەکر بکە پێغەمبەر (ﷺ) چۆن فێری کرد لە کۆتایی نوێژدا ئەم دوعایە بکات: (اللهم إني ظلمت نقسي ظلما كثيرا، ولايغفر الذنوب إلا أنت، فاغفر لي)، ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) ئەبوبەکری فێری ئەم دوعایە کردبێت بۆ ئەوەی بیڵێت، ئەی دەبێت حاڵی ئێمەی هەژار چۆن بێت، چۆن دەبێت گومان ببەیت بەسەر خوا کە شایستەی فڵانە شتی[1].

[1] التمهيد لاپەڕە (٤٦٥-٤٦٦).

وعن أبي هريرة رضي الله عنه أنه سمع رسول الله (ﷺ) يقول: (إن ثلاثة من بني إسرائيل: أبرص، وأقرع، وأعمى. فأراد الله أن يبتليهم، فبعث إليهم ملكاً، فأتى الأبرص، فقال: أي شيء أحب إليك؟

قال: لون حسن، وجلد حسن، ويذهب عني الذي قد قذرني الناس به قال: فمسحه، فذهب عنه قذره، وأعطي لونا حسنا وجلدا حسنا، قال: فأي المال أحب إليك؟

قال: الإبـل أو البقر ـ شك إسحاق ـ فأعطي ناقة عشراء، وقال: بارك الله لك فيها.

قال: فأتى الأقرع، فقال أي شيء أحب إليك قال: شعر حسن، ويذهب عني الذي قد قذرني الناس به فمسحه، فذهب عنه، وأعطي شعرا حسنا، فقال: أي المال أحب إليك؟ قال: البقر، أو الإبل، فأعطي بقرة حاملا، قال: بارك الله لك فيها.

فأتى الأعمى، فقال: أي شيء أحب إليك؟ قال: أن يرد الله إلي بصري؛ فأبصر به الناس، فمسحه، فرد الله إليه بصره، قال: فأي المال أحب إليك؟

قال: الغنم، فأعطي شاة والدا؛ فأنتج هذان وولد هذا، فكان لهذا وادٍ من الإبل، ولهذا واد من البقر، ولهذا واد من الغنم، قال: ثم إنه أتى الأبرص في صورته وهيئته. فقال: رجل مسكين، قد انقطعت بي الحبال في سفري، فلا بلاغ لي اليوم إلا بالله ثم بك، أسألك بالذي أعطاك اللون الحسن، والجلد الحسن، والمال، بعيرا أتبلغ به في سفري، فقال: الحقوق كثيرة.

فقال له: كأني أعرفك، ألم تكن أبرص يقذرك الناس، فقيرا، فأعطاك الله عز وجل المال؟ فقال: إنما ورثت هذا المال كابرا عن كابر، فقال: إن كنت كاذباً فصيّرك الله إلى ما كنت.

**قال: وأتى الأقرع في صورته، فقال له مثل ما قال لهذا، ورد عليه مثل ما رد عليه هذا، فقال: إن كنت كاذبا فصيرك الله إلى ما كنت.**

**وأتى الأعمى في صورته، فقال: رجل مسكين وابن سبيل، قد انقطعت بي الحبال في سفري، فلا بلاغ لي اليوم إلا بالله ثم بك. أسألك بالذي رد عليك بصرك شاة أتبلغ بها في سفري، فقال: كنت أعمى فرد الله إلي بصري، فخذ ما شئت ودع ما شئت، فوالله لا أجهدك اليوم بشيء أخذته لله. فقال: أمسك مالك، فإنما ابتليتم فقد رضي الله عنك، وسخط على صاحبيك) أخرجاه.**

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە خوا لێی رازی بێت دەفەرمووێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) فەرمووی: (سێ کەس هەبوون لەناو نەوەکانی ئیسرائیلدا، بەڵەکێک و کەچەڵێک و کوێرێک.

خوای گەورە ویستی تاقیان بکاتەوە، لەبەر ئەوە فریشتەیەکی نارد بۆ لایان "لە شێوەی مرۆڤدا"، چوو بۆ لای بەڵەکەکە و گوتی: حەز لە چ شتێک دەکەیت، گوتی: ڕەنگی جوان و پێستێکی جوان، ئەم نەخۆشیەشم پێوە نەمێنێت کە خەڵکی بەهۆیەوە قێزم لێ دەکەنەوە.

فەرمووی ئەوجا فریشتەکە دەستی هێنا بە گیانیدا و بەڵەکییەکەی نەما و پێستێکی جوانیشی پێدرا، ئینجا فریشتەکە گوتی: پاشان حەزت لە چ جۆرەماڵێکە؟

ئەویش گوتی: وشتر یان مانگا (ئیسحاق راوی فەرموودەکە گومانی هەبوو کامەی گوت)، ئینجا وشترێکی ئاوسی پێدرا، فریشتەکە گوتی: خوا بەرەکەتی تێ بکات بۆت.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئیجا چوو بۆ لای پیاوە کەچەڵەکە و پێی گوت: چ شتێکت پێ خۆشە؟

ئەویش گوتی: قژێکی جوان، ئەم نەخۆشیەشم پێوە نەمێنێت کە بە هۆیەوە خەڵکی بێزم لێ دەکەنەوە، فەرمووی: ئەوجا فریشتەکە دەستی هێنا بە سەریدا و نەخۆشیە پیسەکەی نەما و قژێکی جوانی پێدرا، پاشان فریشتەکە گوتی: ئەی چ ماڵێکت پێ خۆشە پێت بدرێت؟

گوتی: مانگا یان وشتر، مانگایەکی ئاوسی پێدرا و فریشتەکەش گوتی: خوا بەرەکەتی تێ بخات.

پاشان چووە لای کوێرەکە و گوتی: چ شتێکت پێ خۆشە؟

گوتی: خوا هەردوو چاوەکانم پێ بداتەوە و دروستکراوەکانی پێ ببینم، ئەویش دەستی بە چاوەکانیدا هێنا و چاک بووەوە، فریشتەکە گوتی: ئەی چ ماڵێکت پێ خۆشە پێت بدرێت؟

گوتی: مەڕ، ئیجا مەڕی ئاوسی پێدرا.

پاشان وشتر و مانگا و مەڕەکان کەوتنە زاوزێ، یەکێکیان بوو بە خاوەنی دۆڵێک وشتر، ئەوی تریان بوو بە خاوەنی دۆڵێک مانگا، ئەوەی تریان بوو بە خاوەنی دۆڵێک مەڕ.

پاشان فریشتەکە ڕۆیشتەوە بۆ لای پیاوە بەڵەکەکە لە شێوە و شکلی جاران، گوتی: پیاوێکی هەژار و ڕێبوارم و دوورە ولاتم ناتوانم بگەڕێمەوە ولاتی خۆم، مەگەر خوا یارمەتیم بدات پاشان تۆش یارمەتیم بدەیت.

لەبەر ئەو خوایەی کە ڕەنگی جوان و ماڵ و سامانی پێداویت، داوات لێ دەکەم وشترێکم پێ بدەیت تا پێی بگەڕێمەوە ولاتی خۆم.

لەوەڵامدا گوتی: حەق و حقوقی زۆرم لەسەرە، جا هەر کەسێک بێت و پێی ببەخشم خۆم هیچم بۆ نامێنێتەوە، ئەویش گوتی: ڕێک دەتناسمەوە، ئەرێ تۆ بەڵەکە نەبوویت خەڵکی بێزیان لێت دەکردەوە ئەرێ هەژار نەبوویت خوا ماڵ و سامانی بەتۆ بەخشی؟ ئەویش گوتی: نەخێر ئەم ماڵ و سامانە لە باب و باپیرانمەوە کە گەورە و بەرێز بوون پشتا و پشت بۆم ماوەتەوە.

فریشتەکە گوتی: ئەگەر درۆ بکەیت لە پێشدا چۆن بوویت، دەک خوا وات لێ بکاتەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوجا چوو بۆ لای کەچەڵەکە چی بەو گوت هەمان چیرۆک و باسیشی لەگەڵ ئەمیشدا دامەزراند، ئەمیش هەروەک ئەو وەڵامی دایەوە و بە ئەمیشی گوت: ئەگەر درۆ بکەیت لەمەوبەر چۆن بوویت دەک خوای گەورە ئاوات لێ بکاتەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: پاشان چوو بۆلای چاو کوێرەکە لە شێوەی پیاوێکی کوێردا و گوتی: پیاوێکی هەژار و ڕێبوارم و دوورە ولاتم، ناتوانم بگەرێمەوە بۆ ولاتی خۆم، مەگەر خوا یارمەتیم بدات پاشان تۆش یارمەتیم بدەیت، لەبەر ئەو خوایەی کە چاوتی پێ دایەوە مەڕێکم پێبدە، تا لە سەفەرمدا سەرفی بکەم و بگەڕێمەوە شوێنی خۆم.

پیاوەکە گوتی: من کوێر بووم خوا چاوی دایەوە پێم جا تۆش هەر چیت دەوێت ببە، سوێند بەخوا هەرچی ببەیت چ کەم و چ زۆر دەستت ناگرم، ئەمەشم تەنها بۆ ڕەزامەندی خوایە.

فریشتەکەش گوتی: دەست بگرە بە ماڵی خۆتەوە، ئێوە تاقی کرانەوە ئەوا خوا لەتۆ ڕازی بوو، لە دوو هاوەڵەکەشت تووڕە بوو.

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(أبرص):** واتە: گەروگۆلێک.

**(وأقرع):** واته: کەچەڵێک.

**(وأعمى):** واته: کوێرێک.

**(شعر حسن):** واته: قژێکی جوان، تەنها داوای قژی نەکرد بەڵکو داوای قژێکی جوانی کرد.

**(شاة والدا):** واته: نزیکە لەدایک بێت، ئەوانی تر حامل بوون.

**(کابر عن کابر):** ئەم دەقە دوو ئەگەری هەیە:

١- ئەم ماڵ و سامانە لە باب و باپیرانمەوە پشتا و پشت بۆم ماوەتەوە.

٢- لەوانەیە مەبەستی پێ معنوي بێت، واتە ئێمە کەسانی بە شەرەف و گەورە بووین لە ئەسڵدا ئەم ماڵەمان هەبوو.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە نیعمەت دانە پاڵ خوای گەورە لە تەوحیدە و نیعمەت دانە پاڵ بێجگە لەخوا کوفرە.

## سوودەکانی فەرموودەکە:

١- ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە چیرۆکی نەوەی ئیسرائیل بگێڕیتەوە بۆ ئەوەی پەند و ئامۆژگاری لێی وەربگرین ئەگەر پێچەوانەی شەرع نەبێت.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (پێغەمبەر (ﷺ) چیرۆکی نەوەی ئیسرائیلمان بۆ دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی پەند و ئامۆژگاری لێ وەربگرین، ئەمە یەکێکە لە

بەڵگەی ئەوانەی کە دەڵێن شەرعی پێشتر شەرعە بۆ ئێمەش تا ئەگەر پێچەوانەی شەرعی ئێمە نەبێت، بێگومان ئەمە قاعیدەیەکی ڕاستە)[1].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ڕوونکردنەوەی توانای خوای گەورە بە چاک بوونەوەی بەڵەک و کوێر و کەچەڵ بە یەک مەسحی فریشتە)[2].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە فریشتەکان شێوەی خۆیان دەگۆڕن هەتا خۆیان دەخەنە سەر شێوەی مرۆڤ، لەبەر وتەی: (فأتى الأبرص على صورته)، هەروەها کەچەڵ و کوێریش بە هەمان شێوە، بەڵام ئەمە بەدەست خۆیان نیە بەڵکو بە فەرمانی خوای گەورە شێوەی خۆیان دەگۆڕن[3].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە فریشتەکان لاشەن نەک تەنها ڕوح بن یان تەنها هێزبن[4].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ڕازی بوون بە قەدەری خوای گەورە سوننەتە نەک واجب بێت.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجب نیە ڕازی ببیت بە قەزای خوای گەورە، چونکە ئەوەی ئەمانە تووشی ببوون گوتیان: ئێمە فڵان و فڵان شتمان پێ خۆشە، بەڵگەیە ڕازی نەبوون.

مرۆڤەکان لە کاتی بەڵاو ناخۆشی دا چوار مقامن (پلەن):

---

[1] القول المفيد (٣/٦٥-٧٠).
[2] القول المفيد (٣/٦٥-٧٠).
[3] القول المفيد (٣/٦٥-٧٠).
[4] القول المفيد (٣/٦٥-٧٠).

- ناڕازی بوون دەردەبڕین و لەخۆدان و بێ شەرعی کردن، ئەمە حەڕامە.

- ئارام گرتن، ئەمە واجبە.

- ڕازی بوون، ئەمەیان سوننەتە.

- سوپاس کردنی خوای گەورە، ئەمە باشترین شتە)[1].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە دوعا بکەیت پەیوەست بکەیت (واتە: دوعا بکەیت بە (معلقی)، لەبەر وتەی: (إن كنت كاذبا فصيرك الله إلى ما كنت)، لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنْ الْكَاذِبِينَ﴾ {النور:٧}، ﴿وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنْ الصَّادِقِينَ﴾ {النور:٩} هەروەها لە دوعای ئیستیخارە دەفەرموویت: (اللهم إن كنت تعلم...).[2]

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی میرات وەرگرتن لە یەکتری لەناو ئوممەتەکانی پێشتر، لەبەر وتەی (ورثته كابرا عن كابر)[3].

**٨-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی سیفەتی ڕازی بوون و توڕە بوون و ویست بۆ خوای گەورە، ئەهلی سوننە ئەمانە جێگیر دەکەن بۆ خوای گەورە لەسەر ئەو مانایەی کە شایستە و شیاو بێت بۆ خوا لەسەر حەقیقەت[4] .

---

[1] القول المفيد (٣/٦٥-٧٠).
[2] القول المفيد (٣/٦٥-٧٠).

[3] القول المفيد (٣/٦٥-٧٠).
[4] القول المفيد (٣/٦٥-٧٠).

**٩-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هاوڕێیەتی وەک مشاکلە بەکاردێت مەرج نیە مەبەست پێی هاوڕێیەتی کردنی بێت، لەبەر وتەی: (خوای گەورە لە هەردوو هاوڕێکەت توڕە بوو)، هاوڕێ لێرە مەبەست پێی کەسێکە حاڵی وەک حاڵی بێت خوای گەورە نیعمەتی لەگەڵ کردبێت لە تەنگانەدا[١].

**١٠-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە تمثیل دروستە، ئەویش ئەوەیە مرۆڤ تمثیلی حاڵێک دەکات کە چی لە ڕاستیدا لەو حاڵەدا نییە، بەڵام زانایانی ئێستا هەموویان یەک دەنگن کە حەڕامە فلیم لەسەر پێغەمبەران دروست بکرێت جا چ فلیمەکە ڕاستی بێت یان کارتۆن، هەروەها بەتایبەتی پێغەمبەری خۆمان کە باشترینیانە، چونکە فلیم لەسەر دروست کردنیان و ڕۆڵی پێغەمبەر دیتن دەبێتە هۆی بەکەم دانانی پێغەمبەران و نەمانی هەیبەتی پێغەمبەران بەتایبەتی ئەگەر فلیمەکە کارتۆن بێت، یەکێک لە بنچینە گرینگەکانی ئەهلی سوننە ئەوەیە پێغەمبەران بە گەورە دادەنێن بەڵام نەک سنوور ببەزێنن بکەن بەخوا، کە هاوەڵان پێغەمبەریان بە گەورە داناوە و ڕێزیانی لێ گرتووە

هەموو زانایان یەک دەنگن حەڕامە ڕۆڵی پێغەمبەران ببینی و فلیم لەسەریان دروست بکەیت، ئەگەر دەرگا بکرێتەوە ئەمانە ڕاناوەستن لەسەر خوای گەورەش فلیم دروست دەکەن.

سەبارەت بە فلیم دروستکردن لەسەر هاوەڵان و ڕۆڵی هاوەڵان دیتن ئەمەش حەڕامە دەبێتە هۆی بەکەم دانان و گاڵتە پێ کردن و وە سەردەکێشیت بۆ ئەوەی فیلم لەسەر پێغەمبەریش دروست بکەن، ئەوانەی ئەم کارانە دەکەن هەنگاو هەنگاو دێنە پێش ئەگەری زۆری

---

[١] القول المفيد (٣/٦٥-٧٠).

هەیە دەستی کوفریان لەپشت بێت هەروەها ئەوانەی ئەم کارە دەکەن خۆیان تووشی کوفر بوون بە فەرمانی کافرەکان دەجولێنەوە و دژایەتی موسڵمانان دەکەن کە شیعەن.

زانایان اللجنة الدائمة دەڵێن: (تمثیلی هاوەڵان یان یەکێک لە هاوەڵان دروست نیە، چونکە بە کەم دانانی هاوەڵانە و زیانی زیاتری لە دوایە)[1].

سەبارەت بە تمثیل بەشێوەیەکی گشتی هەندێک دەڵێن دروست نییە و حەڕامە کە ئەمە وتەی ابن بازە، وە هەندێک دەڵێن دروستە، بەڵام ئەوانەی دەڵێن دروستە مەرج دادەنێن.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (دروستە تمثیل بکرێت بەڵام بە مەرج:

١- نابێت درۆی تێدا بێت، ئەگەر درۆی تێدا بوو نابێت.

٢- نابێت ڕۆڵی کەسێک ببینی کە حەقی ڕێز گرتنی هەیە، وەک هاوەڵان و زانایان و ئەوانی تری وەک ئەمانە.

٣- دەبێت تەمثیلیەکە سوودی هەبێت و چارەسەری کێشەکان بکات یان هەر سوودێکی تری وەک ئەمە.

٤- نابێت ژن ڕۆڵی پیاو ببینێ و وە پیاو ڕۆلی ژن ببینێت، چونکە لەعنەت کراوە بە خۆ چوواندن بە ژن، هەروەها پێچەوانەش ژن خۆی بچووێنێت بە پیاو.

٥- هەروەها نابێت ڕۆڵی ئاژەل ببینیت، چونکە خوای گەورە باسی خۆ چوواندنی ئاژەل نەکردووە ئیلا بە زەمکردن نەبێت وە هەروەها نابێت ڕۆڵی پێغەمبەریش ببینێت.

٦- هەروەها نابێت ڕۆلی کافر ببینیت، کوفریان دووبارە بکاتەوە).

---

[1] فتاوى اللجنه الدائمه (٧١٢/١).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە تمثیل دروستە، ئەویش ئەوەیە مرۆڤ تمثیلی حاڵێک دەکات کە چی لە ڕاستیدا لەو حاڵەدا نیە، وەک ئەوەی خۆی دەخاتە سەر شێوەی هەژارێک کەچی دەوڵەمەندە و شتی تری وەک ئەمانە، ئەگەر مەسڵەحەتی تێدا بێت و بیەوێت مرۆڤێک تاقی بکاتەوە ئەوا بۆ دروستە و هیچی تێدا نیە)[١].

**١١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەزڵی وەرع و زوهد، خاوەنەکەی ڕادەکێشیت بۆ شتێکی سوپاسکراو، چونکە کەسە کوێرەکە زاهد بوو لە دونیا و شوکرانی نیعمەتەکانی خوای گەورەی دەکرد[٢].

**١٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە شوکری هەر نیعمەتێک بە گوێرەی نیعمەتەکەیەتی، شوکری نیعمەتی ماڵ بەخشینە لە ڕێگای خوای گەورە، شوکری نیعمەتی زانست بەخشین و وەڵام دانەوەی پرسیارە ئەگەر کەسێک پرسیاری لێکرد[٣].

**١٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نیعمەت دانە پاڵ خوای گەورە تەوحیدە و نیعمەت دانە پاڵ بێجگە لەخوا شیرکە، بەڵام ئەگەر باوەری وا بێت بێجگە لەخوا ئەو نیعمەتەی هێناوەتە دی و پێی داوە ئەوا شیرکی گەورەیە، وە ئەگەر باوەڕی وابێت بێجگە لەخوا هۆکارن و خوای گەورە خاوەنی نیعمەتە، بەڵام دەیداتە پاڵ هۆکار ئەمە شیرکی بچووکە، چونکە دروست نییە نیعمەت بدەیتە پاڵ هۆکار، هەتا ئەگەر چی هۆکارەکان ڕاستیش بن[٤].

---

[١] القول المفيد (٣/٦٥-٧٠).

[٢] القول المفيد (٣/٦٥-٧٠).

[٣] القول المفيد (٣/٦٥-٧٠).

[٤] إعانة المستفيد (٢/٢٧٦).

**١٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە خۆشی و ناخۆشی و بەڵا و تاقیکردنەوە لە خواوەیە[١].

**١٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە پاداشت لە جنسی کردەوەیە، خوای گەورە ڕازی بوو لەو کەسە کوێرەیە بەهۆی چاکەکەی، وە توڕەش بوو لە دوو هاوەڵەکەی بەهۆی نەدانی مافی هەژارەکان)[٢].

**١٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ دەرکردنی حەقی واجب لە زەکات دان و خواردن دان بە برسی و جل و بەرگ بۆ کەسێک پێویستی پێیەتی، شتی تری وەک ئەمانە لە حەقی واجب و سوننەت، وە بەخیلی کردن لە مافەکانی ماڵ کوفرە بە نیعمەت[٣].

---

[١] إعانة المستفيد (٢٧٦/٢).

[٢] إعانة المستفيد (٢٧٧/٢).

[٣] إعانة المستفيد (٢٧٧/٢).

## باب قول الله تعالى:

## ﴿فَلَمَّا آتَاهُمَا صَالِحاً جَعَلاَ لَهُ شُرَكَاء فِيمَا آتَاهُمَا﴾ {الاعراف:١٩٠}

**قال ابن حزم: اتفقوا على تحريم كل اسم معبد لغير الله؛ كعبد عمر، وعبد الكعبة، وما أشبه ذلك، حاشا عبد المطلب[١].**

**وعن ابن عباس رضي الله عنه في الآية قال: لما تغشاها آدم حملت، فأتاهما إبليس فقال: إني صاحبكما الذي أخرجتكما من الجنة لتطيعاني أو لأجعلن له قرني أيل، فيخرج من بطنك فيشقه، ولأفعلن ولأفعلن ـ يخوفهما ـ سمياه عبد الحارث، فأبيا أن يطيعاه، فخرج ميتا، ثم حملت، فأتاهما، فقال مثل قوله، فأبيا أن يطيعاه، فخرج ميتا، ثم حملت، فأتاهما، فذكر لهما فأدركهما حب الولد، فسمياه عبد الحارث فذلك قوله تعالى: (جَعَلاَ لَهُ شُرَكَاء فِيمَا آتَاهُمَا) رواه ابن أبي حاتم[٢].**

**وله بسند صحيح عن قتادة قال: شركاء في طاعته، ولم يكن في عبادته.**

**وله بسند صحيح عن مجاهد في قوله: ﴿لئن آتيتنا صالحا﴾ قال: أشفقا ألا يكون إنسانا، وذكر معناه عن الحسن وسعيد وغيرهما[٣].**

**فيه مسائل:**

---

[١] مراتب الإجماع لاپەڕە (١٥٤).

[٢] في (تفسيره) (١٦٣٤/٥ رقم ٨٦٥٤)، ونحوه ابن جرير في "تفسير"(١٤٦/٩).

[٣] ابن أبي حاتم في (تفسيره) (١٦٣٤/٥ رقم ٨٦٤٨).

**الأولى:** تحريم كل اسم معبد لغير الله.

**الثانية:** تفسير الآية.

**الثالثة:** أن هذا الشرك في مجرد تسمية لم تقصد حقيقتها.

**الرابعة:** أن هبة الله للرجل البنت السوية من النعم.

**الخامسة:** ذكر السلف الفرق بين الشرك في الطاعة، والشرك في العبادة.

## باب قول الله تعالى:

﴿فَلَمَّا آتَاهُمَا صَالِحاً جَعَلاَ لَهُ شُرَكَاء فِيمَا آتَاهُمَا﴾ {الاعراف:١٩٠}

باسکردنی تەفسیری وتەی خوای گەورە کە دەفەرموویت: (کاتێک خوای گەورە منالّی ساغ و سەلامەتی پێیاندا، ئەو دایک و باوکە لە منالّەکەیاندا شەریکیان بۆ خوا دانا، خواش بەرز و بلندە لەو شەریکایەتییەی کە بۆ خوایان داناوە).

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (دانەری کتاب دەیەوێت ڕوونی بکاتەوە ناونان بە بەندەی فلانە شت یان فلانە کەس بێجگە لەخوا حەڕامە، نابێت ناو کەس بکرێتە بەندەی بێجگە لەخوا، نابێت بگوترێ: (عبد النبي) یان (عبد الكعبة) یان (عبد الحسين) و ناوی تری هاوشێوەی ئەمانە، بەڵکو بەناوکردنی بەندە تەنها بۆ خوایە، وەک: (عبد الرحمان) و (عبد الله) و ...)[1].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (خوای گەورە ئەگەر نیعمەتی لەگەڵ بەندەی خۆی کرد بە منالّ پێدان، وە منالّەکە سەلامەت بێت، دەبێت سوپاسی خوای گەورە بکات لەسەر ئەم نیعمەتە، وە منالّ کردنە بەندە بۆ بێجگە لەخوا پێچەوانەی شوکرە، پێچەوانەی ئەوەیە کە خاوەنی نیعمەتی منالّ تەنها خوایە، هەندێک حالەت دەگاتە شیرکی گەورە)[2].

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿فَلَمَّا آتَاهُمَا صَالِحاً﴾: صلاح لێرە ئەگەری دوو مانا هەیە:

١- ساغ و سەلامەت لە لاشەدا.

---

[1] التعليق المفيد لاپەڕە (٢٣٣).

[2] التمهيد لاپەڕە (٤٧٠).

٢- باش بێت لە دین.

زۆربەی ڕاڤەکارانی قورئان مانای یەکەم باس دەکەن، بەڵام وتەی ڕاست هەردوو مانا هەڵدەگرێت.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

قەرعاوی دەفەرمووێت: (مناسبەی ئەم ئایەتە لەسەر وتەی ابن عباس بەڵگەیە ناونان لە کەسێک بە بەندەی بێجگە لەخوا شیرکە)[١].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

١- ئەم ئایەتە بەڵگەیە نابێت شەریک بۆ خوا دابنرێت لە منالْدا، ئەگەر وترا: ئەو منالْەی خوای گەورە پێیانیدا یەک منالْ بوو، چۆن لەگەڵ ئەم منالْە شەریک دانرا؟

وەڵام: لەسەر ئەمە دەڵێین سێ ڕوو هەیە:

ڕووی یەکەم: هەردووکیان باوەڕیان وابوو ئەوەی ئەو منالْەی پێداوە فلانە وەلی بوو و فلانە پیاو چاک بوو، ئەمە شیرکی گەورەیە، چونکە دراوەتە پاڵ دروستکراوەکان.

ئەمە ئێستا لە هەندێک ئوممەتی ئیسلامی دەبینرێت، ئافرەت ئەگەر منالْی نەبێت دەچێتە لای گۆڕی فلانە وەلی، ئەوان دەڵێن وەلی یە - خواش زاناترە وەلی یە یان نە - دەڵێن: ئەی فلانە گەورە و وەلی منالْم پێ بدە.

ڕووی دووەم: سەلامەتی منالْ و پاراستنی دەداتە پاڵ دکتۆرەکان، نموونە دەڵێت: منالْەکە سەلامەت بوو لە ژان، چونکە قابلیەتی ئافرەت باش بوو، لێرە نیعمەت دراوەتە پاڵ بێجگە

[١] الجدید.

لەخوا، ئەمە جۆرێکە لە جۆرەکانی شیرک ناگات بە شیرکی گەورە، چونکە نیعمەتی داوەتە پاڵ هۆکار و لەبیری کرد کە ئەوەی هۆکاری بۆی داناوە و ئاسانی کردووە خوایە.

ڕووی سێیەم: شەریک بۆ خوا بڕیار نادات لە ڕووی پەروەردگاریەتی، بەڵکو باوەڕی وایە ئەم مناڵە بە سەلامەتی لەدایک بووە بە و ڕەحمی خوای گەورە، بەڵام شەریک بۆ خوا بڕیار دەدات لە ڕووی عبودییەت، خۆشەویستی مناڵ پێش خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) دەخات و لایدەدات لە گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر (ﷺ))[1].

---

[1] القول المفید.

**قال ابن حزم: اتفقوا على تحريم كل اسم معبد لغير الله؛ كعبد عمر، وعبد الكعبة، وما أشبه ذلك، حاشا عبد المطلب.**

واتە: ابن حزم ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (هەموو زانایان یەک دەنگن لەسەر حەرامی ناونان بە بەندەی فلانە شت یان کەس بێجگە لەخوا، وەک: (عبد عمر، وعبد الكعبة)، و ناوی تری هاوشێوەی ئەمانە، بێجگە لە ناوی (عبد المطلب) نەبێت هەموو زانایان لەسەر حەڕام کردنی یەک دەنگن نین).

بێجگە لە (عبد المطلب) لەم نەهی دەرهێنراوە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دانی بەم ناوە نا و نەی گۆڕی، لە هاوەڵان ئەم ناوە هەبووە: (عبد المطلب بن ربيعة)، چونکە ئەسل تێیدا بەندایەتی یە لە بەندە (واتە: ئەو بەندانەی کرین و فرۆشتنی پێ دەکرا)، پێیان دەگوت: (عبد المطلب)، ناوی (شيبة بن هاشم) بووە، چونکە گومانیان برد عەبدی المطلبە لەبەر گۆڕانی ڕوخساری لەبەر سەفەر، المطلب مامی بووە، ئەم ناوە دانی پێنرا لەناو ئیسلام پێچەوانەی ناوەکانی تر[1].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (سەبارەت بە (عبد المطلب) جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان، هەندێک ئەهلی علم دەڵێن: ناکرێت ئەم ناوە حەڕام بێت و پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی: أنا النبی لا كذب أنا ابن عبد المطلب".

پێغەمبەر (ﷺ) شت حەڕام ناکات، دروستە ناوی (عبد المطلب) دابنرێت، ئەمە دان پێنانی ابن حزمە، بەڵام وتەی ڕاست ناوی (عبد المطلب) دروست نییە، دروست نییە بۆ کەس ناوی منالّی خۆی بکاتە (عبد المطلب)، سەبارەت بە وتەی پێغەمبەر (ﷺ): (أنا ابن عبد المطلب)، ئەمە لە بابی خەبەر دانە نەک دان پێنان بێت، پێغەمبەر (ﷺ) خەبەری داوە

---

[1] التعليق المفيد.

باپیرێکی هەبووە ناوی عبد المطلب بووە، جێگیر نەبووە ناوی نابێت بە (عبد المطلب)، یان ڕێگەی دابێت بە یەکێک لە هاوەڵان بۆ ئەم ناوە، وە هەروەها دانی نەناوە بەم ناوە، قسە لەسەر حوکمە نەک خەبەر، جیاوازی هەیە لەنێوان خەبەر و دانان و دان پێدانان، لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: (إنما بنو هاشم وبنو عبد مناف شيء واحد)، وە ناوی (عبد مناف) دروست نییە.

زانایان دەڵێن: ئەوەی کوفر دەگێڕێتەوە و باس دەکات کافر نییە، پێغەمبەر (ﷺ) قسەی لەسەر شتێک کردووە ڕوویداوە و چووە، ئەوەی ڕاست بێت دروست نییە کەس بکرێتە بەندەی بێجگە لەخوا بە مطلقی نە (عبد المطلب) و نە ناوی تر، کەواتە ناونان بە بەندەی بێجگە لەخوا شیرکە)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموێت: (دوای ئیسلام بۆ کەس دروست نییە ئەم ناوانە لەخۆی بنێت هەتا ناوی عبدالمطلبیش، سەبارەت بە شتێک چووبێت و باسی بکەیت وەک حیکایەت هیچی تێدا نییە، پیغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویت: (أنا النبی لا كذب أنا ابن عبد المطلب)، ئەمە لە ناحیەیەک.

ناحیەی دووەم: دەڵێن عبد المطلب ناوی باپیری پێغەمبەر نییە، بەڵکو ناوی: (شيبة) الحمد، بەڵام پێی گوتراوە: (عبد المطلب) چونکە مامی المطلب بن عبد مناف هات لەگەڵ خۆی هێنا لە ماڵی خالی خۆی بنی نجار لە مەدینە بچووکتر بوو، ڕەنگی گۆردرا بۆ ڕەنگی ڕەش بەهۆی سەفەرەوە، گومانیان برد ئەمە بەندەی المطلبە، گوتیان: عبد المطلب)[2].

وتەی ڕاست دروست نییە ناوی (عبد المطلب) لەکەس بنرێت و حەرامە، والله أعلم.

---

[1] القول المفيد (٣/٨١-٨٢).

[2] إعانة المستفيد (٢/٢٨١-٢٨٢).

**وعن ابن عباس رضي الله عنه في الآية قال: لما تغشاها آدم حملت، فأتاهما إبليس فقال: إني صاحبكما الذي أخرجتكما من الجنة لتطيعاني أو لأجعلن له قرني أيل، فيخرج من بطنك فيشقه، ولأفعلن ولأفعلن ـ يخوفهما ـ سمياه عبد الحارث، فأبيا أن يطيعاه، فخرج ميتا، ثم حملت، فأتاهما، فقال مثل قوله، فأبيا أن يطيعاه، فخرج ميتا، ثم حملت، فأتاهما، فذكر لهما فأدركهما حب الولد، فسمياه عبد الحارث فذلك قوله تعالى: (جَعَلاَ لَهُ شُرَكَاء فِيمَا آتَاهُمَا) رواه ابن أبي حاتم[1].**

واته: له ابن عباس دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت سەبارە بە تەفسیری ئەم ئایەتە دەفەرمووێت: کاتێک ئادەم حەوای داپۆشی سکی پڕ بوو، شەیتان بۆ لایان و گوتی: من هاوڕێکەی خۆتانم ئەوەی کە لە بەهەشتدا بەدەرکردندا، والله یان دەبێت بە قسەم بکەن یان دوو شاخی بزنە کێوی بۆ مناڵەکەتان دروست دەکەم، ئەوجا دێتە دەر سکی دایکی هەڵدەدرێت، هەر دەیگۆت وا دەکەم و وا دەکەم، بەردەوام هەردووکیان دەترساند، گوتی: ناوی بنێن (عبد الحارث)، گوتی ئەگەر وا بکەن منیش وازتان لێ دەهێنم، ئەوانیش بە قسەیان نەکرد و مناڵەکەیان بە مردووی هاتەدەر.

پاشان سکی کردەوە ئەوجا هاتەوە بۆ لایان، دیسان هەمان وتەی بۆیان دووبارە کردەوە، ئەوانیش خۆشەویستی مناڵیان چووە دڵیانەوە، بۆیە مناڵەکەیان ناونا بە (عبدالحارث)، ئەمەش تەفسیری ئەو ئایەتە دەکات: (جَعَلاَ لَهُ شُرَكَاء فِيمَا آتَاهُمَا).

**وله بسند صحيح عن قتادة قال: شركاء في طاعته، ولم يكن في عبادته.**

---

[1] في "تفسيره" (١٦٣٤/٥ رقم ٨٦٥٤)، ونحوه ابن جرير في "تفسير"(١٤٦/٩).

واتە: قەتادە لەبارەی تەفسیری ئەو ئایەتەوە دەڵێت: ئەو شیركە لەوەدا بووە كە بە گوێی شەیتانیان كردووە نەک عیبادەتی بکەن.

**وله بسند صحيح عن مجاهد في قوله: (لئن آتيتنا صالحا) قال: أشفقا ألا يكون إنساناً، وذكر معناه عن الحسن وسعيد وغيرهما[١].**

واتە: موجاهد لەبارەی وتەی خوای گەورە: (لئن آتيتنا صالحا) دەڵێت: دەترسان منداڵەکەیان مرۆڤ دەرنەچێت، لە حەسەنی بەسری و سەعید و بێجگە لەمانە هەمان مانا گێڕدراوەتەوە.

### ڕاڤەی وشەکانی ئەثەرەکە:

**(وذكر معناه عن الحسن وسعيد وغيرهما)**: بەڵام ئەوەی ڕاست بێت حەسەن دەڵێت: ئایاتەکە باسی ئادەم و حەوا نییە، بەڵکو مەبەست پێی موشریکەکانی نەوەی ئادەمە هەروەک ابن کثیر لە تەفسیری خۆی باسیکردووە، دەفەرمووێت: (ئێمە لەسەر مەزهەبی حەسەنی بەسرین ڕەحمەتی خوای لێ بێت، مەبەستی ئایەتەکە ئادەم و حەوا نییە، بەڵکو مەبەست پێی موشریکەکانی نەوەی ئادەمن)[٢].

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئەثەرە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئەثەرەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوون بکاتەوە ناو نان لەمناڵ بە بەندەی فلانە کەس شیرکە.

### سوودەکانی ئەثەرەکە:

---

[١] ابن أبي حاتم في "تفسيره" (١٦٣٤/٥ رقم ٨٦٤٨).

[٢] تفسير ابن كثير (٢٧٥/٢).

**١-** جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بەم چیرۆکە، دوو وتە هەیە:

یەکەم: زۆربەی زانایان بۆ ئەوە چوون ئەم چیرۆکە ڕاستە، مەبەست پێی شیرکە لە گوێڕایەلی، وە شیرکەکەش شیرکی بچووکە.

دووەم: هەندێک زانا بۆ ئەوە چوون ئەم چیرکە هیچ ئەسل و ئەساسی نییە، کە ئەمە وتەی ڕاستە، والله أعلم.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەم چیرۆکە پووچە لە چەند ڕوویەکەوە:

ڕووی یەکەم: هیچ خەبەری ڕاست لەم بارەوە لە پێغەمبەرەوە نقل نەکراوە، ئەمە لەو خەبەرانەیە نابێت وەربگیرێت ئیلا بە وەحی نەبێت، ابن حزم سەبارەت بەم چیرۆکە دەفەرمووێت: ئەم ڕیوایەتە خورافی یە و درۆیە و هەلبەستراوە.

ڕووی دووەم: ئەگەر ئەم چیرۆکە سەبارەت بە ئادەم و حەوا بوایا، ئەوە حاڵیان یان ئەوە دەبوو تەوبەیان دەکرد لە شیرک، یان لەسەری دەمردن، ئەگەر بڵێین: لەسەر ئەم تاوانە مردوون، ئەوە ئەم وتەیە گەورەترە لە وتەی هەندێک زندیق کە دەڵێن:

إذا ما ذكرنا آدما وفعاله وتزويجه بنتيه بالخنا

علمنا بأن الخلق من نسل فاجر وأن جميع الناس من عنصر الزنا

هەر کەسێک بڵێت یەکێک لە پێغەمبەرەکان لەسەر شیرک مردووە ئەوە بوختانێکی گەورەی کردووە، ئەگەر تەوبەیان کردبێت لە شیرک، ئەوە لەگەڵ حیکمەتی و دادپەروەری خوای گەورە ناگونجێت باسی هەڵەیان بکات و باسی تەوبەیان نەکات، ناکرێت خوای گەورە باسی هەڵەی ئادەم و حەوا بکات و تەوبەشیان کردبێت باسی

تەوبەیان نەکات، خوای گەورە کاتێک باسی هەڵەی هەندێک پێغەمبەران دەکات باسی تەوبەشیان دەکات، هەروەک باسی چیرۆکی ئادەم دەکات کاتێک لە دار دەخۆن خۆی و خێزانی، پاشان تەوبە دەکەن.

ڕووی سێیەم: پێغەمبەرەکان معصومن لە شیرک بە یەک دەنگی هەموو زانایان.

ڕووی چوارەم: فەرمووده جێگیر بوو خەڵک دێن بۆ لای ئادەم و داوای شەفاعەتی لێ دەکەن، ئادەمیش داوای لێبوردن دەکات چونکە لە داری بەهەشتی خواردووە و سەرپێچی خوای گەورەی کردووە، ئەگەر تووشی شیرک ببوایا ئەوە لەم حاڵەتە باسی شیرکی دەکرد، چونکە شیرک گەورەترین تاوانە.

ڕووی پێنجەم: لەم چیرۆکە باسی ئەوە دەکات شەیتان دێتە لایان، دەڵێت: (من هاوڕێکەی خۆتانم ئەوەی کە لە بەهەشتدا بەدەرکردندا)، ئەگەر یەکێک ببیەوێت کەسێک هەڵبخەڵەتێنێت ئەم قسەیە ناکات، بەڵکو شتێک دەڵێت نزیک بێت بۆ قبول کردن و فریودانیان، ئەگەر بڵێت: (من هاوڕێکەی خۆتانم ئەوەی کە لە بەهەشتدا بەدەرکردندا)، ئەوە ئادەم و حەوا دەزانن ئەوان دوژمنیانە و وتەی وەرناگرن و بەگوێی ناکەن.

ڕووی شەشەم: لەم چیرۆکە دەڵێت: (والله یان دەبێت بە قسەم بکەن یان دوو شاخی بزنە کێوی بۆ مناڵەکەتان دروست دەکەم)، یان ئەوەتا بەڕاستیان داناوە کە ئەمە مومکینە لەم چیرۆکە، ئەمەش شیرکە لە پەروەردگاریەتیدا، چونکە کەس توانای بەسەر ئەمە نییە مەگەر خوا نەبێ، یان ئەوەتا بە ڕاستی دادەنێن، لەم حاڵەتە ناکریت وتەی وەربگرن بزانن ئەم شتە مومکین نییە.

ڕووی حەوتەم: وتەی خوای گەورە دەفەرموویێت: (فتعالى الله عما يشركون)، زەمیرەکە کۆیە، ئەگەر ئادەم و حەوا بوایا دەیگوت: عما يشركان.

ئەم ڕوویانەی باسمان کرد بەڵگەن لەسەر پووچی ئەم چیرۆکە لە بنەڕەتدا، نابێت باوەڕت وابێت ئادەم و حەوا تووشی شیرک بووینە بەر هەر حاڵێک لە حاڵەکان، پێغەمبەران هەموویان پارێزراو بوونە لە شیرک بە یەک دەنگی هەموو زانایان، لەسەر ئەمە تەفسیری ئایەتەکە باسی نەوەی ئادەمە ئەوانەی تووشی شیرک بووینە بەراستی، لەوانە هەندێکیان موشریکن و هەندێکی تر یەکخواپەرستن)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (وتەی یەکەم ڕاسترە لەبەر چەند ڕوویەک:

یەکەم: زەمیرەکان هەموویان بۆ دوو کەسە.

دووەم: ئەوەی ابن عباس تەفسیری کردووە بە چەند ڕێگا هاتووە، تەفسیرەکە ڕاستە بە کۆی ڕێگاکان.

سێیەم: زۆربەی زانایان لەسەر ئەم وتەیەن، هەروەک شەوکانی فەرموویەتی.

چوارەم: ئەمە وتەی ئیمام ئەبو جەعفەر ابن جریرە شێخی ڕاڤەکارانی قورئان، بە جۆرێک دەفەرمووێت: (لەپێشترین دوو وتە وتەی یەکەمە، وە دانەری ئەم کتابەش ئەمەی هەڵبژاردووە و لەم بابە باسیکردووە.

سەبارەت بە وتەی ئەوانی تر کە دەڵێن: ئەمە شیاو نییە بۆ ئادەم، دەڵێین: ئەمە شیرکی گەورە نییە، بەڵکو شیرکی بچووکە، شیرکە لە گوێڕایەڵی و وتەدا، نەک لە مانا و مەبەست و نییەتدا، دەکرێت پێغەمبەران تووشی هەندێک تاوان ببن و خوای گەورە گلەیی لێیان بکات لەسەری، پاشان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، معصومی بۆ پێغەمبەران بۆ

---

[1] القول المفید (٣/٨٤).

تاوانی گەورەیە، وە بەردەوام بوون لەسەر تاوانی بچووک، هەروەک شیخ الإسلام ابن تیمییە باسیکردووە)[1].

[1] إعانة المستفيد (٢/٢٨٤-٢٨٦).

## باب قول الله تعالى:

## ﴿وَلِلَّهِ الْأَسْمَاء الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُواْ الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَآئِهِ﴾ {الأعراف:١٨٠}.

**ذكر ابن أبي حاتم عن ابن عباس رضي الله عنهما ﴿يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَآئِهِ﴾ يشركون[١].**

**وعنه: سموا اللات من الإله، والعزى من العزيز[٢].**

**وعن الأعمش: يدخلون فيها ما ليس منها[٣].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** إثبات الأسماء.

**الثانية:** كونها حسنى.

**الثالثة:** الأمر بدعائه بها.

**الرابعة:** ترك من عارض من الجاهلين الملحدين.

**الخامسة:** تفسير الإلحاد فيها.

---

[١] أخرجه ابن أبي حاتم في (تفسيره) (١٦٢٣/٥ رقم ٨٥٨٣) بلفظ: (التكذيب)، أما لفظ: (يشركون) فهو عند ابن أبي حاتم عن قتادة.

[٢] أخرجه ابن أبي حاتم في (تفسيره) كما في (الدرالمنثور) (٦١٦/٣).

[٣] أخرجه ابن أبي حاتم في (تفسيره) (١٦٥/٢ رقم ٨٥٨٧).

## باب قول الله تعالى:
## ﴿وَلِلّهِ الأَسْمَاء الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُواْ الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَآئِهِ﴾ {الأعراف:١٨٠}.

بابی باسکردنی وتەی خوای گەورە کە دەفەرموویێت: (تەنها خوا خاوەنی ناوە هەرە جوانەکانە، جا کەواتە ئێوەش هەر بەو ناوانەوە لەخوا بپارێنەوە و عیبادەتی بۆ بکەن، واز لەوانە بێنن و دوور بکەونەوە کە لە بارەی ناوەکانی خواوە لایان داوە، ئەوانە بە تەئکید سزای ئەو کردەوانەیان وەردەگرن کە ئەنجامیان نەداوە).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەم بابە پەیوەندی بە ناو و سیفەتەوە هەیە؛ چونکە ئەم کتابە هەرسێ جۆری تەوحیدی تێدایە: تەوحیدی بەندایەتی کردن و پەروەردگاریەتی و ناو و سیفەت.

تەوحیدی ناو و سیفەت ئەوەیە خوای گەورە بە تەنیا دابنێیت بەوەی جیگیر بووە لە سیفەتی کەمال لەسەر ڕووی حەقیقی، بێ (تمثيل و تكييف و تعطيل)؛ چونکە ئەگەر (تعطيل)ی بکەیت واتە جێگیرت نەکرد، وە ئەگەر (تمثيل)ی بکەیت واتە بە تەنیات دانەنا، تەوحید لە نەفی و إثبات پێک دێت، واتە: جێگیرکردنی حوکمە و نەفی کردنی ئەوانی ترە بێجگە لەخوا، نموونە: ئەگەر بڵێیت: (زيد قائم)، واتە: زەید وەستاوە بە پێوە، لەم حالەتە زەیدت بە تەنیا دانەنا بۆ وەستان بە پێوە و ئەگەر بڵێیت: زيد غير قائم، بە پێوە وەستانت بۆ جێگیر نەکرد، ئەگەر بڵێیت: (لا قائم إلا زيد)، واتە زەیدت بە تەنیا دانا بۆ وەستان بە پێوە، ئەگەر بڵێیت: (لا إله إلا الله)، خوای گەورەت بە تەنیا دانا لە بەندایەتی کردندا، ئەگەر ناو و سیفەتت بۆ خوای گەورە جێگیرکرد بێ ئەوە بچوویێنی بە ناو و

سیفەتەکانی خوای گەورە، ئەوە ئەمە تەوحیدە لەناو و سیفەتدا، ئەگەر نەفی ناو و سیفەت بکەیت ئەمە (تعطیل)ە، ئەگەر بچوویێنی ئەمە شیرکە)[١].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (دانەری کتاب ئەم بابەی باسکردووە لە کتابی تەوحید بۆ ئەوەی روون بکاتەوە واجبە ناو و سیفەت بۆ خوای گەورە جێگیر بکەیت، بۆ ئەوەی تەوەسلی ڕێگەپێدراوە و قەدەغە کراو ڕوون بکاتەوە، چونکە بابەتی تەوەسل زۆر کەس تێیدا گومڕا بوون لە کۆنەوە)[٢].

صالح آل الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەم بابە باسی بەگەورە دانانی ناوەکانی خوای گەورە دەکات، بەگەورە دانانی ناوەکانی خوای گەورە ئەوەیە لانەدەیت لە ناو وسیفەتەکانی و بەو ناوانەوە لەخوا بپاڕێیتەوە و عیبادەتی بۆ بکەیت)[٣].

عبدالله بن جار الله دەفەرموویت: (مەبەست لەم بابە وەڵام دانەوەی ئەوانەیە کە تەوەسل بە مردووەکان دەکەن، بەڵکو ئەوەی ڕێگەپێدراوە تەوەسول کردنە بە ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە و کردەوی باش)[٤].

## ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿وَلِلّهِ الأَسْمَاء الْحُسْنَى﴾: لام بۆ (استحقاق)ە، واتە: ناوەکانی خوای گەورە جوانن و لە جوانی دا گەیشتونەتە کۆتایی، خوا هەر خۆی شایستەی ئەم ناوانەیە.

---

[١] القول المفيد (٣/٩٠).

[٢] إعانة المستفيد (٢/٢٨٩-٣٩٠).

[٣] التمهيد لاپەڕە (٤٧٨).

[٤] الجامع الفريد لاپەڕە (١٨٥).

﴿فَادْعُوهُ بِهَا﴾: واته: ئەگەر ئێوە زانیتان تەنها خوا شایستەی ئەم ناوانەیە و ئیمانیشتان بەو ناوانە هێنا ئەوا بەو ناوانەوە لەخوا بپاڕێنەوە و عیبادەتی بۆ بکەن.

## هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

عبدالله بن جار الله دەفەرموویت: (لادان لەناو و سیفەتەکانی خوای گەورە و نەفی کردنی، نەفی تەوحید و ئیمان دەکات)[1].

## سوودەکانی ئایەتەکە:

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە ناوەکانی خوای گەورە جوانن و فەرمانمان پێکراوە بە پارانەوە بەو ناوانە[2].

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ تەوەسول کردن بە ناوەکانی خوای گەورە، تەوەسول دوو بەشە: تەوەسولی قەدەغەکراو: ئەویش ئەوەیە تەوەسول دەکات بە جاهی دروستکراو یان حەقی دروستکراو یان پلەی دروستکراو یان زاتی دروستکراو ئەمەیان یان شیرکە یان بیدعیە و هۆکارە بۆ تووش بوون بە شیرک.

تەوەسولی ڕێگەپێدراو: ئەویش ئەوەیە کتاب و سوننەت باسیکردووە و فەرمانی پێکردووە، لەوانە ئەم ئایەتەی دانەری کتاب لەم بابە باسیکردووە: ﴿وَلِلَّهِ الأَسْمَاءَ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَ﴾، تەوەسولی ڕێگەپێدراو چەند جۆرێکە:

---

[1] الجامع الفريد لاپەڕە (١٨٥).

[2] شرح كتاب التوحيد لاپەڕە (٦٦٠)، لعبدالله بن حميد.

جۆری یەکەم: تەوەسول کردن بە ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە، دەڵێیت: (یا رحمن ارحمني)، (یا غفور اغفر لي)، (یا تواب تب علي)، (یا غنی اغنني)، بەم شێوەیە لە دوعاکەتدا ئەو ناوە باس دەکەیت کە گونجاوە لەگەڵ داواکەت.

جۆری دووەم: تەوەسول دەکەیت بۆ لای خوای گەورە بە دوعای پیاوچاکان، ئەگەر پیاو چاکێک لە پیاوچاکان هەبێت زیندوویەکی ئامادەبوو پێی دەڵێیت: (ادع الله لي أن يغفر لي)، یان (أن يرزقنی)، یان (أن يشفني)، ئەگەر وشکە ساڵی بێت و داوا لە پیاو چاکێک بکرێت بۆ ئەوەی دوعای باران بارین بکات، ئەمە دروستە.

جۆری سێیەم: تەوەسول کردنە بە کردەوەی باش، وەک نموونەی هاوەڵانی ئەشکەوت ئەوانەی دەرگای ئەشکەوتیان بەسەردا داخرا.

ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ تەوەسولی ڕێگەپێدراو، ئەویش تەوەسول کردنە بە ناوەکانی خوای گەورە و سیفەتەکانی.

تەوەسولی قەدەغە کراو ئەوەیە کەسێک بکەیتە واستە لە دوعا کردن دا لەنێوان دوعاکەر و خوای گەورە وەک ئەوەی بڵێیت: داوات لێ دەکەم بە پێغەمبەری خۆت یان داوات لێ دەکەم بە جاهی پێغەمبەری خۆت یان داوات لێ دەکەم بە پلەی "لەبەر خاتری" پێغەمبەری خۆت و قسەی تری وەک ئەمانە[1].

**٣-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر نەهی کردن لە لادان لە ناوەکانی خوای گەورە، لادان لە ناوەکانی خوای گەورە چەند جۆرێکە:

یەکەم: ئینکاری هەندێک ناو یان سیفەتەکانی خوای گەورە دەکات.

[1] إعانة المستفيد (٢/٢٩٢-٢٩٤).

دووەم: هەندێک ناو بۆ خوای گەورە دادەنێت کەچی خوای گەورە ئەم ناوانەی بۆ خۆی جێگیر نەکردووە.

سێیەم: ناو یان سیفەتی خوای گەورە دەچوێنێ بە ناو و سیفەتەکانی دروستکراوان.

چوارەم: لە ناوەکانی خوای گەورەوە ناو لە بتەکان بنێیت.

**٤-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە ناوەکانی خوای گەورە تەوقیفین، دروست نیە شتێک جێگیر بکەیت لە کتابی خوای گەورە و لە سوننەتی پیغەمبەر باس نەکرابێت.

عبدالله بن حمید ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ناوەکانی خوای گەورە تەوقیفین، بۆ کەس دروست نیە زیاد و کەمی بکات، ئەوەی لە قورئان و سوننەت دا هاتووە جێگیری دەکەین، ئەگەرنا جێگیری ناکەین)[١].

---

[١] شرح كتاب التوحيد لاپەڕە (٦٦٠).

**ذكر ابن أبي حاتم عن ابن عباس رضي الله عنهما** ﴿يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَآيِهِ﴾ **يشركون**[1].

ابن عباس خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت سەبارەت بە وتەی خوای گەورە: ﴿يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَآيِهِ﴾ دەفەرمووێت: لە ناوەكانی خوادا شەریک بۆ خوا دادەنێن.

**وعنه: سموا اللات من الإله، والعزى من العزيز.**

هەروەها دەفەرمووێت: لە ناوی (الإله) ەوە بتەكەیان ناونا لات، وە لە (العزيز) ەوە بتەكەیان ناونا عوزا.

**وعن الأعمش: يدخلون فيها ما ليس منها.**

لە ئەعمەشەوە دەگێڕنەوە گوتویەتی: هەندێک ناو دەخەنە ڕیزی ناوەكانی خواوە كە ناوەكانی خوا نین.

---

[1] أخرجه ابن أبي حاتم في (تفسيره) (١٦٢٣/٥ رقم ٨٥٨٣) بلفظ: (التكذيب)، أما لفظ: (يشركون) فهو عند ابن أبي حاتم عن قتادة.

## باب لا يقال: السلام على الله

**في الصحيح عن ابن مسعود رضي الله عنه قال: كنا إذا كنا مع النبي (ﷺ) في الصلاة قلنا: السلام على الله من عباده، السلام على فلان، فقال النبي (ﷺ): (لا تقولوا السلام على الله، فإن الله هو السلام)[1].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير السلام.

**الثانية:** أنه تحية.

**الثالثة:** أنها لا تصلح لله.

**الرابعة:** العلة في ذلك.

**الخامسة:** تعليمهم التحية التي تصلح لله.

---

[1] أخرجه البخاري (٨٣٥)، ومسلم (٤٠٢).

## باب لا يقال: السلام على الله
## نابێت بگوترێ سەلام لە خوای گەورە.

عبدالله بن حميد ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (خوای گەورەیە بەندەکان دەپارێزێت و سەلامەتیان دەکات، بەندە سەلامەت کراوە، ناکرێت بڵێیت: (السلام على الله)، کێیە خوای گەورە سەلامەت دەکات؟! خوای گەورە پێویستی بە کەس نیە سەلامی لێ بکات و سەلامەتی بکات، بەڵکو هەر خۆیەتی دروستکراوەکان دەپارێزێت و سەلامەتیان دەکات، دەوڵەمەندە و هەموو شتێکی بەدەستە)[1].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (دانەری کتاب ئەم بابەی باسکردووە بە شێوەی نەفی لەوانەیە بۆ کەراهەت و حەرامی بێت، بەڵام فەرموودە کردنە بەڵگە دەلالەت لەسەر حەرامی دەکات، سەلام چەندین مانای هەیە:

١- بە مانای سەلام دێت، هەروەک دەگوترێ سەلام لە فڵانە کەس بکە، بیژیێنە بە سەلام.

٢- بە مانای سەلامەت بوون لە هەموو ئافاتێک و کەم و کوڕییەک دێت، وەک وتەی: (السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته).

٣- ســــەلام ناوێکە لە ناوەکانی خوای گەورە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ﴾ [الحشر: ٢٣].

وتەی: (نابێت بگوترێ سەلام لە خوای گەورە)، واتە: مەڵێ: (السلام عليك يا رب)، لەبەر هۆکارانە:

- دوعای لەم چەشنە گومانی کەم و کوڕی (نقص) بۆ دەبرێت بۆ مافی خوای گەورە، واتە: دوعا دەکەیت نەفسی سەلامەت بێت، نابێت دوعا بکرێت مەگەر بۆ کەسێک شیاوی بێت، خوای گەورە پاک و بێگەردە و دوورە لە سیفەتی کەم و کوڕی (نقص).

- ئەگەر دوعات کرد بە سەلام لە خوای گەورە ئەوا پێچەوانەی ڕاستیت کردووە، چونکە خوای گەورە داوای لێ دەکەیت و لێی دەپاڕێیتەوە نەک بۆی بپاڕێیتەوە، خوای گەورە دەوڵەمەندە و پێویستی بە ئێمە نیە، بەڵکو مەدح دەکرێت بە سیفەتی تەواو وەک غفور و

---

[1] شرح کتاب التوحید لاپەڕە (٦٦٨).

سميع و عليم ...
مناسبەی ئەم بابە لە کتابی تەوحید دیارە؛ چونکە سیفەتەکانی خوای گەورە تەواون هەروەک چۆن ناوەکانی خوای گەورە تەواو و جوانن.

مناسبەی ئەم بابە لەگەڵ بابی پێشووتر دیارە؛ بابەتی پێشووتر باسی جێگیرکردنی ناوە جوانەکانی خوای گەورە دەکات کە سیفەتیش لەخۆ دەگرێتەوە، بابەتی ئەم بابە باسی سەلامەتی سیفەتەکانی خوای گەورە دەکات لە هەموو کەم و کورِییەک، ئەمەش کمال لەخۆ دەگرێتەوە، کەواتە کمال تەواو نابێت ئیلا بە جێگیر کردنی سیفەتی تەواو و نەفی کردنی دژەکەی نەبێت)[1].
صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (مناسبەی ئەم بابە لە کتابی تەوحید: وەک ئەدەب لەگەڵ خوای گەورە ئەمە نەگوترێ بەرامبەر بە خوا، نەگوترێ: السلام علی اللە، چونکە ئەمە کەم و کورتی یە لە تەوحید لەخۆدا بەدی هێنان بە پوختی، تەوحید لەخۆدا بەدی هێنانی واجب ئەوەیە ئەم وشەیە نەگوترێ، چونکە خوای گەورە دەوڵەمەندە لە بەندەکانی و دروستکراوەکان هەموویان هەژارن بۆ السلام)[2].

---

[1] القول المفید (٣/١٠٣-١٠٤).
[2] التمهید لاپەرِە (٤٨٤-٤٨٥).

**في الصحيح عن ابن مسعود رضي الله عنه قال: كنا إذا كنا مع النبي (ﷺ) في الصلاة قلنا: السلام على الله من عباده، السلام على فلان، فقال النبي (ﷺ): (لا تقولوا السلام على الله، فإن الله هو السلام).**

واتە: لە ابن مسعود دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: گەر لەگەڵ پێغەمبەر بووینایە لە نوێژدا دەمانگوت: سەلام لەخوا لەلایەن بەندەکانیەوە، سەلام لە فڵان و فڵان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (مەڵێن سەلام لە خوا، چونکە خوای گەورە هەر خۆی سەلامە).

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(كنا إذا كنا مع النبي (ﷺ) في الصلاة):** لێرە مەبەست پێی نوێژی واجبە، چونکە نوێژی واجب بە کۆمەڵ دەکرێت، کەم جار نوێژی سوننەت بە کۆمەڵ کراوە.

### هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

قەرعاوی دەفەرموویێت: (فەرموودەکە بەڵگەیە وتەی (سەلام لەخوا بێت) حەڕامە)[1].

### سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەرامە بڵێیت سەلام لەخوا بێت، ئەمە نەهی یە لە پێغەمبەرەوە سەبارەت بەم وشەیە، نەهی دەلالەت لەسەر حەڕامی دەکات[2].

---

[1] الجديد لاپەڕە (٤٠٩).

[2] إعانة المستفيد (٢/٣٠٠).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەم نەهی یە بۆ حەڕامی یە، سەلام پێویستی بە سەلام نیە، خوای گەورە خۆی سەلامە و سەلامەتە لە هەموو کەم و کوڕییەک)[١].

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەم نەهی یە بۆ حەڕامی یە، بۆ کەس دروست نییە بڵێت: (السلام علی الله))[٢].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە سەلام لە فریشتە بکەیت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) نەهی لێ نەکرد، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) خەبەری بە عائیشە دا بەوەی جبریل سەلامی لێ دەکات، ئەویش گوتی: (وعلیه السلام))[٣].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ڕوونکردنەوەی هۆکاری نەهی یەکە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێک گوتی: (لا تقولوا: السلام علی الله)، ماناکەی ڕوونکردەوە کە بۆچی نەهی کرد، فەرمووی: (خوا خۆی سەلامە)، کەواتە ڕوونکردنەوەی حوکمی تێدایە بە عیلەتەوە، چونکە ئەمە باشترە بۆ جێگیر بوون لە مێشکی گوێگر)[٤].

---

[١] القول المفيد (١٠٧/٣).

[٢] التمهيد لاپەڕە (٤٨٦).

[٣] القول المفيد (١٠٧/٣).

[٤] إعانة المستفيد (٣٠١/٢).

## باب قول: اللهم اغفر لي إن شئت

**في الصحيح عن أبي هريرة رضي الله عنه، أن رسول الله (ﷺ) قال: (لا يقل أحدكم: اللهم اغفر لي إن شئت، اللهم ارحمني إن شئت، ليعزم المسألة، فإن الله لا مكره له)[١].**

**ولمسلم: (وليعظم الرغبة، فإن الله لا يتعاظمه شيء أعطاه)[٢].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** النهي عن الاستثناء في الدعاء.

**الثانية:** بيان العلة في ذلك.

**الثالثة:** قوله: (ليعزم المسألة).

**الرابعة:** إعظام الرغبة.

**الخامسة:** التعليل لهذا الأمر.

---

[١] متفق عليه: أخرجه البخاري (٦٣٣٩)، ومسلم (٢٦٧٩).

[٢] رواه مسلم (٢٦٧٩).

## باب قول: اللهم اغفر لي إن شئت

## بابی باسکردنی وتەی: خوایە لێم خۆش ببە ئەگەر دەتەوێت.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (مناسبەی ئەم بابە بە کتابی تەوحیدەوە لە دوو ڕووەوەیە:

١- هەر کەسێک دوعا بەم شیوەیە بکات، وا هەست دەکرێت خوای گەورە ناچار کراوە و هەڵنەستاوە بە تەواوی پەروەرگاریەتی، چونکە لە تەواوی پەروەردگاریەتی ئەوەیە ناچار ناکرێت، بەڵکو پرسیاری لێ ناکرێت لەوەی کە خوای گەورە دەیکات، هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ﴿٢٣﴾﴾ [الأنبياء: ٢٣]

٢- لە ڕووی بەندایەتی هەست بەوە دەکرێت دەوڵەمەندە لە خوای خۆی، ئەمەش نەقسە لە تەوحیدی مرۆڤ، جا چ لە ڕووی پەروەردگاریەتی بێت یان بەندایەتی بێت یان ناو و سیفەت، لەبەر ئەوە دانەری کتاب لەو بابە باسیکردووە کە پەیوەندی بە ناو و سیفەتەکانەوە هەیە)[1].

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (تەوحید ئەوەیە بەندە خوای گەورە بە تەنیا دابنێت و زەلیل بێت بەرامبەر بە خوا و خۆشی بوێت بەوپەڕی خۆشەویستی، بگەڕێتەوە بۆ لای خوا بەزەلیلی و بە هەژاری خۆی بەدیارخات، خوای گەورە دەوڵەمەندە و پێویستی بە کەس نیە،

وتەی (اللهم اغفر لي إن شئت)، ماناکەی ئەوە دەگەیەنێت کەسەکە دەوڵەمەندە لەوەی لێی خۆش بێت، هەروەک چۆن کەسێکی بە عیزەت یان خۆ بەگەورە زان یان کەسێکی

---

[1] القول المفيد (٣/١١٤-١١٥).

تر كە نایەوێت خۆی بۆ زەلیل بكات دەڵێت: فڵانە شت بكە ئەگەر بتەوێ، واتە: ئەگەر فڵانە شت بكەیت شتێكی باشە، ئەگەرنا زۆریت لێ نەكراوە، ئەم وتەیە نەفی حاجەتی خۆی دەكات، لەبەر ئەوە تەحقیقی تەوحیدی تێدا نیە، نەفی ئەوە دەكات كە واجبە لەسەر بەندە لە لایەنی پەروەرگاریەتی دا هەژاری خۆی و پێویستی خۆی بۆ خوای خۆی بە دەربخات، دەوڵەمەند نیە لە لێ خۆش بوون و عەفو و كەرەم و فەزڵ و نیعمەتی خوای گەورە، وتەی (اللهم اغفر لي إن شئت)، وەك ئەوەیە بڵێت من محتاج نیم، ئەگەر ویستت لێم خۆش بە ئەگەر نەتویست من محتاج نیم، ئەمە كردەوەی ئەوانەیە كە خۆیان بە گەورە دادەنێن و پشت لە خوا دەكەن، لەبەر ئەمە ئەم قسەیە حەرام كراوە)[١].

---

[١] التمهيد لاپەڕە (٤٨٨-٤٨٩).

**في الصحيح عن أبي هريرة رضي الله عنه، أن رسول الله (ﷺ) قال: (لا يقل أحدكم: اللهم اغفر لي إن شئت، اللهم ارحمني إن شئت، ليعزم المسألة، فإن الله لا مكره له).**

واته: له ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (با هیچ کەستان نەڵێت: خوایە لێم خۆش بە ئەگەر دەتەوێت، خودایە ڕەحمم پێ بکە ئەگەر دەتەوێت، با دوعا و پاڕانەوە بە گەرمی و عەزمەوە بکات، چونکە خودا لە هیچ کارێک دا ناچار ناکرێت).

**ولمسلم: (وليعظم الرغبة، فإن الله لا يتعاظمه شيء أعطاه).**

واتە ڕیوایەتی موسلیم دەفەرمووێت: (با لە دوعاکەیدا داوای شتی گەورە بکات هەڵبەتە هەر شتێک کە خودا ببیەخشێت لە لای گەورە و گران نیە).

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(اللهم):** واتە: ئەی خوایە.

**(اغفر لي):** واتە: لێم خۆش بە.

### هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

قەرعاوی دەفەرمووێت: (فەرموودەکە بەڵگەیە حەڕامە دوعا بکرێت بە ویستن، واتە بڵێیت: "خوایە لێم خۆش بە ئەگەر ویستت"، چونکە هەست بە زەلیل بوونی تەواوی بەندە ناکرێت بەرامبەر بەخوا، ئەمەش نەفی تەوحید دەکات)[١].

### سوودەکانی فەرموودەکە:

---

[١] الجديد لاپەڕە (٤١١).

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نەهی كراوە لەوەی بڵێیت: (اللهم اغفر لي إن شئت)، ئەم نەهییە بۆ حەڕامی بوونە.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (لەبەر سێ هۆ ڕێگری كراوە:

١- وا هەست دەكرێت كە خوای گەورە ناچاركراوە كەچی وا نیە.

٢- وا هەست دەكرێت كە ئەمە شتێكی گەورەیە و داوایەكی گرانە لەسەر خوای گەورە و لە توانایدا نیە كەچی وا نیە.

٣- وا هەست دەكرێت كە مرۆڤ دەوڵەمەندە لە خوا و پێویستی پێی نیە، كە ئەمە شیاو نیە و لە ڕەوشت نیە)[1].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم دوعا كردنە دروست نیە ئەگەر بە شێوەی خطاب بێت، بەڵام دوعایەك خطابی تێدا نەبێت و پەیوەست كرا بێت بە ویستن دروستە.

وتەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەو كەسەی كە سەردانی كردبوو و تووشی نەخۆشی تا ببوو هەروەك بخاری ڕیوایەتی كردوە و بێجگە لە بوخاریش: (طهور إن شاء الله)، ئەمەیان دوعای تێدا نییە و بەڵكو خەبەرە، وتی: دەبێتە پاككەرەوە ئەگەر خوا ویستی لێ بێت، ئەمەیان دوعا نیە بەلكو خەبەرە)[2].

---

[1] القول المفيد (٣/١١٥).
[2] التمهيد لاپەڕە (٤٩٠).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: وتەی دوعاکار کە دەڵێت خوایە لێم خۆش بە ئەگەر بتەوێت، خوایە ڕەحمم پێ بکە ئەگەر بتەوێت، ئەمەیان حەڕامە و پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کردووە، بەڵام وتنی: (إن شاء الله) پلەی نزم ترە و نابێت.

بەڵام گوتەی پێغەمبەر (ﷺ) (لابأس طهور إن شاء الله)، ئەمەیان لە بابەتی ئومێدە (رجاء)، چونکە نەخۆش هەیە نەخۆشیەکەی بۆ دەبێتە پاککەرەوە و تاوانی دەڕوات، هەیە بۆی نابێتە پاککەرەوە ئەگەر نەخۆشەکە ئارام نەگرێت و دڵی پڕ بێت لە تووڕەیی و ناڕازی بوون بوو لە خوا، ئەمەیان نەخۆشیەکەی بۆ نابێتە پاککەرەوە، کەواتە (إن شاء الله) لە بابەتی ئومێدە، واتە داوا لە خوا دەکەم بۆت ببێتە پاککەرەوە ئەگەر ئارام بگریت و داوای پاداشت لە خوا بکەیت)[1].

**٢-** ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە بۆ ڕوونکردنەوەی عیللەتی نەهی کردن لە دوعا کردن

بەم شێوەیە، ئەویش ئەوەیە خوای گەورە ناچار ناکرێت هەتا بڵێیت: (إن شاء الله).

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر تەواوی دەوڵەمەندی خوای گەورە، خەزێنەکانی کەم نابێت لەگەڵ زۆری ماڵ دان بە بەندەکانی و قبوڵ کردنی داواکانیان.

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ پاڕانەوە بە گەرمی و عەزمەوە.

---

[1] لقاءات الباب المفتوح.

## باب لا يقول: عبدي وأمتي

**في الصحيح عن أبي هريرة رضي الله عنه، أن رسول الله (ﷺ) قال: (لا يقل أحدكم: أطعم ربك، وضىء ربك، وليقل: سيدي ومولاي، ولا يقل: عبدي وأمتي، وليقل: فتاي وفتاتي، وغلامي)**[1].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** النهي عن قول: عبدي وأمتي.

**الثانية:** لا يقول العبد: ربي، ولا يقال له: أطعم ربك.

**الثالثة:** تعليم الأول قول: فتاي وفتاتي وغلامي.

**الرابعة:** تعليم الثاني قول: سيدي ومولاي.

**الخامسة:** التنبيه للمراد، وهو تحقيق التوحيد حتى في الألفاظ.

---

[1] أخرجه البخاري (٢٥٥٢)، ومسلم (٢٢٤٩).

## باب لا يقول: عبدي وأمتي
## نابێت بگوترێ عەبدی من و کەنیزەکی من

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (دانەری کتاب ئەم بابەی باسکردوە وەک بابی پێشووتر بۆ ئەوەی ڕێزگرتن لەناو و سیفەتەکانی خوای گەورە ڕوون بکاتەوە، هەروەها بۆ ئەوەی ئەو دەرگایانەش دابخات کە مرۆڤ ڕادەکیشێت بۆ شیرک، لەوانە خۆ دوورخستنەوە لەم وشەیە، چونکە مانای شیرکی تێدایە ئەگەر چی قسەکەر هیچ مەبەستێکیشی نەبێت)[1].

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم بابە لەگەڵ بابەکانی پێشووتر و دواتر هەموویان باسی بەگەورە دانانی پەروەردگاریەتی خوا و ناو و سیفەتەکانی دەکەن، چونکە بە گەورە دانانی ئەمانە لە تەواوی تەوحیدە، تەحقیقی تەوحید نایێتەدی مەگەر بە بەگەورە دانانی خوای گەورە لە پەروەردگاریەتی و بەندایەتی و ناو و سیفەتەکانی دا.

تەحقیقی تەوحید نایێتەدی مەگەر بە خۆ پاراستن لەو وشانەی کە بێ ڕەوشتی یە لەگەڵ پەروەردگاریەتی خوا، یان لەگەڵ ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە، لەبەر ئەوە دانەری کتاب ئەم بابەی باسکردوە و دەفەرمووێت: (باب: لا يقول: عبدي وأمتي))[2].

---

[1] إعانة المستفيد (٢/٣٠٣).

[2] التمهيد لاپەڕە (٤٩١).

**في الصحيح عن أبي هريرة رضي الله عنه، أن رسول الله (ﷺ) قال: (لا يقل أحدكم: أطعم ربك، وضيء ربك، وليقل: سيدي ومولاي، ولا يقل: عبدي وأمتي، وليقل: فتاي وفتاتي، وغلامي).**

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (با هیچ یەکێک لە ئێوە نەڵێت: خواردن بدە بە ڕەببی خۆت یان ئاوی دەست نوێژ بێنە بۆ ڕەببی خۆت، بەڵکو با بەندەکە بڵێت گەورەم، ئێوەش با کەستان نەڵێت بەندەی من، یان کەنیزەکی من، بەڵکو لە جێگای ئەوە با بڵێت کارکەرەکەم یان خزمەتکارەکەم).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(عبدي):** واتە: بەندەی من.

**(أمتي):** واتە: کەنیزەکی من.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە تاوەکو حوکمی گوتنی (عبدي وأمتي) ڕوون بکاتەوە.

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نەهی کراوە لە گوتنی: بەندەی من یان کەنیزەکی من.

عبدالله بن حمید ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بە وتەی: (هذا عبدي)، وتراوە حەڕامە، چونکە نەهی یەکە دەلالەت لەسەر حەڕام بوون دەکات، مرۆڤ فەرمانی پێکراوە بە پاراستنی لایەنی تەوحید، چونکە

فەرموودەکە دەفەرموویێت: (لا يقل أحدكم: عبدي)، وتراوە: مەکروهە، دروستە بەڵام باشتر وایە تەرکی بکەیت، ابن مفلح لە فروع بۆ ئەوە چووە حەرامە)[1].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (سەبارەت بە حوکمی گوتنی: (بەندەی من یان کەنیزەکی من)، دابەش دەبێت بۆ دوو بەش:

یەکەم: بەندە دەدەیتە پاڵ کەسێکی تر، وەک ئەوەی بڵێیت: بەندەی فلان یان کەنیزەکی فلان، ئەمەیان دروستە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَأَنكِحُوا الأَيَامَى مِنْكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِنْ يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمْ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ {النور:٣٢}، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (ليس على المسلم في عبده ولا فرسه صدقة)[2].

دووەم: بەندە دەدەیتە پاڵ نەفسی خۆت، ئەمەش دوو شێوەیە:

١- بەشێوەی خەبەر بەندە بدەیتە پاڵ نەفسی خۆت، نموونە: خواردنم دا بە بەندەی خۆم، جل و بەرگم بۆ بەندەی خۆم کڕی، بەندەی خۆم ئازاد کرد، ئەگەر ئەمە بڵێت بەندەکەی یان کەنیزەکەکەی ئامادە نەبێت، لەم حاڵەتە هیچی تێدا نییە، ئەگەر ئەمە بڵێت بە ئامادەبوونی بەندەی یان کەنیزەکەکەی، ئەگەر مەفسەدەتی لێ بکەوێتەوە وەک پەیوەست بوون بە بەندە یان گەورەکە ئەو کات ڕێگری دەکرێت ئەگەرنا ڕێگری ناکرێت، چونکە ئەوەی وا دەڵێت مەبەستی بەندایەتی نیە کە زەلیلی لەگەڵە، بەڵکو مەبەست پێی بەندایەتی موڵکە.

---

[1] شرح كتاب التوحيد لاپەڕە (٦٧٤-٦٧٥).

[2] أخرجه البخاري في (٤٥٤/١)، ومسلم في (٦٧٥/٢)، من حديث أبي هريرة رضي الله عنه.

٢- بە شێوەی بانگکردن ئەم قسەیە دەکات و گەورەکەی دەڵێت ئەی بەندەی من، ئەمەیان نەهی لێی کراوە، جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بەم نەهی یە، ئایا بۆ کەراهەتە یان حەڕامی یە، وتەی ڕاست تەفسیلی تێدایە کەمترین حاڵەت کەڕاهەتە)[1].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەم خطابە بۆ سەییدە و نابێت بڵێت بەندەی من یان کەنیزەکەکەی من، چونکە هەموویان بەندەی خوان ئافرەتانی ئێمەش بەندەی خوان، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویێت: (لا تمنعوا إماء الله مساجد الله)، سەید نەهی لێیکراوە ئەمە بڵێت، چونکە ئەگەر بڵێت بەندەی من و کەنیزەکەکەی من، ئەوا خۆی چوواندووە بە خوا ئەگەر چی تەنها ڕووکەشی قسەکەیە، چونکە خوای گەورە وەک خطاب دەفەرمووێت: (عبدي استطعمتك فلم تطعمني)، ئەگەر سەیید مەبەستی لە وتەی: (عبدي) مملوك بێت، ئەوا نەهی لە بابی کەڕاهەتە لە قسە و گومانی هاوبەشی تێدایە، پێشتر حوکمەکەمان باسکرد)[2].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە (رب) دانە پاڵ بێجگە لەخوا بە ضمیری مخاطب مەکروهە.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (بزانە (رب) دانە پاڵ بێجگە لەخوا دابەش دەکرێت بۆ چەند بەشێک:

بەشی یەکەم: (رب) دەدرێتە پاڵ ضمیری مخاطب، وەک: (أطعم ربك، وضئ ربك)، ئەمە مەکروهە لەبەر دوو قەدەغە کراو:

---

[1] القول المفيد (٣/١٢٨-١٢٩).

[2] القول المفيد (٣/١٢٥).

١- لەڕووی صیغەوە؛ چونکە گومانی مانای خراپە سەبارەت بە وشەی (رب)، چونکە وشەی (رب) لە ناوەکانی خوای گەورەیە، خوای گەورە خواردن دەدات نەک خواردنی پێ بدرێت، گومانی تێدا نییە (رب) لێرە (رب العالمین)، نییە ئەوەی خواردن دەدات نەک خواردنی پێ بدرێت، بەڵام لە بابی ئەدەبی قسەیە.

٢- لەڕووی ماناوە بەندە یان کەنیزەک هەست بە زەلیلی دەکات، چونکە ئەگەر گەورە (واتە: خاوەنەکەی) رب بێت، ئەوە بەندە یان کەنیزەک (مربوب)ە، واتە (پەروەردەکراوە).

بەشی دووەم: (رب) دەدرێتە پاڵ ضمیری غائب، ئەمەیان هیچی تێدا نیە، وەک وتەی پێغەمبەر (ﷺ) باسی نیشانەکانی قیامەت دەکات: (أن تلد الأمة ربتها)، سەبارەت بە وشەی: (ربتها)، هیچ کێشەی تێدا نیە لەبەر (تاء التأنیث)، هیچ هاوبەشی نیە لەگەڵ خوا، چونکە (الله) پێی ناگوترێ مەگەر (رب) بێت، فەرموودەی شتی بزر بوو: (حتى يجد ربها)، هەندێک لە ئەهلی علم دەڵێن: فەرموودەی ئاژەڵی بزر بوو عیبادەت و زەلیلی پێی ناکرێت وەک مرۆڤ نیە، ئەوەی ڕاست بێت هیچ جیاوازی نیە، چونکە ئاژەڵ عیبادەتی خوا دەکات بە عیبادەت کردنێکی تایبەت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَرَى أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِنْ النَّاسِ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ الْعَذَابُ وَمَنْ يُهِنْ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ مُكْرِمٍ إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ﴾، سەبارەت بە خەڵک دەفەرمووێت: ﴿وَكَثِيرٌ مِنْ النَّاسِ﴾ ﴿وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ الْعَذَابُ﴾ {العذاب:١٨}، لەسەر ئەمە دروستە بڵێیت: (أطعم الرقيق ربه)، وە وشەی تری هاوشێوەی ئەمە.

بەشی سێیەم: (رب) دەدرێتە پاڵ ضمیری متکلم، بەندە دەڵێت: ئەمە ڕەببی منە، ئایا ئەمە دروستە؟

لەوانەیە یەکێک بڵێت: ئەمە دروستە، چونکە ئەمە لە بەندە بۆ سەیدەکەیەتی، خوای گەورە سەبارەت بە هاوەڵی یوسف دەفەرموویێت: ﴿إن ربى أحسن مثواى﴾ {یوسف:٢٣}، واتە: سەیدی، چونکە قەدەغە کراو لە وتەی: (ربي) زەلیلی بەندەیە، ئەمە نەفی یە، چونکە خۆی دەڵێت: (هذا ربي).

بەشی چوارەم: دەدرێتە پاڵ ناوێکی ظاهر، ظاهری فەرموودەکە وادیارە دروستە، ئەمە وتەی ڕاستە ئەگەر هیچ قەدەغە کراوێک نەبێت ئەگەر هەبوو ڕێگری دەکرێت، نموونە: ئەگەر گوێگر وا گومان ببات سەید ڕەببی حەقیقی یە و خالقە)[1].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە فەرمان هەندێک جار بۆ (إباحة) دێت، لەبەر وتەی (وليقل: سيدي ومولاي)، زانایان دەڵێن فەرمان ئەگەر هات بەرامبەر شتێکی قەدەغە کراو ئەوا بۆ (إباحة)یە، لێرە فەرمان بەرامبەر شتێکی قەدەغە کراوە، وەک وتەی خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وإذا حللتم فاصطادوا﴾ {المائدة:٢}[2].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دینی ئیسلام بەرفراوانی تێدایە، هەر شتێک مرۆڤ پێویستی پێی هەبێت بەرفراوانی تێدایە، حوکم نادرێت بەسەر خەڵک قسە بە هیچ شتێک مەکە یان فلاّنە شت مەکە ئیلا دەرگایەک کراوەتەوە بەرامبەری، ئەمەش لە تەواوی شەریعەتە[3].

---

[1] القول المفيد (٣/١٢٢-١٢٣).
[2] القول المفيد (٣/١٢٩).
[3] القول المفيد (٣/١٢٩).

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ (سد الذرائع)، هەر شتێک سەر بکێشێت بۆ شتێکی قەدەغە کراو ڕێگری کراوە، ئەمە قاعیدەیەکی گەورەیە، لای أصولی یەکان پێی دەڵێن: (قاعدة سد الذرائع)[1].

**٦-** ئەگەر (سیدة) بۆ ئافرەت بەکار نەهێنرێت باشترە، چونکە وەرگێڕانی ڕاستی یەکانە.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (لەناو خەڵک واباوە وشەی سيدة بۆ ئافرەت بەکاردێت، نموونە دەڵێن: ئەمە تایبەتە بە پیاوان، ئەمەش تایبەتە بە ئافرەتان، بەڵام ئەمە وەرگێرانی ڕاستی یەکانە، چونکە (سادة) پیاوەکانن، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وألفيا سيدها لدا الباب﴾، وە دەفەرمووێت: ﴿الرجال قوامون على النساء﴾ {النساء:٣٤}، وە پیغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (إن النساء عوان عندكم)، واتە: وەک ئەسیر وان لە لاتان، سەبارەت بە پیاو دەفەرمووێت: (راع في أهله مسئول عن رعيته)[2].

---

[1] إعانة المستفيد (٣٠٩/٢).

[2] القول المفيد (١٢٦/٣).

## باب لا يرد من سأل بالله

**عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: قال رسول الله (ﷺ): (من استعاذ بالله فأعيذوه، ومن سأل بالله فأعطوه، ومن دعاكم فأجيبوه، ومن صنع إليكم معروفا فكافئوه، فإن لم تجدوا ما تكافئونه فادعوا له حتى ترون أنكم قد كافأتموه). رواه أبو داود والنسائي بسند صحيح**[١].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** إعاذة من استعاذ بالله.

**الثانية:** إعطاء من سأل بالله.

**الثالثة:** إجابة الدعوة.

**الرابعة:** المكافأة على الصنيعة.

**الخامسة:** أن الدعاء مكافأة لمن لم يقدر إلا عليه.

**السادسة:** قوله: (حتى ترون أنكم قد كافأتموه).

---

[١] أخرجه أبو داود (١٦٧٢)، والنسائي (٨٢/٥)، وفي (الكبرى) (٢٣٤٨)، وأحمد (٦٨/٢)، وصححه العلامة الألباني رحمه الله في "الصحيحة" (٢٥٤).

# باب لا يرد من سأل الله

## هەر کەسێک بەناوی خواوە داوای شتێکی کرد نابێت ڕەت بکرێتەوە

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (دانەری کتاب ئەم بابەی باسکردووە لەبەر بەگەورە دانانی خوای گەورە بەوەی هەر کەسێک بە ناوی خواوە داوای کرد پێی ببەخشن، فەرموودەی ابن عمر وشەی پوخت و پڕ مانای تێدایە دراوە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ))[1].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەم بابە لەگەڵ بابی پێشووتر و دواتر هەروەک باسمان کرد هەموویان باسی بەگەورە دانانی خوای گەورە دەکەن لە پەروەردگاریەتی و ناو و سیفەتدا، چونکە بەگەورە دانانی ئەمە لە تەواوی تەوحید و تەحقیقی تەوحیدە، هەر کەسێک داوا بکات بە خوا ئەوا بە کەسێکی گەورە داوای کردووە، هەرکەسێک پەنای گرت بە خوا ئەوا پەنای گرتووە بە کەسێکی گەورە، بەڵکو پەنای گرتووە بە کەسێک کە مالکی هەموانە و هەموو کارەکان بە دەست خۆیەتی و بەڕێوەیان دەبات، چۆن ڕەت دەکرێتەوە کە مالکی هەموو شتێکە، لەبەر ئەوە لە بەگەورە دانانی خوا و واجبی بەگەورە دانان ئەوەیە کەس ڕەت نەکەیتەوە ئەگەر بەناوی خواوە داوای کرد، ئەگەر کەسێکیش بەناوی خواوە داوای کرد و خوای گەورەی کردە وەسیلە نابێت ڕەت بکرێتەوە، ئەوەی گەورەیی خوای لە دڵ دایە دڵی دەلەرزێت ئەگەر باسی خوای گەورە کرا لەلای، هەروەک خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ {الأنفال:٢}، تەنها بە باسکردنی خوای گەورە دڵی دەلەرزێت

---

[1] التعليق المفيد لاپەڕە (٢٤٥).

لەبەر ئەوەی زانستی بە خوای گەورە هەیە، ئەگەر یەکێک بەناوی خواوە داوای شتێکی کرد ئەوا دڵی یەکخواپەرست ڕەتی ناکاتەوە، چونکە خوا بەگەورە دادەنێت و کەس ڕەت ناکاتەوە ئەگەر کەسەکە خوا بکاتە وەسیلە بۆ داوای خۆی)[١].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم بابە بەگەورە دانانی خوای گەورەی تێدایە و ئەمە لە تەواوی تەوحیدە، سەبارەت بەوەی ئەگەر کەسێک داوا بکات بەناوی خواوە بێ ڕەوشتی تێدایە سەبارەت بە مافی خوای گەورە، هەروەها ڕەت کردنەوەی نەقسی تەوحیدی تێدایە)[٢].

---

[١] التمهید لاپەڕە (٤٩٥-٤٩٦).

[٢] إعانة المستفید (٣١١/٢).

**عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: قال رسول الله (ﷺ): (من استعاذ بالله فأعيذوه، ومن سأل بالله فأعطوه، ومن دعاكم فأجيبوه، ومن صنع إليكم معروفا فكافئوه، فإن لم تجدوا ما تكافئونه فادعوا له حتى ترون أنكم قد كافأتموه). رواه أبو داود والنسائي بسند صحيح.**

واته: له ابن عمر دەگێڕنەوە خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێک پەنای گرت بە خوا پەنای بدەن، وە هەر کەسێکیش داوای کرد بەناوی خواوە پێی ببەخشن، وە هەر کەسێکیش دەعوەتی کردن بڕۆن بە دەم دەعوەتەکەیەوە، وە هەر کەسێکیش هەر چاکەیەکی لەگەڵتاندا کرد ئێوەش پاداشتی بدەنەوە، ئەگەر نەتان بوو یان نەتان توانی ئەوا ئەوەندە دوعای بۆ بکەن هەتا وا دەزانن کە پاداشتان داوەتەوە).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(من سأل بالله):** واتە: هەر کەسک داوای کرد بەناوی خواوە.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

قەرعاوی دەفەرمووێت: (فەرموودەکە بەڵگەیە واجبە هەر کەسێک داوای کرد بەناوی خواوە پێی ببەخشن، وە حەڕامە ئەو کەسە ڕەت بکەیتەوە کە بەناوی خواوە داوا دەکات، ئەمە نەفی بەگەورە دانانی خوای گەورە و نەفی تەوحید دەکات)[1].

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە ئەگەر کەسێک داوای شتێکی کرد بەناوی خواوە، دەبێت پێی ببەخشی ئەگەر داواکردنەکە تاوان نەبێت، یان زیانی لەسەر لێپرسراوێک

---

[1] الجديد لاپەڕە (٤١٦-٤١٧).

نەبێت، چونکە بە پێ بەخشینی حاجەتی کەسەکە جێ بەجێ دەبێت و خوای گەورە بە گەورە دانرا، مەرج نیە داوا بکات بە ناوی الله، بەڵکو بە هەر ناوێکی تری خوای گەورە داوا بکات هەمان شتە، هەروەک فریشتە هاتە لای ئەو سێ کەسانەی کوێر و کەچەڵ و بەلەک گوتی (أسألك بالذي أعطاك كذا و كذا)[١].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە وەڵام دانەوەی دەعوەت واجبە، زانایان دەڵێن وەڵام

دانەوەی دەعوەت دوو جۆرە:

جۆری یەکەم: دەعوەتی ژن گواستنەوە، جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بە حوکمی وەڵام دانەوەی وەلیمە، سێ وتە هەیە:

یەکەم: زۆربەی زانایان بۆ ئەوە چوون وەڵام دانەوەی دەعوەتی وەلیمە واجبە، بەڵکو هەندێک زانا ئیجماع نقڵ دەکەن.

دووەم: هەندێک زانای تر بۆ ئەوە چوون وەڵام دانەوەی وەلیمە سوننەتە، کە ئەمە وتەی هەندێک لە شافعی و حەنابلەیە.

شەوکانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (ئەوەی دیار بێت واجبە وەڵامی دەعوەتی وەلیمە بدرێتەوە، لەبەر جێگیر بوونی فەرمان بۆ وەڵام دانەوە، بێ ئەوەی هیچ دەقێک هاتبێت لە واجب لایبدات بۆ سوننەت و لەبەر ئەوەی هەر کەسێک وەڵام نەداتەوە سەرپێچی خوا و پێغەمبەری کردووە)[٢].

---

[١] القول المفيد (٣/١٣٥-١٣٦).

[٢] نيل الأوطار (٦/٢٠٢).

ابن عبدالبر ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (نەم زانیوە جیاوازی هەبێت لەنێوان زانایان سەبارەت بە وەڵام دانەوەی وەلیمە بۆ کەسێک کە دەعوەت کرا بێت ئەگەر دەعوەتەکە هیچ خراپە و بێ شەرعیەکی تێیدا نەبێت)[١].

وەڵام دانەوەی دەعوەتی ژن گواستنەوە واجبە، کە ئەمە ڕاستە و وتەی زۆربەی زانایانە، وەڵام دانەوەی دەعوەتی وەلیمە مافی مرۆڤەکانە، لەسەر ئەمە وەڵام دانەوەی وەلیمە لادەچێت لەسەر ئەو کەسەی دەعوەت کراوە ئەگەر ئیزنی وەرگرت و داوای اعتزاری کرد لە خاوەنی دەعوەت.

جۆری دووەم: دەعوەتی بێجگە لە ژن گوستنەوە، جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بە دەعوەتە. دوو وتە هەیە:

یەکەم: زۆربەی زانایان بۆ ئەوە چوون وەڵام دانەوەی دەعوەتی بێجگە لە وەلیمە

سوننەتە، سەرخەسی ئیجماع نقل دەکات،

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەوەی واجبی دەعوەت تایبەت بکات بە دەعوەتی وەلیمە ئەوا هیچ بەڵگەی بە دەستەوە نیە، چونکە وەلیمە خواردنی دڵ خۆشی یە، دەعوەتی ژن گواستنەوە و دەعوەتی تر دەگرێتەوە، پیغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (من لم یجب الدعوة)، نەی فەرموو هەر کەسێک وەڵامی دەعوەتی ژن گواستنەوە نەداتەوە)[٢].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: ئایا وەڵام دانەوەی دەعوەتی بێجگە لە وەلیمە واجبە یان نا؟

---

[١] التمهيد (١٠/١٧٠).

[٢] التعليق المفيد.

دەڵێین: جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان، ظاهری بۆ ئەوە چوون واجبە وەڵامی دەعوەت بدەیتەوە، ئەگەر ئەو مەرجانەی باسمان کرد تیایدا بوون.

زۆربەی زانایان بۆ ئەوە چوون واجب نیە بەڵکو سونەتە، بە پێچەوانەی وەلیمەی ژن گواستنەوە، ئەمە وتەی ڕاستە چونکە مەشەقەتە لەسەر خەڵک، ئەگەر واجبی بکەین لەسەر هەر کەسێک کە بانگ بکرێت ئەوا دەبێت کاتی خۆی هەموو تەرخان بکات بۆ دەعوەتەکان)[١].

وتەی ڕاست وەڵام دانەوەی دەعوەتی بێجگە لە ژن گواستنەوە سونەتە، والله أعلم.

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک پەنای گرت بە خوا واجبە پەنای بدەن[٢].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک هەر چاکەیەکی کرد لەگەڵتاندا ئێوەش پاداشتی بدەنەوە.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک هەر چاکەیەکی کرد لەگەڵتاندا ئێوەش پاداشتی بدەنەوە، ئەگەر نەتان بوو یان نەتان توانی ئەوا ئەوەندە دوعای بۆ بکەن هەتا وا دەزانن کە پاداشتان داوەتەوە)[٣].

---

[١] فتح ذي الجلال والإكرام (١١/٣٧٨).

[٢] إعانة المستفيد (٢/٣١٣-٣١٤).

[٣] إعانة المستفيد (٢/٣١٣-٣١٤).

## باب لا يسأل بوجه الله إلا الجنة

**عن جابر رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (لا يسأل بوجه الله إلا الجنة). رواه أبو داود[1].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** النهي عن أن يسأل بوجه الله إلا غاية المطالب.

**الثانية:** إثبات صفة الوجه.

---

[1] أخرجه أبو داود (١٦٧١).

# باب لا يسأل بوجه الله إلا الجنة

## داوا لەخوا ناكرێت بە ڕوخساری خوا مەگەر بۆ بەهەشت نەبێت

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (مناسبەی ئەم بابە لە كتابی تەوحید ئەوەیە: بەگەورە دانانی ڕوخساری خوای گەورەی تێدایە، بەجۆرێك داوای پێ ناكرێت ئیلا بەهەشت نەبێت)[١].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (مناسبەی ئەم بابە لە كتابی تەوحید دیارە ئەویش ئەوەیە بە گەورە دانانی سیفەتە زاتی و فعلییەكانی خوای گەورە لە تەحقیقی تەوحید و لە تەواوی ڕەوشتە بەرامبەر بە خوای گەورە و بە گەورە دانانیەتی، بەگەورە دانانی خوا و ناو و سیفەتەكانی بە زۆر شتە، لەوانە داوا نەكرێت بە ڕوخساری خوا یان سیفەتەكانی خوا مەگەر بۆ داواكارییەكی گەورە نەبێت كە بەهەشتە)[٢].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (دانەری كتاب ئەم بابەی لە كتابی تەوحید باسكردوە چونكە بە گەورە دانانی سیفەتەكانی خوای گەورە لە بەگەورە دانانی خوای گەورەیە، وە بەگەورە دانانی ناو و سیفەتەكانی خوا لە تەوحیدە، سەبارەت بە گەورە دانەنانی نەقسە لە تەوحید چونكە بەكەم دانانی خوای تێدایە)[٣].

---

[١] القول المفيد (١٤٤/٣).

[٢] التمهيد لاپەڕە (٤٩٩).

[٣] إعانة المستفيد (٣١٧/٢).

**عن جابر رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (لا يسأل بوجه الله إلا الجنة). رواه أبو داود.**

واته: له جابر دەگێرنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (داوا لەخوا ناکرێت بە ڕوخساری مەگەر بۆ بەهەشت نەبێت، واتە: کە بە ڕوخساری خوا داوا لەخوا کرا نابێت جگە لە بەهەشت داوای شتی تر بکرێت).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە و ماناکەی:**

**(لا يسأل بوجه الله إلا الجنة):** جیاوزی هەیە لە مەبەستی ئەم فەرموودەیە، بۆ ئەمەش دوو وتە هەیە:

وتەی یەکەم: کەس با داوا لە دروستکراوەکان نەکات بە ڕوخساری خوا، ئەگەر ویستت داوا لە دروستکراوەکان بکەیت ئەوا داوایان لێ مەکە بە ڕوخساری خوا، چونکە داوا ناکرێت بە روخساری خوا مەگەر بۆ بەهەشت نەبێت، دروستکراوەکان ناتوانن بەهەشتت پێ بدەن، کەواتە نابێت بە هیچ شێوەیەک داوایان لی بکەیت بە ڕوخساری خوا، ئەوەی دیار بێت دانەری کتاب ئەم مانایەی لا پەسەندە، بۆیە ئەم بابەی بەدوای (باب لا يرد من سأل بالله) باسکردووە.

دووەم: ئەگەر داوات لەخوا کرد و داوای بەهەشت و چوونە بەهەشتت کرد، هیچی تێدا نیە بە ڕوخساری خوای گەورە داوا بکەیت، ئەگەر شتێکی دونیاییت داوا کرد بە ڕوخساری خوا داوا مەکە، چونکە ڕوخساری خوای گەورە لەوە گەورەترە شتی دونیایی پێ داوا بکەیت، ئاخیرەت داوا دەکرێت بە ڕوخساری خوا وەک: داوات لێ دەکەم بە ڕوخساری خۆت لە ئاگر ڕزگارم بکەیت،...

ئەگەر بگوترێ هەردوو مانا هەڵدەگرێت، ئەوەی ڕووی هەیە بۆ بەهێزی)[١].

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوون بکاتەوە باش نییە داوای بێجگە لە بەهەشت بە ڕوخساری خوا بکەیت.

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئەگەر بە ڕوخساری خوا داوا لەخوا کرا نابێت جگە لە بەهەشت داوای شتی تر بکرێت.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی ڕوخسار بۆ خوای گەورە، ئەمە جێگیر بووە بە قورئان و سوننەت و یەک دەنگی پێشینەکان، قورئان:

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلاَّ وَجْهَهُ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ {القصص:٨٨}.

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَالَّذِينَ صَبَرُوا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ﴾ {الرعد:٢٢}. ئایەتەکان زۆرن

سەبارەت بە جێگیرکردنی ڕوخسار بۆ خوای گەورە، سەبارەت بە فەرموودە فەرموودەی پێشووتر: (أعوذ بوجهك).

---

[١] القول المفيد (١٤٥/٣).

ئەهلی تعطیل دەڵێن (الوجە) دەلەلات لەسەر زات دەکات یان ڕوو یان پاداشت، دەڵێن: ئەگەر ڕوخسارمان بۆ جێگیرکرد دەبێت لاشەشی هەبێت، لاشەکانیش وەک یەکتر وان تمثیل دروست دەبێت، خوای گەورە هاوشێوەی نیە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿لیس كمثله شيء﴾ {الشورى:١١}، جێگیرکردنی مثل بەدرۆخستنەوەی قورئانە، ئێوە ئەهلی سوننە دەڵێن: هەر کەسێک باوەڕی وابێت خوای گەورە هاوشێوەی هەیە کافرە، ئێمە پێیان دەڵێین:

یەکەم: ئێوە دەڵێن مانای لاشەش لەخۆ دەگرێت و کەچی ڕادەکەن لێی:

أ- ئەگەر مەبەستان ئەوە بێت لاشە لێکدراوە لە ئێسک و دەمار و خوێن بە جۆرێک هەر ئەندامێک پێویستی بە ئەندامی تر هەیە؟ ئەوا ئێمەش هەمان وتەی ئێوە دەڵێین و نەفی ڕوخسار دەکەین.

ب- ئەگەر مەبەستان بە لاشە زاتێکی حەقیقی و وەسف کراو بێت بە سیفەتی تەواو، ئەوا هیچ قەدەغە کراوی تێدا نیە، خوای گەورە وەسفی نەفسی خۆی دەکات بە (صمد)، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢﴾ [الإخلاص: ١-٢]، ابن عباس خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت دەفەرموویێت: (الصمد): ئەوەیە کە بۆشایی نیە، واتە گەدەی نیە.

دووەم: وتەی ئێوە کە دەڵێن لاشەکان وەک یەکتر وان ئەمە درۆیە، ئایا لاشەی ورچ وەک لاشەی مێرولە وایە؟ لەنێوانیاندا جیاوازییەکی زۆر هەیە لە قەبارە و نەرمی و شتی تر[1].

---

[1] القول المفيد (١٤٥/٣).

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە تەوەسول بە سیفات دەکرێت نەک داوا لە سیفەتەکان بکرێت، زانایان دەڵێن وتنی: (یا وجه الله) دوو ئەگەری هەیە:

یەکەم: ئەگەر مەبەست پێی زات بێت ئەوا دروستە.

دووەم: ئەگەر مەبەست پێی زات نەبێت بەڵکو مەبەست پێی وجه (ڕوخسار) بێت ئەوا دروست نیە.

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (دروست نیە بۆ هیچ موسڵمانێک داوا لە سیفەتەکانی خوا بکات لەلای هەموو زانایان، وەک ئەوەی بڵێی: (یا وجه الله)، یان (یا علم الله) فڵانە شتم بۆ بکە و داوام قبوڵ بکە، بەڵکو داوا لەخوا دەکرێت بە ناوە جوانەکانی و دەگوترێ: (یا رحمن)، سیفەتەکان تەوەسولیان پێ دەکرێت، ابن تیمیە دانی بەمە ناوە و یەک دەنگی زانایان هەیە لەسەر ئەمە)[1].

پرسیار لە عبدالرحمن ناصر البراك کراوە بەوەی: حوکمی ئەو کەسە چییە ئەگەر سەرسام بوو بە شتێک و بڵێت: (یا وجه الله)؟

لە وەڵام دا دەفەرمووێت: (نەخێر هەڵەیە، با بڵێ: (یا الله)، ئەمە دوعایە ڕێگەپێدراو و باسکراوە و مانای زانراوە).

---

[1] التعليق المفيد لاپەڕە (٢٤٦).

## باب ما جاء في اللو

**وقول الله تعالى: ﴿يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَاهُنَا﴾ {آل عمران:١٥٤}.**

**وقوله: ﴿الَّذِينَ قَالُواْ لإِخْوَانِهِمْ وَقَعَدُواْ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا﴾ {آل عمران:١٦٨}.**

**في الصحيح عن أبي هريرة أن رسول الله (ﷺ) قال: (احرص على ما ينفعك، واستعن بالله ولا تعجزن، وإن أصابك شيء فلا تقل لو أني فعلت لكان كذا وكذا؛ ولكن قل: قدر الله وما شاء فعل، فإن لو تفتح عمل الشيطان)**[1].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تفسير الآيتين في آل عمران.

**الثانية:** النهي الصريح عن قول: لو، إذا أصابك شيء.

**الثالثة:** تعليل المسألة بأن ذلك يفتح عمل الشيطان.

**الرابعة:** الإرشاد إلى الكلام الحسن.

**الخامسة:** الأمر بالحرص على ما ينفع مع الاستعانة بالله.

**السادسة:** النهي عن ضد ذلك وهو العجز.

---

[1] أخرجه مسلم (٢٦٦٤).

## باب ما جاء في اللو

## باسی بەکارهێنانی وشەی (ئەگەر) بۆ ڕابردوو

صالح آل الشيخ خوا بتپارێزێت دەفەرموویێت: (دڵی ئیمانداری یەکخواپەرست تەحقیقی تەوحیدی نەکردووە هەتا نەزانێت هەموو شتێک لەژێر قەزا وقەدەری خوای گەورەیە دایە، ئەوەی دەیکاتە ۆکارێکە لە هۆکارەکان کە خوای گەورە هەمووی تقدیر کردووە لە ڕابردوودا بۆ دروستکراوەکان، چەند هەوڵ بدات و کردەوە بکات ناتوانێت ببێتە بەربەست لەبەردەم قەدەری خوای گەورە، ئەگەر دڵ خوای گەورەی بە گەورە دانا لە تەسەڕوفات ئەوا تووشی ئەگەر و تەمەننی نابێت دوای ڕوودانی شتەکە، ئەگەر فلانە شتی کردبا ئەوا ڕووی نەدەدا ئەمە هەڵەیە و نابێت، بەڵکو واجبە بزانێت کە قەدەری خوای گەورەیە جێ بەجێ بووە، پێش ئەوەی کردەوەکە بکرێت لە قەدەر هەمووی نووسراوە و دەبێت ئیلا ببێت، بەندە ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو و بیگۆڕێ، ئەگەر وشەی "لو" و "لیت" و وشەکانی تری هاوشێوەی ئەمانەی بەکارهێنا کە دەلالەت لە سەر پەشیمان بوونەوە و خەم و خەفەت خواردن دەکەن ئەوا دڵ لاواز دەبێت و پەیوەست دەبێت بە هۆکارەوە)[1].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (دانەری کتاب ئەم بابەی بە کراوەیی باسکردووە بێ ئەوەی بە شێوەیەکی بڕاوە حوکم بەسەر شتێک بدا، چونکە "لو" بەکاردێت لە چەند ڕوویەک:

یەکەم: بەکاردەهێنرێت وەک ڕەخنە گرتن لە شەرع، ئەمەیان حەڕامە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا﴾ {آل عمران:١٦٨}، لە غەزوەی ئوحود کاتێک لە ڕێگا دواکەوتن عبدالله بن أبي و هاوەڵانی کە سێیەکی جەیش دەبوون، کاتێک حەفتا پیاو لە موسڵمانان شەهید بوون دووڕووەکان ڕەخنەیان لە تەشریعی پیغەمبەر گرت و گوتیان: ئەگەر بە گوێی ئێمەیان بکردایا ئەوا دەگەڕانەوە وەک ئێمە و نەدەکوژران، ئێمە وامان دەبینی خێر لە شەرعی محمد دایە، ئەمەیان حەڕامە و دەگاتە کوفر.

دووەم: بەکاردەهێنرێت وەک ڕەخنە گرتن لە قەدەر، ئەمەشیان حەڕامە، خوای گەورە

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٥٠٢-٥٠٣).

دەفەرموویت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَكُونُوا كَالَّذِينَ كَفَرُوا وَقَالُوا لإِخْوَانِهِمْ إِذَا ضَرَبُوا فِي الأَرْضِ أَوْ كَانُوا غُزًّى لَوْ كَانُوا عِنْدَنَا مَا مَاتُوا وَمَا قُتِلُوا لِيَجْعَلَ اللَّهُ ذَلِكَ حَسْرَةً فِي قُلُوبِهِمْ وَاللَّهُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ {آل عمران:١٥٦}، ئەگەر ئەوان مابوانەوە نەدەكوژران، ئەوان ڕەخنەیان دەگرت لە قەدەری خوای گەورە.

سێیەم: بەكاردەهێنرێت بۆ پەشیمان بوونەوە و خەم و خەفەت خواردن، ئەمەشیان حەڕامە، چونكە شتێك دەرگای پەشیمان بوونەوەت بۆ بكاتەوە ئەوا نەهی لێ كراوە، چونكە پەشیمان بوونەوە نەفس تووشی خەم و خەفەت و دڵ تەنگی دەكات، خوای گەورە دەیەوێت دڵ خۆش و ئارام بیت، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (احرص على ما ينفعك، واستعن بالله ولا تعجزن، وإن أصابك شيء فلا تقل لو أني فعلت لكان كذا وكذا؛ ولكن قل: قدر الله وما شاء فعل، فإن لو تفتح عمل الشيطان).

نموونە: پیاوێك سوور بوو لەسەر كڕینی شتێك و گومانی برد قازانج دەكات، دواتر زەرەری كرد، ئەگەر نەم كڕیبا تووشی زەرەر نەدەبووم، ئەمەیان پەشیمان بوونەوە و خەم خواردنە، ئەمە زۆر ڕوودەدات و نەهی لێ كراوە.

چوارەم: بەكاردەهێنرێت بۆ كردنە بەڵگەی قەدەر لەسەر تاوان، وەک وتەی موشریكەكان: ﴿لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا﴾ {الأنعام:١٤٨}، وە وتەیان: ﴿وَقَالُوا لَوْ شَاءَ الرَّحْمَنُ مَا عَبَدْنَاهُمْ﴾ {الزخرف:٢٠}، ئەمەیان باطلە.

پێنجەم: بەكاردەهێنرێت بۆ ئاوات خواست و خۆزگە، حوكمەكەی بەگوێرەی ئاوات خواستنەكەیە، ئەگەر خێر بێت ئەوە خێرە و ئەگەر شەڕیش بێت ئەوە شەڕە، فەرموودەی صحيح هاتووە چیرۆكی ئەو چوار كەسەی یەكێكیان دەڵێت: (لو أن لي مالا لعملت بعمل فلان)، ئەمە ئاوات خواستنی خێرە، دووەمیان گوتی: (لو أن لي مالا لعملت بعمل فلان)، ئەمەیان ئاوات خواستنی شەڕە، پێغەمبەر (ﷺ) بە كەسی یەكەم فەرمووی: (فهو بنيته، فأجرهما سواء)، سەبارەت بە دووەمیان فەرمووی: (فهو بنيته، فوزرهما سواء).

شەشەم: بەكاردەهێنرێت تەنها بۆ خەبەر ئەمەیان دروستە، نموونە: ئەگەر ئامادەی دەرس ببومایە سوودم وەردەگرت، لەوانە وتەی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (لو استقبلت من

أمري ما استدبرت ما سقت الهدي ولأحللت معكم))[١].

---

[١] القول المفيد (٣/١٥١-١٥٣).

**وقول الله تعالى:** ﴿يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَاهُنَا﴾ {آل عمران:١٥٤}.
واته: خوای گەورە دەفەرموویت: (دووڕووەکان گوتیان: ئەگەر لەو کارەدا شتێکمان بەدەست بوایە لێرەدا نەدەکوژراین، بڵێ ئەگەر لەناو ماڵەکانتاندا بوونایە ئەوا ئەوانەی کوشتنیان لەسەر نووسراوە کوشتنەکە بۆیان دەچووە ئەو شوێنەی کە دەبوایا تیایدا بمرن).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿يَقُولُونَ﴾: ضمیر بۆ دووڕووەکان دەگەڕێتەوە.

﴿هَاهُنَا﴾: واتە: لێرە، مەبەستی پێی جەنگی ئوحودە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم ئایەتەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە واجبە موسڵمان تەسلیم بێت بە قەزا و قەدەری خوای گەورە، چونکە لە تەواوی تەوحیدە و نابێت وشەی ئەگەر بۆ ڕابردوو بەکاربهێنێت.

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

١- ئەم ئایەتە بەڵگەیە بەکارهێنانی وشەی ئەگەر"لو" دوای قەدەری خوای گەورە هیچ سوودی نیە، چونکە خوای گەورە دەفەرموویت "بڵێ ئەگەر لەناو ماڵەکانتاندا بوونایە ئەوا ئەوانەی کوشتنیان لەسەر نووسراوە کوشتنەکەیان بۆ دەچووە ئەو شوێنەی کە دەبوایا تیایدا بمرن"، ڕاکردن نیە لە قەزای خوای گەورە[1].

---

[1] تفسیر سورة آل عمران (٣٣٨/٢).

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە حەڕامە اعتراض لە شەرع و قەدەر بگریت.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (وتەی: ﴿يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَاهُنَا﴾:

١- ئەمەیان ڕەخنە گرتنە لە شەرع، چونکە ئەوان ڕەخنەیان لە پێغەمبەر گرت بەوەی دەرچووە بۆ جەنگ بێ موافقەیان.

٢- دەکرێت اعتراض بێت لە قەدەر، واتە: ئەگەر ئێمە بیروڕای جوان و باشمان هەبوایا دەرنەدەچووین بە کوشتن)[1].

قەرعاوی دەفەرموویێت: (ئەم ئایەتە بەڵگەیە حەڕامە اعتراض لە قەدەر بگریت)[2].

**٣-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە واجبە تەسلیم ببیت بۆ قەزا و قەدەری خوای گەورە، چونکە ئەمە لە تەواوی تەوحیدە[3].

---

[1] القول المفيد (١٥٤/٣).

[2] الجديدلاپەڕە (٤٢١).

[3] الجديد لاپەڕە (٤٢١).

**وقوله:** ﴿الَّذِينَ قَالُواْ لإِخْوَانِهِمْ وَقَعَدُواْ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا﴾ {آل عمران:١٦٨}.

واتە: خوای گەورە دەفەرموویێت: (ئەوانەی لەبارەی براكانیانەوە گوتیان و خۆشیان نەچوون بۆ غەزا، ئەگەر بە قسەی ئێمەیان بكردایە ئەوان نەدە كوژران، بڵێ: دەی مردن لەخۆتان دوور بخەنەوە ئەگەر ڕاستگۆن).

### ڕاڤەی وشەكانی ئایەتەكە:

﴿الَّذِينَ قَالُواْ لإِخْوَانِهِمْ﴾: واتە: ئەوانەی لەبارەی براكانیانەوە گوتیان، برا لێرە دوو ئەگەری هەیە:

١- لە ڕووكەشدا بران و بە برا حساب دەكرێن، چونكە دووڕوو مامەڵەی موسڵمانی لەگەڵ دەكرێت لە دونیا.

٢- برا واتە لە نەسەب.

ئەوەی دیار بێت مانای یەكەمە، چونكە دووڕووەكان مەبەستیان هەموو ئەوان بوون كە ئامادەبوون لە جەنگ، هەروەها ئەوانەی كوژران هەموویان برای نەسەبی ئەوان نەبوون.

### هۆكاری باسكردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

صالح آل الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (مناسبەی ئەم دوو ئایەتە لەم بابە ئەوەیە: پەشیمان بوونەوە و خەم خواردن لەسەر ڕابردوو بە وشەی "ئەگەر" سیفەتی دووڕووەكانە، خوای گەورە سەبارەت بە دووڕووەكان دەفەرموویێت: ﴿يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَاهُنَا﴾، وە دەفەرموویێت: ﴿الَّذِينَ قَالُواْ لإِخْوَانِهِمْ وَقَعَدُواْ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا﴾

{آل عمران:١٦٨}، ئەمە چیرۆکی غەزای ئوحودە کە زانراوە و ئەمە وتەی دووڕووەکانە، کەواتە بەکارهێنانی ئەگەر سیفەتی دووڕووەکانە، ئەمە بەڵگەیە حەڕامە)[١].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە بەکارهێنانی وشەی (ئەگەر) حەڕامە دوای جێ بەجێ بوونی قەدەری خوای گەورە، چونکە سیاقەکە سیاقی زەمە، لەبەرئەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (وإن أصابك شيء فلا تقل لو أني فعلت لكان كذا وكذا)، ئەگەر مرۆڤ وەک خەبەر بیڵێت نەک وەک اعتراض، هەروەها پەشیمان و خەم و خەفەت ڕووی تێ نەکات لەوەی کە ڕوویداوە ئەوا هیچی تێدا نیە)[٢].

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە دووڕووەکان بە وتە و کردەوە تووشی خراپە بوون، ئەمەش وەردەگیرێت لە وتەی: (قالوا)، (وقعدوا)، ناشیرینی کردەوەیان نەچوو بوون بۆ جەنگ، وە ناشیرینی قسەشیان ئەوە بوو گوتیان: ﴿لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا﴾)[٣].

**٣-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە مامەڵە لەگەڵ خەڵک دەکرێت بە ڕووکەش[٤].

---

[١] التمهيد لاپەڕە (٥٠٤).

[٢] تفسير سورة آل عمران (٤٣١/٢).

[٣] تفسير سورة آل عمران (٤٣٠/٢).

[٤] تفسير سورة آل عمران (٤٣٣/٢).

**في الصحيح عن أبي هريرة أن رسول الله (ﷺ) قال: (احرص على ما ينفعك، واستعن بالله ولا تعجزن، وإن أصابك شيء فلا تقل لو أني فعلت لكان كذا وكذا؛ ولكن قل: قدر الله وما شاء فعل، فإن لو تفتح عمل الشيطان).**

واته: له ئەبو هورەیرەوه خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (پێداگر به لەسەر ئەوەی سوودت پێ دەگەیەنێت، لەوەشدا بەخۆت پشت ئەستور مەبە و داوای کۆمەکی و یارمەتی لەخوا بکە، تەمبەڵی و ئیهمالی مەکە، ئەگەر تووشی شتێک بوویت پێت ناخۆش بوو ئەو کاتە بزانە "قەدەری خوایە" و مەڵێ: ئەگەر ئاوا و ئاوام بکردایە ئاوا و ئاوا دەبوو، بەڵکو بڵێ: ئەوە قەدەری خوایە، خوا چی ویست بیکات، کردی، چونکە گوتنی ئەگەر بۆ ڕابردوو دەرگای کاری شەیتان دەکاتەوە).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(احرص على ما ينفعك):** واته: پێداگر به لەسەر ئەوەی سوودت پێ دەگەیەنێت.

**(واستعن بالله): واته:** داوای کۆمەکی و یارمەتی له خوا بکە.

**(ولا تعجزن): واته:** تەمبەڵی و ئیهمالی مەکە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە تاوەکو ڕوونی بکاتەوە واجبە باوەڕت به قەزاو قەدەر هەبێت و واجبە وشەی "ئەگەر" تەرک بکەیت له کاتی دابەزینی موسیبەت و ناخۆشی.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی سیفەتی خۆشەویستی بۆ خوای گەورە، وە خۆشەویستی یەکە جیاوازە لە ئیماندارێکەوە بۆ ئیماندارێکی تر، بە گوێرەی بەهێزی و لاوازی ئیمانەکەیەتی)[١]

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە خەڵک لێک جیاوازن لە لاوازی و بەهێزی ئیمان، لەبەر وتەی: (المؤمن القوي خير وأحب إلى الله من المؤمن الضعيف)[٢].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئیمان زیاد و کەم دەبێت.[٣].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئیماندار ئەگەر چی ئیمانیشی لاواز بێت خێری تێدایە، لەبەر وتەی (وفي كل خير)[٤].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە شەریعەت هاتووە بۆ تەواو کردنی بەرژەوەندییەکان، لەبەر وتەی: (احرص على ما ينفعك)، ئەگەر ئیماندار فەرمانی پێغەمبەری خوا جێ بەجێ بکات ئەوا عیبادەتە بۆی ئەگەر چی سوودێکی دونیاییش بێت[٥].

**٦-** نابێت کەسی عاقڵ توانای خۆی سەرف بکات لە شتێک کە سوودی نەبێت.

---

[١] إعانة المستفيد (٣٢٦/٢).
[٢] القول المفيد (١٦٦/٣-١٧٠).
[٣] القول المفيد (١٦٦/٣-١٧٠).
[٤] القول المفيد (١٦٦/٣-١٧٠).
[٥] القول المفيد (١٦٦/٣-١٧٠).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (نابێت کەسی عاقڵ توانای خۆی سەرف بکات لە شتێک کە سوودی نەبێت، لەبەر وتەی (احرص على ما ينفعك)[1].

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ئارام گرتن، لەبەر وتەی: (ولا تعجزن)[2].

**٨-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە شەیتان کاریگەری لەسەر نەوەی ئادەم هەیە، لەبەر وتەی (فإن لو تفتح عمل الشيطان)، ئەمەیان گومانی تێدا نیە، لەبەرئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (إن الشيطان يجري من ابن آدم مجرى الدم)[3].

**٩-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جوانی فێرکردنی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێک نەهی کرد لە وشەی "ئەگەر" و عیللەتیشی باسکرد، بۆئەوەی حیکمەتی شەریعەت ڕوون بکاتەوە و ئیماندار ئیمانی زیاد بێت و پێداگربێت لەسەر جیبەجێ کردنی فەرموودەکە[4].

**١٠-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئەگەر شتێک لە توانای مرۆڤدا نەبێت دروستە قەدەر

بکاتە بەڵگە، لەبەر وتەی: (ولكن قل: "قدر الله وماشاء فعل)، سەبارەت بەوەش کە لەتواناتدا بێت، بۆت نیە قەدەر بکەیتە بەڵگە.

سەبارەت بە ئادەم و موسا (عليهما السلام)، موسا بە ئادەمی گوت: (لماذا أخرجتنا ونفسك من الجنة؟ فقال: أتلموني على شيء قد كتبه الله علي)، ئەمەیان قەدەری کردە بەڵگە، قەدەرییەکان ئەم فەرموودەیە بەدرۆ دەخەنەوە، چونکە عادەتی ئەهلی بیدەع وایە هەر شتێک پێچەوانەی بیدعەکەیان بێت ئەگەر کرا بەدرۆی دەخەنەوە ئەگەر نا ماناکەی

---

[1] القول المفيد (١٦٦/٣-١٧٠).

[2] القول المفيد (١٦٦/٣-١٧٠).

[3] القول المفيد (١٦٦/٣-١٧٠).

[4] القول المفيد (١٦٦/٣-١٧٠).

دەگۆڕن، بەڵام ئەم فەرموودەیە بە صحیحی جێگیربووە لە بوخاري و موسلیم و ئەوانی تر.

ابن تیمیە دەفەرموویێت: ئەمەیان لە بابی قەدەرکردنە بەڵگەیە لەسەر موسیبەتەکان نەک عەیبەکان، موسا ڕەخنەی لە ئادەم نەگرت لەسەر تاوان کە هۆکاری دەرکردنەکەی بوو، بەڵکو ڕەخنەی لێگرت لەبەر دەرچوونی نەفسی.

ماناکەی: کردەوەی تۆ هۆکار بوو بۆ دەرچوونی ئێمە، ئەگەر نا موسا علیه الصلاة والسلام دوورە لەوەی لەومەی باوکی خۆی بکات لەسەر تاوانێک کە تەوبەی لێکردووە و خوای گەورە هەڵیبژارد و هیدایەتی دا، ئەمە دەگونجێت لەسەر فەرموودەکە.

ابن القیم بۆ مانایەکی تر چووە: ئادەم قەدەری کردە بەڵگە دوای ئەوەی کات بەسەریدا تێپەڕی و تەوبەی کرد، وەک حاڵی ئەوانە نیە کە قەدەر دەکەنە بەڵگە و لەسەر تاوان دەمێننەوە، هەروەها بەردەوامیش دەبن، موشریکەکان گوتیان: ﴿لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلا آبَاؤُنَا﴾ {الأنعام:١٤٨}، خوای گەورە ئەوانی بەدرۆ خستەوە، چونکە ئەوان نەیان دەکردە بەڵگە لەسەر شتێکی ڕۆیشتو و بڵێن: تەوبەمان کرد بۆ لای خوا، بەڵکو دەیانکردە بەڵگە لەسەر مانەوە لەسەر شیرک)[1].

**١١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە ئیمانت بە قەزا و قەدەر هەبێت، ڕوکنی شەشەمە لە ڕوکنەکانی ئیمان و لە نیشانەکانی تەوحیدە، هەروەها ئیمان نەبوون بە قەزا و قەدەر نەفی تەوحید دەکات و لە نیشانەکانی نیفاقە[2].

---

[1] القول المفيد (١٦٦/٣-١٧٠).

[2] إعانة المستفيد (٣٢٩/٢).

**١٢-** ئەم فەرموودەیەی بەڵگەیە واجبە وشەی (ئەگەر) تەرک بکەیت لە کاتی دابەزینی موسیبەت و ناخۆشی، نابێت بڵێیت ئەگەر ئاوا و ئاوام بکردبا ئەم موسیبەتەم تووش نەدەبوو، بەڵکو دەڵێیت: ئەم موسیبەتە مقدرە لە خواوە و ڕازیم بە قەزا و قەدەری خوای گەورە[١].

صالح آل الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (سەبارەت بە بەکارهێنانی (لو) واتە: ئەگەر، بۆ داهاتوو بێت ئەگەر بۆ خێر بێت و ئومێدی پاداشتی هەبێت لای خوا بەوەی یارمەتی بدات لەسەر هۆکاری خێر ئەمەیان دروستە، بەڵام ئەگەر وەک ناچارکردن و خۆ بەگەورە دانان ئەمە بڵێت ئەمەیان دروست نیە، چونکە جۆرێکە لە تحکم کردن بەسەر قەدەردا)[٢].

**١٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دەبێت موسڵمان هۆکار بگرێتەبەر، لەبەر وتەی (احرص على ما ينفعك)[٣].

**١٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نەهی کراوە لە پشت بەستن بە هۆکارەکان و واجبە داوای یارمەتی لەخوا بکەیت، لەبەر وتەی: (واستعن بالله)[٤].

**١٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نەهی کراوە لە ئیهمالی و تەمبەڵی و هۆکار پشت گوێ خستن[٥].

---

[١] إعانة المستفيد (٣٢٩/٢).
[٢] التمهيد لاپەڕە (٥٠٥).
[٣] إعانة المستفيد (٣٣٠/٢).
[٤] إعانة المستفيد (٣٣٠/٢).
[٥] إعانة المستفيد (٣٣٠/٢).

## باب النهي عن سب الريح

**عن أبي بن كعب رضي الله عنه أن رسول الله (ﷺ) قال: (لا تسبوا الريح، فإذا رأيتم ما تكرهون فقولوا: اللهم إنا نسألك من خير هذه الريح، وخير ما فيها، وخير ما أمرت به، ونعوذ بك من شر هذه الريح، وشر ما فيها، وشر ما أمرت به) صححه الترمذي[1].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** النهي عن سب الريح.

**الثانية:** الإرشاد إلى الكلام النافع إذا رأى الإنسان ما يكره.

**الثالثة:** الإرشاد إلى أنها مأمورة.

**الرابعة:** أنها قد تؤمر بخير وقد تؤمر بشر.

---

[1] أخرجه الترمذي (٢٢٥٢) وقال: "حديث حسن صحيح".

# باب النهي عن سب الريح

## قەدەغەکردنی جنێودان بە با

صالح آل الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (با دروستکراوێکە لە دروستکراوەکانی خوای گەورە و ژێر بارکراوە، تاکەکەی (رياح)ە، خوای گەورە دەیهێنێت و دەیبات بە ئارەزووی خۆی چۆنی بوێت، وەک زەمانە وایە و هیچی بە دەست نیە و هیچ شتێک بەڕێوە نابات، جنێودان بە با وەک جنێودانە بە زەمانە لە ڕاستیدا بۆ ئازاردنی خوای گەورە دەگەڕێتەوە، چونکە خوای گەورەیە دەیبات و دەیسوڕێنێت چۆن بییەوێت، جار وایە با دێت بۆ شتێکی ناخۆش بۆ ئەوەی تەوبە و گەڕانەوە بەبیر بەندە بهێنێتەوە و توانای خوای گەورە بە بەندەکان پیشان بدات، وە بۆ ئەوەی پیشانی بەندەکان بدات ئەوان دەوڵەمەند نین لەخوا بە ئەندازەی چاو تروکانێک، جار وایە با دێت بۆ مەسڵەحەتی بەندە.

دانەری کتاب ئەم بابەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە حەڕامە جنێو بە با بدەیت، هەروەک بابی پێشتر باسی کرد حەڕامە جنێو بە زەمانە بدەیت، چونکە ئەزیەت دانی خوای گەورەی تێدایە، ئەم بابە لەو جنسەیە)[1].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (لەبەر ئەوە جنێودان بە با و دروستکراوەکانی تر نەقسە لە ئیمان و قەدحە لە تەوحید، دانەری کتاب ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە بۆ ئەوەی ئیماندار بزانێت تاوانەکانی تر تەوحید و ئیمان کەم دەکەن و لاوازی دەکەن، ئیمان زیاد و کەم دەبێت، هەروەها تەوحیدیش زیاد و کەم دەبێت، جنێودان بە با ئیمان کەم دەکات، چونکە با دروستکراوێکی ژێر بارکراوە و دەنێردرێت بە خێر و

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٥٠٦-٥٠٧).

شەڕ کەوابوو جنێو بە با مەدە، بەڵکو ئیماندار کردەوە بەوە دەکات کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکردووە لە فەرمووده)[1].

[1] التعليق المفيد لاپەڕە (٢٥٣).

**عن أبي بن كعب رضي الله عنه أن رسول الله (ﷺ) قال: (لا تسبوا الريح، فإذا رأيتم ما تكرهون فقولوا: اللهم إنا نسألك من خير هذه الريح، وخير ما فيها، وخير ما أمرت به، ونعوذ بك من شر هذه الريح، وشر ما فيها، وشر ما أمرت به) صححه الترمذي.**

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعب دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (جنێو بە با مەدەن ئەگەر شتێکتان لێ بینی کە پێتان ناخۆش بوو بەڵکو بڵێن: خوایە داوای چاکەی ئەو بایەت لێ دەکەین و هەر چاکەیەکیش کە تیایدا هەیە، هەروەها هەر چاکەیەکیش کە ئەو بایە فەرمانی پێکراوە بیکات، وە پەنات پێدەگرین لە خراپە و بەدی ئەم بایە، وە لە خراپەی هەرچیەکی کە تیایدایە و هەڵی گرتوە، وە لە خراپەی هەرچییەک کە فەرمانی پێدراوە بیکات).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(لا تسبوا الريح):** واتە: جنێو بە با مەدەن، (سب): جنێو و نەفرەت و عەیبدار کردن و هەموو ئەمانە دەگرێتەوە.

**(من خير هذه الريح):** واتە: خوایە داوای چاکەی ئەو بایەت لێ دەکەین، وەک هەوای خۆش و فێنک.

**(وخير ما أمرت به):** واتە: هەرچاکەیەکیش کە تیایدا هەیە، وەک تەڵقیحی بەروبووم.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە حەڕامە جنێو بە با بدەیت.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نەهی كراوە لە جنێودان بە با، چونكە ئەمە زیان بە تەوحید دەگەیەنێت لەو ڕووەوە كە شتەكان دەدرێنە پاڵ بێجگە لەخوا.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم بابە لە جنسی بابەكانی پێشووترە كە نەهی كراوە لە جنێودان بە زەمانە و نەهی كراوە لە وتەی: "لو"، وە نەهی كراوە لە تنجیم و شتی تر، هەموو شت دانە پاڵ بێجگە لەخوا نەهی لێكراوە، چونكە شتەكان هەموویان بە دەست خوای گەورەن، ئەو خۆی دروستكاریانە و بەڕێوەیان دەبات، نابێت ئەم شتانە بدرێنە پاڵ هۆكارەكان، چونكە بەكەم دانان و شت دانە پاڵ بێجگە لەخوای تێدایە.

هەروەک پێشتر باسمان كرد ئەگەر باوەڕی وابێت ئەم شتانە خۆیان بكەرن و شت دروست دەكەن و ڕووداوەكان دێنە دی ئەوە شیركی گەورەیە، چونكە كردوویەتی بە شەریک لەگەڵ خوای گەورە لە پەروەردگارییەتی دا.

ئەگەر ئەم بیروباوەڕەی نەبێت، بەڵكو باوەڕی وایە خوای گەورە خالق و بەڕێوەبەرە، بەڵكو ئەم شتانەی داوەتە پاڵ دروستكراوەكان تەنها وەک هۆكار ئەمەیان حەڕامە و لە شیركی بچووكە، هەتا ابن عباس كە پێشتر باسمان كرد وتەی: (كانت الريح طيبة، وكان الملاح حاذقا)، ئەمەی بە هاوتا دانان بۆ خوای گەورەی داناوە، وتەی خوای گەورە: (فلا تجعلوا لله أندادا وأنتم تعلمون)، تەفسیری كردووە بەوەی ئەگەر سواری كەشتی ببن هیچ ناخۆشی یەک نەیێتە پێشیان ئەوا ئەو نیعمەتە دەیدەنە پاڵ زیرەكی كەشتیوانەكە یان دەیدەنە پاڵ هەوای باش و خۆش كە ڕووی كەشتی یەكەیانی بەو ئاراستەیەدا بردوە، ئەمەیان شەریک دانانە بۆ خوای گەورە، چونكە واجبە سوپاسی خوای گەورە بكات چونكە ئەوەی بای بۆ ئێوە ژێربار كردووە هەر ئەویش كەشتیوان و زانستەكەشی بۆ ئێوە ژێربار كردووە، شتەكان دەدرێنە پاڵ چاوگەكەی، ئەمە تەوحیدە.

سەبارەت بەوەی شت دانە پاڵ بێجگە لەخوا ئەمەیان یان شیرکی گەورەیە یان شیرکی بچووکە...

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نەهی کراوە لە جنێودان بە با، چونکە ئەمە زیان بە تەوحید دەگەیەنێت لەو ڕووەوە شتەکان دەدرێنە پاڵ بێجگە لەخوا)[1].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە جنێودان بە با حەرامە، زانایان دەڵێن جنێودان بە با ئەم سێ حاڵەتانەن:

یەکەم: ئەگەر جنێو بە با بدات و مەبەستی خوای گەورە بێت ئەمەیان کوفری گەورەیە.

دووەم: ئەگەر جنێو بە با بدات باوەڕی وابێت با خۆی بکەرە و خۆی شتەکان دەکات بێ ویست و فەرمانی خوای گەورە ئەمە کوفری گەورەیە جا جنێو بدات یان نەیدات.

سێیەم: جنێو بە با دەدات و باوەڕی وایە با ژێر بارکراوە و هیچی بە دەست نییە بەڵکو بە دەست خوای گەورە، ئەمەیان حەرامە.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە با ژێر بارکراوە، هەندێک جار بەخێر دێت و هەندێک جار بە شەڕ دێت بە فەرمانی خوای گەورە، مادام وایە نابێت زەم و مەدح ئاراستەی با بکەیت، بەڵکو دەبێت ڕوو لەخوا بکەیت و بگەڕێیتەوە بۆ لای خوای گەورە بە دوعا کردن لە کاتی تەنگانە، وە سوپاسی خوای گەورە بکەیت لە کاتی خۆشی)[2].

---

[1] إعانة المستفيد (٢/٣٣١-٣٣٢).

[2] إعانة المستفيد (٢/٣٣٥).

قەرعاوی دەفەرموویێت: (فەرموودەکە بەڵگەیە حەڕامە جنێو بە با بدەیت)[١].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە موسڵمان لە کاتی تەنگانە ڕووو لەخوا دەکەن بە دوعا و پاڕانەوە و تەوحید، ڕوو لە بێجگە لەخوا ناکەن، وەک حاڵی موشریکەکانی ئەم زەمانە لە کاتی تەنگانەدا داوا لە بێجگە لەخوا دەکەن، داوا لەو کەسانە دەکات کە ڕزگاریان دەکەن لە مردوو و وەلی یەکان و پیاوچاکان[٢].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەزڵ و خێری با کە چەندین سوود و خێری تێدایە و بەندە لێی بێ ئاگایە، موتەڕیف ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەگەر با (هەوا) مەنع بکرێت لە خەڵک، ئەوا نێوان ئاسمان و زەوی بۆگەن دەبێت).

---

[١] الجديد لاپەڕە (٤٢٧).

[٢] إعانة المستفيد (٣٣٥/٢).

## باب قول الله تعالى:

﴿يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ ظَنَّ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ مِن شَيۡءٖۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡأَمۡرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِۗ﴾ [آل عمران: ١٥٤]

وقوله: ﴿وَالْمُشْرِكَاتِ الظَّانِّينَ بِاللَّهِ ظَنَّ السَّوْءِ عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ﴾ {الفتح:٦}.

قال ابن القيم في الآية الأولى: (فسر هذا الظن بأنه سبحانه لا ينصر رسوله، وأن أمره سيضمحل، وفسر بظنهم أن ما أصابهم لم يكن بقدر الله وحكمته، ففسر بإنكار الحكمة، وإنكار القدر، وإنكار أن يتم أمر رسوله، وأن يظهره الله على الدين كله. وهذا هو الظن السوء الذي ظنه المنافقون والمشركون في سورة الفتح، وإنما كان هذا ظن السوء؛ لأنه ظن غير ما يليق به سبحانه، وما يليق بحكمته وحمده ووعده الصادق، فمن ظن أنه يديل الباطل على الحق إدالة مستقرة يضمحل معها الحق، أو أنكر أن يكون ما جرى بقضائه وقدره أو أنكر أن يكون قدره بحكمة بالغة يستحق عليها الحمد، بل زعم أن ذلك لمشيئة مجردة، فذلك ظن الذين كفروا فويل للذين كفروا من النار.

وأكثر الناس يظنون بالله ظن السوء فيما يختص بهم وفيما يفعله بغيرهم، ولا يسلم من ذلك إلا من عرف الله وأسماءه وصفاته وموجب حكمته وحمده.

فليعتن اللبيب الناصح لنفسه بهذا، وليتب إلى الله ويستغفره من ظنه بربه ظن السوء، ولو فتشت من فتشت لرأيت عنده تعنتا على القدر وملامة له، وأنه كان ينبغي أن يكون كذا وكذا، فمستقل ومستكثر، وفتش نفسك: هل أنت سالم؟

فإن تنج منها تنج من ذي عظيمة    وإلا فإني لا إخالك ناجيا[1].

فيه مسائل:

---

[1] زاد المعاد (٣/٢٣٤-٢٣٥).

**الأولى:** تفسير آية آل عمران.

**الثانية:** تفسير آية الفتح.

**الثالثة:** الإخبار بأن ذلك أنواع لا تحصر.

**الرابعة:** أنه لا يسلم من ذلك إلا من عرف الأسماء والصفات وعرف نفسه.

## باب قول الله تعالى:

﴿يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ ظَنَّ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ مِن شَيۡءٍۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡأَمۡرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِۗ﴾ [آل عمران: ١٥٤]

واتە: خوای گەورە دەفەرموویت: (پاشان، دوای ئەو غەم و پەژارایە ئارامی و هێمنی بەسەردا دابەزاندن کە وەنەوزێک بوو دەستەیەکتانی داگرتبوو، دەستەیەکی تریش بەڕاستی خەمی خۆیان بوو،گومانی ناڕەوایان دەبرد بەخوای گەورە بە گومانی نەفامانە و دەیانوت ئایا ئێمە لەم کارەدا

(لە بەدەستهێنانی سەرکەوتن) هیچ شتێکمان هەیە؟! (ئەوپشتیوانییەی کەخوا بەڵێنی پێدابووین بۆ نەهات؟!) ئەی محمد (ﷺ) پێیان بڵێ: بێگومان هەموو شتێک بەدەست خوایە، ئەوانە هەندێک شت دەشارنەوە لە دەروونی خۆیاندا و بۆ تۆی دەرناخەن، هەروەها دەڵێن ئەگەر (بەڵێنی سەرکەوتن ڕاست بوایە) ئێمە شتێکمان بەدەست بوایە ئالێرەدا نەدەکوژراین! پێیان بڵێ: ئەگەر لەماڵی خۆشتاندا بوونایە، ئەوانەی کە بڕیارە بکوژرانایە دەبوا هەروایان بەسەر بهاتایەو لە شوێنی کوژرانیاندا ڕاکشانایە بێگومان خوا ئەم شتانەتان بەسەر دەهێنێت تا ئەوەی لە دەروونتاندا هەیە تاقی بکاتەوە بەوەی هەرچیەک لەدڵەکانتاندا هەیە خاوێنی بکاتەوە و حەقیقەتەکە بەدەربخات، ئەو خوایەش زانایە بەوەی کە لە ناخی سینەکاندا حەشار دراوە.)

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (مناسبەی ئەم بابە لە کتابی تەوحید ئەوەیە: گومانی باش بردن لە واجبی تەوحیدە، گومانی خراپ بردن نەفی تەوحید دەکات ئەمە ڕووی باسکردنی ئەم بابەیە لە کتابی تەوحید)[1].

---

[1] إعانة المستفيد (٣٣٧/٢).

صالح آل الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (مناسبەی باسکردنی ئەم بابە لە کتابی تەوحید ئەوەیە: خوای گەورە وەسف کراوە بە سیفەتی تەواو و کردەوەکانی پڕن لە حیکمەت و دادپەروەری و ڕەحمەت و چاکە، خوای گەورە کاملە لە ناوەکانیدا، کاملە لە سیفەتەکانیدا، کاملە لە پەروەردگارییەتیدا، لە کەمالی پەروەردگاریەتی و ناو و سیفەتەکانیدا ئەوەیە هیچ شتێک ناکات مەگەر پڕ بێت لە حیکمەت، حیکمەتیش ئەوەیە خوا ی گەورە هەر شتێک بکات لە جێگای خۆیەتی، شتێکی باش و سوپاسکراوە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر کەمالی خوا و، وەسف و سیفەتەکانی هەمووی کەمال و جوانن، لەبەرئەوە لەبەر کەمالی خوای گەورە دەبێت گومانی باش و حەق بە خوای گەورە ببەیت، وە نابێت گومانی خراپی پێ ببەیت و دەبێت باوەڕت وا بێت خوای گەورە کامله لە حیکمەت و دادپەروەری و ڕەحم و ناو و سیفەت دا، ئەوەی وا گومان ببات کە خوای گەورە لە هەندێک شت کە دەیکات بێ حیکمەتە ئەوە گومانی نەقسی بە خوای گەورە بردووە و ئەمە گومانی خراپ بردنە بەخوای گەورە بە گومانی جاهلی، گومانی ناحەق بردن بە خوای گەورە نەفی تەوحید دەکات و دەکرێت نەفی تەواوی تەوحید بکات، هەندێکیان خاوەنەکەی دەرکردووە لە ئیسلام، وەک گومانی خراپ بردن لە هەندێک بابەتی قەدەر، وە هەیە نەفی تەواوی تەوحید دەکات وەک باوەڕ نەبوون بە حیکمەت)[1].

### ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿يَظُنُّونَ بِاللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ ظَنَّ الْجَاهِلِيَّةِ﴾: واتە: گومانی ناڕەوایان دەبرد بەخوای گەورە بە گومانی نەفامانە، ابن الجوزی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (چوار وتە هەیە سەبارەت بەم ئایەتە:

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٥١٠).

١- گومانیان وابوو خوای گەورە (محمد) و هاوەڵانی سەرناخات، کە ئەبو صالح لە ابن عباس نەقلی کردووە.

٢- گومانیان وابوو (محمد) کوژرا، کە ئەمە وتەی مقاتلە.

٣- قەدەریان بەدرۆ خستەوە، کە ضحاك لە ابن عباس نەقلی کردووە.

٤- گومانیان وابوو کارەکەی (محمد) تەواو بەرەو تیاچوونە)[1].

﴿يَقُولُونَ﴾: واتە: لەوانەیە مەبەست پێی گوتن بێت بە قسە یان دڵ، لەوانەشە گوتن بێت لە نەفس، ئەوەی دیار بێت گوتنە بە زمان، چونکە ئەسڵ وایە وتە ئەگەر بە ڕەهایی باسکرا مەبەست پێی قسەیە بە زمان.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

قەرعاوی دەفەرموویێت: (ئایەتەکە بەڵگەیە حەرامە گومانی خراپ ببەیت بە خوای گەورە، هەروەها ئایەتەکە بەڵگەیە واجبە گومانی باش ببەیت بە خوای گەورە، چونکە ئەمە لە واجباتی تەوحیدە)[2].

### سوودەکانی ئایەتەکە:

١- گومان بردنی ئەمانە بەخوای گەورە ناحەق بووە، لەبەر وتەی: ﴿يَظُنُّونَ بِاللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ ظَنَّ الْجَاهِلِيَّةِ﴾.

(١) زاد المسير(٢٨٦/١).

(٢) الجديد لاپەڕە ٤٢٨.

**٢-** هەر كەسێک گومانی ناحەق بەخوا ببات ئەوە جاهلە، لەبەر وتەی: ﴿يَظُنُّونَ بِاللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ ظَنَّ الْجَاهِلِيَّةِ﴾.

**٣-** واجبی گومان باش بردن بەخوای گەورە لە هەموو حاڵەتەكان، چونكە كەم كەس هەیە سەلامەت بێت لەم گومانە.

**٤-** ڕەخنە گرتنی ئەمانە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ دەرچوون بۆ ئوحد، لەبەر وتەی: ﴿يَقُولُونَ هَلْ لَنَا مِنَ الْأَمْرِ مِنْ شَيْءٍ﴾.

**٥-** هەموو كاروبارەكان و شتەكان بەدەست خوایە، فەرمانی شەرعی و كەونی، لەبەر وتەی: ﴿قُلْ إِنَّ الْأَمْرَ كُلَّهُ لِلَّهِ﴾.

**٦-** واجبی جێ بەجێكردنی فەرمانی شەرعی خوای گەورە و ڕازی بوون و تەسلیم بوون بۆ فەرمانی كەونی.

**٧-** پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەبەر دەرە لەلایەن خوای گەورەوە، لەبەر وتەی: ﴿قُلْ إِنَّ الْأَمْرَ كُلَّهُ لِلَّهِ﴾.

**٨-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە حەڕامە گومانی خراپ بە خوای گەورە ببەیت، چونكە خوای گەورە باسی ئەمانەی كردووە كە هیچ هەممێكیان نییە ئیلا نەفسی خۆیان نەبێت، ئەگەر گومانی خراپ بردن بە خوا زەمكراو بێت ئەواگومانی باش بردن سوپاسكراوە[١].

**٩-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە هەموو شتێک بەدەست خوایە، جا فەرمانی شەرعی بێت یان كەونی، هیچ كەس بەشی نیە لەگەڵ خوای گەورە و هەمووی بەدەست خوایە.

---

[١] تفسير سورة آل عمران (٢/٣٣٧).

**١٠-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە واجبە لەسەر مرۆڤ ئینکاری خراپە بکات بە باسکردنی حەق، چونکە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿قُلْ إِنَّ الْأَمْرَ كُلَّهُ لِلَّهِ﴾، فەرمانی لە وتەی: ﴿قُلْ﴾، کەمترین حاڵی ئەوەیە سوننەتە[1].

---

(1) تفسير سورة آل عمران (٣٣٧/٢).

**وقوله:** ﴿الظَّانِّينَ بِاللَّهِ ظَنَّ السَّوْءِ عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ﴾ {الفتح:٦}.

واتە: خوای گەورە دەفەرموویێت: (لەو لاشەوە ئازار و ئەشكەنجەی دووڕو و موشریكەكان، چ پیاوانیان چ ئافرەتانیان بدات، ئەوانەی كەتێكڕا گومانی خراپیان دەربارەی خوا هەیە، ئەو گومانە خراپەیان هەربۆ خۆیان دەگەڕێتەوە، ئەوانە خوا نەفرەتی لێكردوون و دۆزەخی بۆ ئامادەكردوون، ئای كە چ سەرەنجامێكی یەكجار سەخت و سامناكە!)

## ڕاڤەی وشەكانی ئایەتەكە:

ابن الجوزی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (وتەی خوای گەورە: ﴿الظَّانِّينَ بِاللَّهِ ظَنَّ السَّوْءِ عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ﴾، پێنج وتە هەیە سەبارەت بەم ئایەتە:

- گومانیان وابوو خوای گەورە شەریكی هەیە.

- گومانیان وابوو خوای گەورە محمد (ﷺ) و هاوەڵانی سەرناخات.

- گومانیان وابوو كاتێک دەرچوون بۆ حودەیبییە دەكوژرێت یان دەشكێت و ناگەڕێتەوە.

- گومانیان وابوو ئەوان و پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەک پلەیان هەیە لای خوای گەورە.

- گومانیان وابوو خوای گەورە مردوو زیندوو ناكاتەوە)[1].

---

(١) زاد المسير (٢٠٣/٧).

قرطبی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (گومانیان وابوو پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی ناگەڕێنەوە بۆ مەدینە کاتێک دەرچوون بۆ حودەیبییە، هەروەک دەفەرموویێت: ﴿بَلْ ظَنَنْتُمْ أَنْ لَنْ يَنْقَلِبَ الرَّسُولُ وَالْمُؤْمِنُونَ إِلَى أَهْلِيهِمْ أَبَدًا﴾ [الفتح: ١٢])[١].

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

قەرعاوی دەفەرموویێت: (ئایەتەکە بەڵگەیە حەرامە گومانی خراپ بە خوای گەورە ببەیت)[٢].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** وتەی: ﴿وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَاتِ الظَّانِّينَ بِاللَّهِ ظَنَّ السَّوْءِ عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا﴾، هیچ هەڕەشە و سزایەک بۆ کەس کۆ نەبۆتەوە ئەوەی بۆ ئەهلی شیرک هاتووە، ئەوان گومانی خراپیان بە خوای گەورە برد هەتا تووشی شیرک بوون، ئەگەر گومانی باشیان بەخوا بردبا، ئەوە بە تەنیایان دادەنا و تووشی شیرک نەدەبوون و حەقی تەوحیدیان دەدا[٣].

**٢-** دووڕوو کوفری توندترە و گەورەترە لە موشریک بۆیە پێش خراوە.

**٣-** هۆشداری دان لە نیفاق و شیرک و گومانی خراپ بردن بە خوای گەورە، چونکە ئەمانە هۆکارن بۆ سزای خوای گەورە، هەروەها گومانی خراپ بردن لە نیفاقی گەورەیە.

---

(١) تفسیر قرطبی.
(٢) الجدید لاپەڕە (٤٣١٠).
(٣) (إغاثة اللهفان) لابن القیم (٦١/١).

**٤-** حوكمی خوای گەورە و قەزای خوا بەسەریان و سزا بۆیان، لەبەر وتەی: ﴿عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ﴾.

**٥-** غەزەبی خوای گەورە بەسەریان و دوورخستنەوەیان لە ڕەحمەتی خۆی و بەهەشتی، دۆزەخ دوا شوێنیان دەبێت، لەبەر وتەی: ﴿وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا﴾.

**٦-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ترسناکی دووڕووان بۆ ئیمانداران، چونکە یەکەم جار باسی دووڕووی کردووە، پاشان باسی موشریکی کرد، زانایان دەڵێن لەبەر ئەوە یەکەم جار باسی دووڕووی کردووە لەبەر ترسناکی دووڕوو بۆ ئیمانداران بەوەی کە لە موشریکان ترسناکترن.

**٧-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە گومانی خراپ بردن بەرامبەر خوا لە نیفاقی بیروباوەڕە.

**٨-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی سیفەتی غەزەب بۆ خوای گەورە.

**٩-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە دروستە نەفرەت لە کافر بکەیت بە شێوەیەکی گشتی.

**قال ابن القيم في الآية الأولى: فسر هذا الظن بأنه سبحانه لا ينصر رسوله، وأن أمره سيضمحل، وفسر بظنهم أن ما أصابهم لم يكن بقدر الله وحكمته، ففسر بإنكار الحكمة، وإنكار القدر، وإنكار أن يتم أمر رسوله، وأن يظهره الله على الدين كله. وهذا هو الظن السوء الذي ظنه المنافقون والمشركون في سورة الفتح، وإنما كان هذا ظن السوء؛ لأنه ظن غير ما يليق به سبحانه، وما يليق بحكمته وحمده ووعده الصادق، فمن ظن أنه يديل الباطل على الحق إدالة مستقرة يضمحل معها الحق، أو أنكر أن يكون ما جرى بقضائه وقدره أو أنكر أن يكون قدره بحكمة بالغة يستحق عليها الحمد، بل زعم أن ذلك لمشيئة مجردة، فذلك ظن الذين كفروا فويل للذين كفروا من النار.**

**وأكثر الناس يظنون بالله ظن السوء فيما يختص بهم وفيما يفعله بغيرهم، ولا يسلم من ذلك إلا من عرف الله وأسماءه وصفاته وموجب حكمته وحمده.**

**فليعتن اللبيب الناصح لنفسه بهذا، وليتب إلى الله ويستغفره من ظنه بربه ظن السوء، ولو فتشت من فتشت لرأيت عنده تعنتا على القدر وملامة له، وأنه كان ينبغي أن يكون كذا وكذا، فمستقل ومستكثر، وفتش نفسك: هل أنت سالم؟ فإن تنج منها تنج من ذي عظيمة وإلا فإني لا إخالك ناجيا**

ابن القيم ڕەحـمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەم گومانە بەوە تەفسیر کراوە کە:

- خوا پێغەمبەرەکەی سەر ناخات و کاری کۆتایی ئەم پێغەمبەرەش (ﷺ) لە تەواو بووندایە.

- بەوەش تەفسیر کراوە کە وتیان ئەو شکستەی بەسەر پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵەکانیدا هات لە جەنگی ئوحود، بە قەدەر و حیکمەتی خوا نەبووە.

- بەوەش تەفسیر کراوە کە ئینکاری حیکمەت و ئینکاری قەدەریان کردوە.

ئینکاری ئەوەشیان کردووە کە خوای گەورە کاری پێغەمبەرەکەی (ﷺ) تەواو بکات و زاڵی بکات بەسەر هەموو دینەکانی دیکەدا.

ئەمەش ئەو گومانە خراپەیە کە دووڕووەکان و موشریکەکان "بەرامبەر خوا بوویان" و لە سورەتی فەتح دا باسکراوە، بۆیە ئەوەش ناو براوە بە گومانی خراپ، چونکە ئەم گومانە شایستەی ئەو خوایە نییە کە پاک و بێگەردە.

جا هەرکەسێک گومانی وابێت کە خوا ناحەق زاڵ دەکات بەسەر حەقدا، زاڵبوونێکی بەردەوام و جێگیر و لەگەڵ ئەوەش حەق تیا دەچێت" کە ئەمە گومانی دووڕووەکان و موشریکەکانە"، یان ئینکاری لەوە بکات کە هەرچی ڕوووداوە بە قەزا و قەدەری خوا بووبێت "کە ئەمە گومانی موعتەزیلەکانە"، یان ئینکاری ئەوە بکات کە "قەدەری خوا" وەک ئەوەی کە لە جەنگی ئوحودا ڕوویدا، بە پێی حیکمەتی تەواوی خۆی بووبێت، "ئینکاری بکات کە خوا" شایستەی ئەوە بێت کە لە قەدەرەکانیدا ستایش بکرێت.

بەڵکو بانگەشەی ئەوەش بکات کە هەرچی ڕووی دابێت تەنها بە پێی ئیرادەیەکی ڕووت بووبێت "واتە: بێ حیکمەت بووبێت، کە ئەمە گومانی ئەشعەری یەکانە"، ئا ئەمە گومانی ئەوانەن کە کافر بوون، ئەی هاوار بە حاڵی ئەوانەی کە کافر بوون، لە ئاگری دۆزەخدا.

زۆرینەی خەڵکیش گومانی بەد دەبەن بەرامبەر خوای گەورە لەو شتانەدا کە تایبەتە بە خۆیان، لەوەشدا کە خوا چ کارێ بە خەڵکی دیکە دەکات، هیچ کەسێک لەم بەد گومانیە سەلامەت نابێت، مەگەر ئەوانەی کە ناو سیفەتەکانی خوا دەناسن، دەشزانن کە خوا هەر خۆی حەکیمە و هەر خۆی شایستەی حەمد و ستایشە، جا با مرۆڤی ئاقل و دڵسۆز خۆی گرینگی بدات بەم بابەتە و تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای خوا و داوای لێ خۆش بوونی لێ بکات، لەوەدا بەد گومانی کردووە بە پەروەردگاری.

جا ئەگەر لە هەر کەسێک وردبییتەوە و پشکنینی بۆ بکەیت، دەبینی لە قەدەر ناڕازیە و لۆمەی دەکات و دەڵێت: دەبوایا ئاوا بوایە و ئاوا بوایە، هەیە ئەم سیفەتەی بەکەمی تێدایە و هەشە زۆری تێدا هەیە، تۆش تەفتیشی نەفسی خۆت بکە و بزانە لەو بەڵایە سەلامەتی یان نا؟ جا ئەگەر لەم فیتنەیە ڕزگار بوویت، ئەوا لە بەڵایەکی گەورە دەرباز بوویت، ئەگەر واش نەبوو وا نازانم ڕزگارت بوویت).

## باب ما جاء في منكري القدر

وقال ابن عمر: والذي نفس ابن عمر بيده، لو كان لأحدهم مثل أحد ذهبا، ثم أنفقه في سبيل الله ما قبله الله منه حتى يؤمن بالقدر. ثم استدل بقول النبي (ﷺ): (الإيمان: أن تؤمن بالله، وملائكته، وكتبه، ورسله، واليوم الآخر، وتؤمن بالقدر خيره وشره). رواه مسلم[١].

وعن عبادة بن الصامت أنه قال لابنه: (يا بني إنك لن تجد طعم الإيمان حتى تعلم أن ما أصابك لم يكن ليخطئك، وما أخطأك لم يكن ليصيبك، سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (إن أول ما خلق الله القلم، فقال له: اكتب، فقال: رب، وماذا أكتب؟ قال: أكتب مقادير كل شيء حتى تقوم الساعة) يا بني سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (من مات على غير هذا فليس مني)[٢].

وفي رواية لأحمد: (إن أول ما خلق الله تعالى القلم، فقال له: اكتب، فجرى في تلك الساعة بما هو كائن إلى يوم القيامة)[٣].

وفي رواية لابن وهب: قال رسول الله (ﷺ): (فمن لم يؤمن بالقدر خيره وشره أحرقه الله بالنار)[٤].

---

[١] أخرجه مسلم (٨).

[٢] أخرجه أبو داود (٤٧٠٠)، وابن أبي العاص في (السنة) (٥١/١ رقم ١١١)، والطبراني في (الأوسط) (٢٤٩/٦ رقم ٤٢٦).

[٣] أخرجه أحمد (٣١٧/٥ رقم ٢٢٧٠٥)، والترمذي (٢١٥٥،٣٣١٩)، والضياء في "المختارة (٣٥٠/٨ رقم ٤٢٦).

[٤] أخرجه ابن وهب في "القدر" (١٢١/١ رقم ٢٦).

**وفي المسند والسنن عن ابن الديلمي قال: أتيت أبي بن كعب، فقلت: في نفسي شيء من القدر، فحدثني بشيء لعل الله يذهبه من قلبي، فقال: (لو أنفقت مثل أحد ذهباً ما قبله الله منك حتى تؤمن بالقدر، وتعلم أن ما اصابك لم يكن ليخطئك، وما أخطأك لم يكن ليصيبك، ولو مت على غير هذا لكنت من أهل النار). قال: فأتيت عبد الله بن مسعود، وحذيفة بن اليمان، وزيدبن ثابت، فكلهم حدثني بمثل ذلك عن النبي (ﷺ). حديث صحيح رواه الحاكم في صحيحه[1].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** بيان فرض الإيمان بالقدر.

**الثانية:** بيان كيفية الإيمان به.

**الثالثة:** إحباط عمل من لم يؤمن به.

**الرابعة:** الإخبار بأن أحدا لا يجد طعم الإيمان حتى يؤمن به. الخامسة: ذكر أول ما خلق الله. **السادسة:** أنه جرى بالمقادير في تلك الساعة إلى قيام الساعة.

**السابعة:** براءته (ﷺ) ممن لم يؤمن به.

**الثامنة:** عادة السلف في إزالة الشبهةبسؤال العلماء.

---

[1] مسند أحمد (١٨٢/٥ رقم ٢١٥٨٩)، سنن أبي داود (٤٦٩٩)، سنن ابن ماجه (٧٧)، مستدرك الحاكم (٦٢٤/٣) إلا أنه مغاير له في اللفظ وكذا هو حديث ابن عباس.

**التاسعة:** أن العلماء أجابوه بما يزيل الشبهة، وذلك أنهم نسبوا الكلام إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم فقط.

# باب ما جاء في منكري القدر

## باسی حوکمی هەر کەسێ ئینکاری قەدەری خوای گەورە بکات.

صالح ال الشيخ خوا بيپارێزێت دەفەرموویێت: (مناسبەی ئەم بابە لەگەڵ بابی پێشووتر: ئینکاری کردنی توانای خوای گەورە و گومانی خراپ بردنە بە خوای گەورە، کەواتە لەسەر ئەمە ئەم بابە تەفسیلی بابی پێشووتری لەخۆ گرتووە.

مناسبەی ئەم بابە لە کتابی تەوحید دیارە بەوەی ئیمان هێنان بە قەدەر واجبە، تەوحیدی بەندە تەواو نابێت تاوەکو ئیمان بە قەدەر نەهێنێت، ئینکاری کردنی قەدەر کوفرە بەخوا و نەفی ئەسڵی تەوحید دەکات، هەروەک ابن عباس خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: قەدەر نیزامی تەوحیدە، هەر کەسێک قەدەر بەدرۆبخاتەوە تەوحیدی هەڵوەشاوەتەوە)[1].

صالح الفوزان خوا بيپارێزێت دەفەرموویێت: (دانەری کتاب ئەم بابەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە ئیمان هێنان بە قەدەر لە ئیمان هێنانە بە پەروەردگاریەتی خوای گەورە، هەرکەسێک ئینکاری قەدەر بکات ئەوا شەریکی بۆ خوای گەورە بڕیارداوە لە پەروەردگاریەتی، ئیمان هێنان بە قەدەر لە ئیمان هێنانە بە پەروەردگاریەتی، ئەوەی ئیمان نەیێنێت بە قەدەر ئەوا ئیمانی بە پەروەردگاریەتی خوای گەورە نەهێناوە، چونکە ئینکاری توانای خوای گەورە و زانستی خوای گەورە دەکات لەوەی کە ڕوودەدات بە توانا و ویستی خوا، هەروەها وەسفی خوای گەورە کردووە بە نەزانین و نەتوانین)[2].

بەروبووم و سوودی ئیمان هێنان بە قەدەر بریتییە لە:

---

[1] التمهيد لاپەڕە (٥١٩).

[2] إعانة المستفيد (٣٤٧/٢).

١- ئیمان هێنان بە قەدەر لە تەواوی تەوحیدی پەروەردگاریەتی یە.

٢- پشت بەستن بەخوا بۆ ئیماندار دروست دەکات، چونکە هەموو شتێک لەژێر قەزا و قەدەری خوای گەورە دایە.

٣- خەم و خەفەت ناخوات لەوەی بەسەری هاتووە، چونکە دەزانێت لە خواوەیە و لە ڕەحم و حیکمەتی خوایە.

٤- مرۆڤ هۆکار دەگرێتەبەر، چونکە ئیمانی بە حیکمەتی خوای گەورەیە، دەبێت هۆکار بگرێتەبەر.

٥- ڕێگری لە مرۆڤ دەکات سەرسام بێت بە کردەوەی خۆی، بەڵکو سوپاسی خوای گەورە دەکات، چونکە دەزانێت ئەمە منەتێکە خوای گەورە لەگەڵی کردووە.

٦- دڵت ئارام دەبێت و هەست بە خۆشی دەکەیت، چونکە هەر چیەک توشت بووە و هاتووە

بەسەرتا نەدەبوو توشت نەبێت و نەیەت بەسەرتدا، هەر چیەکیش کە توشت نەبووە و نە هاتووە بە سەرتدا، نەدەبوو توشت نەبێت و نەیەت بە سەرتدا.

٧- وا لە ئیماندار دەکات بەردەوام بێت لەسەر گوێڕایەڵی خوا، چونکە دەزانێت دڵی بەندە لەنێوان دوو پەنجەی خوای گەورە دایە.

**وقال ابن عمر: والذي نفس ابن عمر بيده، لو كان لأحدهم مثل أحد ذهبا، ثم أنفقه في سبيل الله ما قبله الله منه حتى يؤمن بالقدر. ثم استدل بقول النبي (ﷺ): (الإيمان: أن تؤمن بالله، وملائكته، وكتبه، ورسله، واليوم الآخر، وتؤمن بالقدر خيره وشره). رواه مسلم.**

واتە: عبدللەی کوڕی عومەرخوا لێی ڕازی بێت دەڵێت: (سوێند بەو کەسەی کە نەفسی کوڕی عومەری بەدەستە ئەگەر هەر یەکێ لەوان بەقەد کێوی ئوحد زێڕی هەبێت پاشان لە ڕێگای خوادا سەرفی بکات خودا لێیان قبوڵ ناکات، هەتا ئەو کاتەی ئیمان دەهێنن بە قەدەری خودا.)، پاشان ابن عمر ئەو فەرموودەی کردە بەڵگە: (ئیمان ئەوەیە باوەڕت هەبیت بە خودا و فریشتەکان و پێغەمبەران و کتابەکان و ڕۆژی دوایی و بە قەدەر بە خەیرو بە شەڕیەوە).

### ڕاڤەی وشەکانی ئەثەرەکە:

**(والذي نفس ابن عمر بيده):** واتە: سوێند بەو کەسەی کە نەفسی کوڕی عومەری بەدەستە، ابن عمر سویندی خواردووە بۆ تەئکید کردن و گرینگی دان بە شتەکە.

### هۆکاری باسکردنی ئەم ئەثەرە لەم بابە:

قەرعاوی دەفەرموویێت: (ئەثەرەکە بەڵگەیە لەسەر کوفری ئەو کەسەی کە ئینکاری قەدەر دەکات، چونکە ئینکاری کردن شیرکە لەگەڵ خوا لە پەروەردگاریەتی دا)[1].

### سوودەکانی ئەثەرەکە:

**١-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە ئیمان هێنان بە قەدەر واجبە و ئینکاری کردنیشی کوفرە، جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بە قضاء و قدر، سێ وتە هەیە:

---

[1] الجديد لاپەڕە (٤٣٣).

یەکەم: هەندێ زانا بۆ ئەوە چوون قضاء و قدر مرادفی یەکترن و یەک مانایان هەیە.

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (قضاء و قدر هەردووکیان یەک شتن، ئەو شتەی خوای گەورە پێشتر حوکمی لەسەر داوە و دیاری کردووە پێی دەوترێ قضاء هەروەها پێی دەوترێ قدر).

دووەم: هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون "قضاء" جی بەجێ کردنی ئەو شتانەیە کە نوسراوە لە (لوح المحفوظ)، بەڵام قەدەر ئەوەی نوسراوە و دیار کراوە پێی دەڵێن قدر.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمویێت: (جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بە (قضاء) و (قدر)، هەیە لە زانایان دەڵێت: قەدەر تەقدیری خوای گەورەیە لە ئەزەل، قضاء حوکمی خوای گەورەیە بە شتێک کاتی ڕوودانی، ئەگەر خوای گەورە شتێکی دیارکرد لە کاتی خۆی ئەمە قەدەرە، ئەگەر کاتی ئەو شتە هات ئەوە قەزایە، ئەمە زۆرە لە قورئان و سوننەت، نموونە وتەی خوای گەورە: (قضی الأمر)، وە وتەی : (والله یقضی بالحق) وە نموونەی تری هاوشیوەی ئەمانە، هەیە لە زانایان دەڵێت: هەردووکیان بە یەک مانا دێن.

وتەی ڕاست ئەگەر هەردووکیان پێکەوە هاتن ئەوە جیاوازی هەیە لەنێوانیان هەر وەک پێشتر، ئەگەر یەکێکیان بە تەنیا هات ئەوا هەردوو مانا دەدات، والله أعلم)[١].

سێیەم: هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون (قضاء) پێش قەدەر کەوتووە، قەزا زانستی خوای گەورەیە، قەدەر هێنانە دی دروستکراوەکان و جێ بەجێکردنیەتی، ئەم وتەیە پێچەوانەی وتەی دووەمە.

---

[١] مجموع فتاوى ابن العثيمين.(٢٥٧/١)، طبع المكتبة التوفيقية .

عبد الرحمن المحمود دەفەرمووێت: (ئەم جیاوازییە سوودی نییە، چونکە یەک دەنگی هەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر یەکێکیان بە تەنیا هات مانای هەردووکیان دەبەخشێت)[١].

**٢-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە دەبێت موسڵمان ئیمانی بە قەدەر هەبێت، جا چ خێر بێت یان شەڕ، گومانی تێدا نییە شەڕ و خێر هەموویان لە ژێر قەدەری خوای گەورەدان، وەک مەجوسی ناڵێین شەڕ دروستکەرێکی تری هەیە بەڵکو دەڵێین یەک دروستکار هەیە و خێر و شەڕ لە ژیر قەدەری خوای گەورە دایە، بەلاَم وەک ئەدەب جوان نیە شەڕ بدەیتە پاڵ خوای گەورە.

ابن تیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (لە قورئان و سوننەت نەهاتووە شەڕ درابێتە پاڵ خوای گەورە مەگەرلەم سێ حاڵەتانە نەبێت.

یەکەم: خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ﴾ [الزمر: ٦٢]، واتە: خوای گەورە دروستکاری هەموو شتێکە، هەروەها ئەو ناوانەی کە پێکەوەن وەک: (المعطى المانع، والضار النافع، المعز المذل، الخافض الرافع)، ئەم ناوانە ناکرێ یەکێکیان بە تەنها باس بکرێ، هەردووکیان پێکەوە دەلالەت لەسەر عموم دەکەن، هەرشتێک لە بووندابێت ڕەحمەت و سوود بێت ئەوا چاکەی خوای گەورەیە، هەرشتێک بێجگە لە سوود و ڕەحمەت بێت ئەوا لە دادپەروەری خوای گەورەیە، هەموو نیعمەتێکی چاکەیە و هەمووی نەخۆشیەکیشی دادپەروەرییە.

دووەم: بکەر (کارا) دیار ناکەیت، وەک وتەی جن ﴿وَأَنَّا لَا نَدۡرِيٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ أَرَادَ بِهِمۡ رَبُّهُمۡ رَشَدٗا ١٠﴾ [الجن: ١٠]، هەروەها وەک سورەت فاتحە کە

[١] القضاء والقدر في ضوء الكتاب والسنة لاپەڕە (٤٤).

دەفەرموویت: ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ۝٧﴾ [الفاتحة: ٧]، وە هەروەها سورەتی تری وەک ئەمانە.

سێیەم: دەیدەیتە پاڵ سەبەب، وەک وتەی خوای گەورە کە دەفەرموویت: ﴿مِن شَرِّ مَا خَلَقَ۝٢﴾ [الفلق: ٢]، وەک وتەی تری خوای گەورە کە دەفەرموویت: ﴿فَأَرَدتُّ أَنۡ أَعِيبَهَا﴾ [الكهف: ٧٩][1].

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (سەبارەت بە کارەکانی خوای گەورە، خوای گەورە کارەکانی هەمووی خێرن، چونکە موافقی حیکمەتی خوای گەورەیە، لەبەر ئەوە فەرموودە هاتووە پیغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: (والشر ليس إليك)، خوای گەورە کارەکانی شەڕی تێدا نیە، شەڕ بەنسبەت بەندە، ئەگەر بەندە تووشی موسیبەت بوو شەڕە سەبارەت بە بەندە، سەبارەت بە کاری خوای گەورە خێرە، چونکە موافقی حیکمەتی خوای گەورەیە، هەموو کارەکان بە دەست خوای گەورەن)[2].

**٣-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە بۆ ئیمان هێنان بەخوا، ئیمان بەخوا چوار شت لەخۆ دەگرێت:

(١) ئیمان بە بوونی خوا.

(٢) ئیمان بە پەروەردگاریەتی خوای گەورە.

(٣) ئیمان بە بەندایەتی خوای گەورە.

(٤) ئیمان بە ناو و سیفەتی خوای گەورە.

---

[1] مجموعه الفتاوی (٨/٩٤-٩٥).

[2] التمهيد لاپەڕە (٥٢٢).

هەر کەسێک ئینکاری بوونی خوا بکات ئەوا ئیماندارنیە، هەروەها هەرکەسێک دان بنێت بە بوونی خوا بەڵام ئینکاری ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە بکات، ئەوا ئیماندار نیە[1].

**٤-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە بۆ ئیمان هێنان بە فریشتەکان، ئیمان هێنان بە فریشتەکان چوار شت لەخۆ دەگرێت:

(١) ئیمان بە بوونیان.

(٢) ئیمان هێنان بەو ناوانەی کە ئێمە دەیانزانین.

(٣) ئیمان هێنان بە کردەوەیان.

(٤) ئیمان هێنان بە سیفەتیان[2].

**٥-** ئەم ئەثرە بەڵگەیە بۆ ئیمان هێنان بە کتابەکان، ئیمان هێنان بە کتابەکان ئەمانە لەخۆ دەگرێت:

(١) ئیمان هێنان بەوەی کە ئەمە حەقە لە لایەن خواوە.

(٢) بەڕاست دانانی خەبەرەکانی.

(٣) پابەند بوون بە ئەحکامەکانی هەتا نەسخ نەبووبێت، لەسەر ئەمە کەس پابەند ناکەین بەوەی پابەند بن بە کتابەکانی پێشووتر، چونکە هەموویان منسوخن بە قورئان، ئەگەر نا قورئان دانی پێیان دەنا، هەروەها کەس پابەند ناکەین بەوەی پابەند بن بە کردەوە کردن بە شتی منسوخ لە قورئان دا.

---

[1] القول المفيد (٣/٢١٧-٢٢٧).

[2] القول المفيد (٣/٢١٧-٢٢٧).

(٤) ئیمان هێنان بەوانەی دیارکراون، لەوانە: تەورات و ئینجیل و قورئان و زەبور و سوحوفی ئیبراهیم و موسا.

(٥) ئیمان هێنان بەوەی کە هەموو پێغەمبەرێک خوای گەورە کتابی لەگەڵ ناردووە[1].

**٦-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە بۆ ئیمان هێنان بە پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی.

**٧-** ئەم ئەثەرە بەڵگەیە لەسەر فەزڵ و گرینگی ئیمان هێنان بە قەدەر، چونکە ابن عمر دەفەرموویێت: سوێند بەو کەسەی کە نەفسی کوڕی عومەری بەدەستە ئەگەر هەر یەکێ لەوان بەقەد کێوی ئوحد زێڕی هەبێت پاشان لە ڕێگای خوادا سەرفی بکات، خودا لێی قبووڵ ناکات، هەتا ئەو کاتەی ئیمان دەهێنێت بە قەدەری خودا.

[1] القول المفيد (٣/٢١٧-٢٢٧).

**وعن عبادة بن الصامت أنه قال لابنه: (يا بني إنك لن تجد طعم الإيمان حتى تعلم أن ما أصابك لم يكن ليخطئك، وما أخطأك لم يكن ليصيبك، سمعت رسول** الله (ﷺ) **يقول: (إن أول ما خلق الله القلم، فقال له: اكتب، فقال: رب، وماذا أكتب؟ قال: أكتب مقادير كل شيء حتى تقوم الساعة) يا بني سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (من مات على غير هذا فليس مني).**

واته: له عوباده كوڕی صامت دەگێڕنەوە بە کوڕەکەی گوت: کوڕی شیرینم بە تەئکید تامی ئیمان ناچێژیت هەتا نەزانیت کە ئەوەی توشت بووە (جا هەرچیەک بێت) نەدەبوو توشت نەبێت و نەیەت بە سەرتدا، ئەوەشی کە توشت نەبووە و نە هاتووە بەسەرتدا، نەدەبوو توشت ببێت و بەسەرتدا بێت.

من خۆم لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) گوێ بیست بووم دەیفەرموو: (یەکەم شت کە خودا دروستی کرد قەڵەم بوو (دەڵێن: أول بە مانای کات دێت، واتە: کاتێک قەلەمی دروست کرد)، پێی فەرموو: بنوسە، گوتی چی بنوسم؟

خودا فەرمووی: مەقادیر و ڕێژەی هەموو شتێ بنووسە هەتا ئەو کاتەی کە قیامەت بەرپا دەبێت.)

کوڕی شیرینم: خۆم گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو دەیفەرموو: (هەر کەسێ لەسەر غەیری ئەم ئیمانە بمرێت، ئەوا لە من نیە).

**وفي رواية لأحمد: (إن أول ما خلق الله تعالى القلم، فقال له: اكتب، فجرى في تلك الساعة بما هو كائن إلى يوم القيامة).**

واتە: لە ڕیوایەتەکەی ئەحمەدا دەفەرمووێت: (یەکەم شتێ کە خودا دروستی کرد قەڵەم بوو (کاتێک خوا قەلەمی دروست کرد)، خودا پێی فەرموو: بنوسە، هەر لەو کاتەدا قەڵەم

دەستی کرد بە نووسین، هەرچیدەبێت و ڕوودەدات تا ڕۆژی قیامەت هەر هەمووی نووسی).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(أول):** هەندێک دەڵێن بە مانای کاتێک دێت.

**(يا بني):** واتە: ئەی کوڕەکەم.

**(لن تجد طعم الإيمان):** واتە: کوڕی شیرینم بە تەئکید تامی ئیمان ناچێژیت.

**(فقال له: اكتب):** واتە: خوای گەورە پێی فەرموو بنووسە.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە ئیمان نەهێنان بە قەزا و قەدەر کوفرە.

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** دەبێت باوکماڵەوە و منالّی خۆی ئامۆژگاری بکات و وشەی نەرم و جوان بەکاربهێنێت کە دڵ نەرم بکات، بە جۆرێک بڵێت: (يا بني)، ئەم دەربڕینە سۆز و نەرمی تێدایە و دڵ ڕادەکێشێت[1].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە قەڵەم یەکەم دروستکراوە، جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان و سێ وتە هەیە:

---

[1] القول المفيد (٢٢٧/٣).

یەکەم: زۆربەی زانایان بۆ ئەوە چوون عەرش دروستکراوێک بووە پێش قەڵەم، بەڵگە:

١- فەرموودەی عبد الله بن عمر دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (كتب الله مقادير الخلائق قبل أن يخلق السماوات والأرض بخمسين ألف سنة وكان عرشه على الماء).

دووەم: هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون قەڵەم پێش عەرش بووە، بەڵگە:

١- فەرموودەی عبادة بن صامت: (إن أول ما خلق الله القلم، فقال له: اكتب)، ئەمە وتەی ابن جرير الطبری و ابن جەوزی یە.

سێیەم: هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون ئاو پێش عەرش بووە.

وتەی ڕاست وتەی یەکەمە، چونکە:

١- فەرموودەی عبد الله بن عمر ڕوون و ئاشکرایە کە عەرش پێشتر بووە.

٢- فەرموودەی عبادة بن صامت دەکرێت جمع بکرێت لەگەڵ فەرموودەی ابن عمر.

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (وتەی (إن أول ما خلق الله القلم)، ماناکەی لەسەر وتەی ڕاست ئەوەیە: کاتێک قەڵەمی دروستکرد، وشەی "أول" لێرە "ظرف"ە، بەمانای کات دێت، وە (إن) اسمها ضمير الشأن محذوف، إنه أول ما خلق الله القلم، (فقال له: اكتب)، واتە: کاتێک خوای گەورە قەڵەمی دروست کرد پێی گوت: "اكتب"، کەواتە وتەی: اكتب، لەڕووی ظرفەوە بووە، واتە: کاتێک خوای گەورە قەلەمی دروست کرد پێی گوت: بنووسە.

سەبارەت بە یەکەم دروستکراو عەرش بووە پێش قەڵەم، هەروەک پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (قدر الله مقادير الخلق قبل أن يخلق السماوات والأرض بخمسين ألف سنة، وكان عرشه على الماء).

وتەی: (إن أول ما خلق الله القلم، فقال له: اكتب)، بەڵگەیە کاتێک قەڵەمی دروستکرد پێی گوت بنووسە، نووسین دوای ئەو دروستکراوە بووە، فەرموودەی دووەم بەڵگەیە عەرش پێشتر هەبووە، وە هەروەها ئاویش هەبووە پێشتر، لەبەر ئەوە وتەی ڕاست ئەوەیە عەرش دروستکراو بوو پێش قەڵەم، هەروەک ابن القيم لە (نونية)دا دەفەرموێت:

والناس مختلفون في القلم الذي كتب القضاء به من الديان

هل كان قبل العرش أو بعده قولان عند أبي العلا الهمذاني

والحق أن العرش قبل لأنه قبل الكتابة كان ذا أركان)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموێت: (وتەی ڕاست ئەوەیە کە ابن تيميە و ابن القيم و کەسانی تر هەڵیان بژاردووە: عەرش یەکەم دروستکراوە و قەڵەمیش دواتر دروستکراوە)[2].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە خوای گەورە زانستی بە هەموو شتێک هەیە لە هەرچیەک کە هەبووە و هەرچیەک کە دەبێت زانیویەتی و دەیزانێت، خەڵکی سەبارەت بە قەدەر سێ دەستەن:

یەکەم: جەبرییەکان قەدەر بۆ خوای گەورە جێگیر دەکەن بەڵام زیادەڕەوی دەکەن لە جێگیرکرن، دەڵێن: هەموو شتێک بەدەست خوای گەورەیە و بەندە هیچی بەدەست نییە

(١) التمهيد لاپەڕە (٥٢٣-٢٣٤).

(٢) إعانة المستفيد (٣٥٩/٢).

و ناچارە، بەندە نە تواناى هەيە و نە ويستى هەيە، نووستن و هەستان و عيبادەت و تاوان بە ويستى خۆى نيە و هيچ توانايەكى نيە.

دووەم: قەدەرييەكان نەفى قەدەرى خواى گەورە دەكەن و دەڵێن: بەندە ويست و تواناى هەيە و هيچ لە ژێر توانايى خواى گەورەدا نيە، هەروەها خواى گەورە زانستى نيە بەو شتەى بەندە دەيكات، بەڵكو ئەو كاتە دەزانێت كە بەندە كردەوەكە دەكات.

سێيەم: ئەهلى سوننە كۆمەڵێكى مام ناوەندن، ئيمانيان بە قەزا و قەدەر هەيە بەوەى بەندە تواناى هەيە و ويستيشى هەيە، هەر شتێك ڕووبدات بە ويستى خواى گەورەيە و خواى گەورە زانستى پێ هەيە و هيچ شتێك لەژێر قەدەرى خوا دەرناچێت.

محمد عبدالرحمن الخميس خوا بيپارێزێت دەفەرمووێت: (قەدەر چوار مەرتەبەى هەيە و دەبێت ئيماندار باوەڕى پێى هەبێت:مەڕتەبەى يەكەم: ئيمان هێنان بە زانستى خواى گەورە، خواى گەورە زانستى بە هەموو شتێك هەيە لە هەرچيەك كە هەبووە و هەرچيەك كە دەبێت، زانيويەتى و دەيزانێت.

مەڕتەبەى دووەم: ئيمان هێنان بە كتابى، كە هەموو ئەو شتانەى تێدايە كە ڕوودەدەن لە داهاتوو.

مەڕتەبەى سێيەم: ئيمان هێنان بەوەى كە خواى گەورە خالقى هەموو شتێكە.

مەڕتەبەى چوارەم: ئيمان هێنان بە ويستى خواى گەورە، واتە هەرچى بووە و هەرچى دەبێت، بە ويستى خوا بووە و بە ويستى ئەو دەبێت)[١].

---

[١] التوضيحات الجلية على شرح العقيدة الطحاوية (٢/٦٠٠).

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەموو شتێک لە (لوح المحفوظ)دا نووسراوە و هیچ گۆرانکاری بەسەردا نایێت، زانایان دەڵێن هیچ شتێک قەدەری خوای گەورە ناگۆڕێت و ئەوەی لە (لوح المحفوظ) دا نووسراوە و گۆڕانکاری بەسەر دا نایێت، بەڵام ئەوەی لە کتابی فریشتە دا نووسراوە گۆڕانکاری بەسەردا دێت، کە ئەو گۆڕانکاری بەسەردا هاتنە هەمووی لە (لوح المحفوظ) دا نووسراوە.

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الأَرْضِ وَلا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ {الحديد:٢٢}.

واتە: هیچ بەڵاو ناخۆشییێک تووشتان نابێت لە زەویدا، وەک قات و قڕی یان... وە نە لە خۆشتاندا ئیلا پێش ئەوەی بەدی بێن لە "لوح المحفوظ" دا تۆمار کراوە، بەڕاستی ئەوەش بۆ خوا شتێکی ئاسانە.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (رفعت الأقلام وجفت الصحف)[1]. واتە: قەلەمەکان هەڵگیراون و وەرەقەکان وشک بوونەتەوە.

مبارەکفوری ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (قەدەر لە لوح المحفوظ نووسراوە، دوای ئەم نووسینە و تەواو بوون لەم نووسینە هیچی تر نانوسرێتەوە)[2].

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَمْحُوا اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِنْدَهُ أُمُّ الْكِتَابِ﴾ {الرعد:٣٩}، واتە: هەرشتێک خوای گەورە ویستی لێ بێت دەیسڕێتەوە و هەر شتێکیش ویستی لێ بێت دەیهێڵێتەوە.

---

(١) رواه الترمذي (٢٥١٦) وصححه من حديث ابن عباس.
(٢) تحفة الاحوذي (٢٦٧/٧).

ابن تيمييه ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚت دەفەموویٚت: (زانایان دەڵیٚن ڕەش کردنەوە و هیٚلانەوە باسی کتابی فریشتەیە، بەڵام زانستی خوای گەورە هیچ گۆڕانکاری بەسەردا نایێت)[١].

هەروەها پیٚغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویٚت: (هەر کەسیٚک حەز بکات ڕۆزی بەرفراوان بیٚت و تەمەنی دریٚژ بیٚت با سیلەی ڕەحم بگەینیٚت).

زانایان دەڵیٚن ئەمە باسی کتابی فریشتەیە "زیاد بوونی ڕۆزی و تەمەن دریٚژی".

عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): (لا يَزِيدُ فِي الْعُمْرِ إِلا الْبِرُّ وَلا يَرُدُّ الْقَدَرَ إِلا الدُّعَاءُ وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيُحْرَمُ الرِّزْقَ بِالذَّنْبِ يُصِيبُهُ)[٢].

واتە: پیٚغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویٚت: (تەمەن زیاد ناکات ئیلا بە چاکە نەبیٚت، وە هیچ شتیٚک قەدەر ڕەت ناکاتەوە ئیلا دوعا نەبیٚت، وە پیاو لە ڕزق بیٚ بەش دەبیٚت بەهۆی ئەو تاوانەی کە تووشی بووە).

زانایان دەڵیٚن ئەم فەرموودەیەش باسی کتابی فریشتەیە بە هۆی دوعا گۆڕانکاری بەسەر دا دیٚت، بەڵام ئەوەی لە لای خوای گەورەیە لە (لوح المحفوظ)دا ناگۆڕدریٚت.

عومەر خوا لیٚی ڕازی بیٚت تەوافی دەکرد و دەگریا و دەیفەرموو: (یا الله ئەگەر سزا یان تاوانت  نووسی بیٚ بۆم  ئەوا ڕەشی بکەوە، چونکە هەر شتیٚک تۆ ویستت لیٚ بیٚت دەیسڕیتەوە و هەر شتیٚک تۆ ویستت لیٚ بیٚت دەیهیٚڵیتەوە، "ام الکتاب" لای تۆیە و بەختەوەری و لیٚ خۆش بوونم بۆ بنووسە).

---

[١] مجموع فتاوی.
[٢] رواه ابن ماجه (٤٠٢٢).

محمد عبدالرحمن الخمیس خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (جۆرەکانی تقدیر بەگوێرەی کات:

(١) ئەوەی لە لوح المحفوظ دایە.

(٢) تەقدیری دەرهێنانیان لە پشتی نەوەی ئادەم.

(٣) تەقدیری عمری، ئەوەی لە ڕەحمی دایکدا دەنووسرێت.

(٤) تەقدیری سالانە، ئەوەیە کە لە شەوی قەدردا دەنووسرێت.

(٥) تەقدیری ڕۆژانە، ئەوەیە کە ڕۆژانە دیار دەکرێت)[١].

زانایان دەڵێن کتابی فریشتە ئەمەیان دوو جۆرە:

(١) (الكتابة العمرية): کاتێک منالْ دەبێتە پارچە گۆشت و ڕوحی بە بەردا دەکرێت، دەنووسرێت نێرینەیە یان مێینەیە هەروەها تەمەن و ڕزق و ڕۆزی و سەبارەت بەوەی خەلکی بەهەشتە یان دۆزەخە هەموو ئەمانە دەنووسرێت لەو کاتە، بەڵگە:

(أ) عن عبد الله بن مسعود: "حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَهُوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ: (إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا ثُمَّ يَكُونُ فِي ذَلِكَ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ يَكُونُ فِي ذَلِكَ

---

[١] التوضيحات الجلية على شرح العقيدة الطحاوية (٢/٦٠٢).

مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ يُرْسَلُ الْمَلَكُ فَيَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ: بِكَتْبِ رِزْقِهِ وَأَجَلِهِ وَعَمَلِهِ وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ)[١].

(ب) وعن أنس بن مالك رضى الله عنه عن النبى (ﷺ) قال: (وَكَّلَ اللَّهُ بِالرَّحِمِ مَلَكًا فَيَقُولُ أَىْ رَبِّ نُطْفَةٌ أَىْ رَبِّ عَلَقَةٌ أَىْ رَبِّ مُضْغَةٌ فَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَقْضِىَ خَلْقَهَا قَالَ أَىْ رَبِّ أَذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى أَشَقِىٌّ أَمْ سَعِيدٌ فَمَا الرِّزْقُ فَمَا الْأَجَلُ فَيُكْتَبُ كَذَلِكَ فِى بَطْنِ أُمِّهِ)[٢].

(٢) (الكتابة الحولية): قەدەری ساڵانەی مرۆڤە لە شەوی قەدردا دەنووسرێت، بەڵگە:

(أ) خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿حمٓ۝١ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ۝٢ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ۝٣ فِيهَا يُفۡرَقُ كُلُّ أَمۡرٍ حَكِيمٍ۝٤ أَمۡرٗا مِّنۡ عِندِنَآۚ إِنَّا كُنَّا مُرۡسِلِينَ۝٥﴾ [الدخان: ١-٥]

ابن تيميه ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ڕزق دوو جۆرە:

یەکەمیان: ئەوەی خوای گەورە دەزانێت و ڕزقی پێی دەدات ئەمەیان ناگۆڕدرێت.

دووەمیان: ئەوەی نووسراوە و پیشانی فریشتە دراوە و دەزانن ئەوە زیاد و کەم دەبێت بە گوێرەی سەبەب، چونکە خوای گەورە فەرمان بە فریشتە دەکات ڕزقیان بنووسێت، ئەگەر پەیوەندی خزمایەتی گەیاند ئەوا بۆی زیاد دەبێت، هەروەک فەرموودە هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (من سره أن يبسط له في رزقه وينسأ له في أثره فليصل رحمه)[٣].

---

[١] رواه البخاري (٣٢٠٨)، ومسلم (٢٦٤٣).

[٢] رواه البخاري (٦٥٩٥)، ومسلم (٢٦٤٦).

[٣] مجموع الفتاوى (٨/٥٤٠-٥٤١).

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک ئیمانی بە قەدەر نەبێت کافرە.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئیمان هێنان بەوەی خوای گەورە هەموو شتێکی تەقدیر کردووە، وتەی: "فلیس مني"، پێغەمبەر (ﷺ) خۆی لێ بەری کردووە چونکە کافرە، پێغەمبەر (ﷺ) بەری یە لە هەموو کافرێک)[1].

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەرکەسێک باوەڕی بە قەدەر هەبێت هەست بە خۆشی و چێژی ئیمان دەکات، وە تام و چێژی ئیمان و ئارامیش لە کاتی بەڵا و ناخۆشی دایە، هیچ ناڕازی بوون و خراپەیەک دەرنابڕێت بەڵکو ئیمانی بە قەزا و قەدەر هەیە و تەسلیم بووە.سەبارەت بەوەی ئیمانی بە قەدەر نەهێناوە بەردەوام لە ناخۆشی و دڵەڕاوکێ دا دەبێت، تووڕە دەبێت و ناڕازی بوون دەردەبڕێت و لەومەی نەفسی خۆی دەکات و دەڵێت: بۆچی فڵانە کارم نەکرد؟ خۆزگە فلانە شتم بکردبا، خۆزگە ئاوام بکردبا، پاشان تووشی سزایەکی توند دەبێت گەورەتر لە ئازاری موسیبەتەکە[2].

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەرچی دەبێت و ڕوودەدات تا ڕۆژی قیامەت قەڵەم هەرهەمووی نووسیوە بە فەرمانی خوای گەورە، ئایا ڕۆژی قیامەت و دوای ڕۆژی قیامەت داخلی قەدەری خوای گەورە دەبێت و ئەویش نووسراوە یان نا؟

وەڵام: گومانی تێدا نیە قەڵەم هەموو شتێکی نووسیوە تەنانەت خۆشی و ناخۆشییەکانی ڕۆژی قیامەت و بەهەشت و دۆزەخیشی نووسیوە، سەبارەت بە وتەی: (إلی یوم القیامة) دوو ئیحتیمال هەیە:

---

[1] القول المفید (٢٣٣/٣).

[2] إعانة المستفید (٣٦٣/٢-٣٦٤).

(١) لەوانەیە لەبەرئەوە خوای گەورە فەرموو بێتی: (هەتا ڕۆژی قیامەت)، چونکە تاقیکردنەوەی دونیا هەتا مردن و قیامەتە.

(٢) لەوانەیە پیتی: (إلی) بە مانای (مع)ە بێت، چونکە پیتی (إلی) لە زمانی عەرەبی دا چوار مانا

هەڵدەگرێت:

أ- انتهاء الغاية الزمانية.

ب- المعية.

ج- عند.

د- بەمانای (ل) دێت.

لەسەر ئەمە ماناکەی بەم شێوەیە دەبێت: (لەگەڵ ڕۆژی قیامەت)، نەک هەتا ڕۆژی قیامەت.

**٨-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە زانستی خوای گەورە یان زانستی لوح المحفوظ بەراورد ناکرێت لەگەڵ زانستی دروستکراوەکان، ئەو زانستە کەمەی دراوە بە پێغەمبەران نابێت بەراورد بکرێت لەگەڵ زانستی خوا، یان بڵێیت زانستی پێغەمبەر (ﷺ) زیاترە لە هی لوح المحفوظ، چونکە زانستی لوح المحفوظ هەتا ڕۆژی قیامەتە، بەڵام زانستی پێغەمبەر هەتا دوای ڕۆژی قیامەتە، نابێت ئەم وتەیە بڵێیت.

بەداخەوە ئەمە قسەی بانگخوازێکە کە کوفرێکی ڕوون و ئاشکرایە، وەڵام بۆ ئەم وتەیە هەمان وەڵامی سوودی حەوتەمە، وتەی: (إلی يوم القيامة) دوو ئیحتیمال هەیە:

(١) لەوانەیە لەبەر ئەوە خوای گەورە فەرموو بێتی: (هەتا ڕۆژی قیامەت)، چونکە تاقیکردنەوەی دونیا هەتا مردن و قیامەتە.

(٢) لەوانەیە پیتی: (إلى) بە مانای (مع)ە بێت، چونکە پیتی (إلى) لە زمانی عەرەبی دا چوار مانا هەڵدەگرێت:

أ- انتهاء الغاية الزمانية.

ب- المعية.

ج- عند.

د- بەمانای (ل) دێت.

**وفي رواية لابن وهب: قال رسول الله (ﷺ): (فمن لم يؤمن بالقدر خيره وشره أحرقه الله بالنار).**

واتە: لە ڕیوایەتی ابن وهب دا دەفەرموویت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەسێ ئیمان نەهێنێت بە قەدەربە خێر و شەڕیەوە، ئەوا خودا بە ئاگر دەیسوتێنێت).

### ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(لابن وهب):** ناوی عبدالله بن وهبە، پێشەوا و فەرموودەناس بووە، وە کتابی هەیە لە فەرموودە و ڕیوایەت.

### هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە ئیمان هێنان بە قەدەر واجبە، هەر کەسێک ئیمانی بە قەدەر نەبێت سزا دەدرێت بە ئاگر.

### سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئیمان هێنان بە قەدەر واجبە، ئیمان تەواو نابێت مەگەر بەمە نەبێت، سەبارەت بەوەی باوەڕی پێ نەبێت ئەوا خوای گەورە بە ئاگر دەیسوتێنێت[1].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هەر کەسێک ئینکاری قەدەر بکات یان بە گومان بێت ئەوا خوای گەورە بە ئاگر دەیسوتێنێت، چونکە سێ مەقامامان هەیە:

یەکەم: ئیمانێکی تەواوی بە هەر چوار مەرتەبەکانی قەدەر هەیە.

---

[1] القول المفيد (٢٣٦/٣).

دووەم: ئینکاری ئەمە دەکات.

ئەم دووانە ڕوون و ئاشکران، چونکە یەکەمیان ئیمانە و دووەمیان کوفرە.

سێیەم: کەسێک بەگومانە و دوو دڵە.

ئەمەیان بە کوفر دادەنرێت، لەبەر ئەوە دەفەرمووێت: "فمن لم یؤمن" ئینکاری کردن و گومان داخلی ئەمە دەبێت[١].

**٣-** وتەی: (أحرقه الله بالنار)، بەڵگەیە سزای ئاگری دۆزەخ سوتێنەرە، بە پێچەوانەی وتەی ئەوانەی دەڵێن خەلکی دۆزەخ هەست بە سزای ئاگر ناکەن، بەڵکو هەست بە سزایەکە دەکەن و لاشەیان دەسوتێنێت[٢].

---

[١] القول المفید (٢٣٦/٣-٢٣٨).

[٢] القول المفید (٢٣٦/٣-٢٣٨).

**وفي المسند والسنن عن ابن الديلمي قال: أتيت أبي بن كعب، فقلت: في نفسي شيء من القدر، فحدثني بشيء لعل الله يذهبه من قلبي، فقال: (لو أنفقت مثل أحد ذهباً ما قبله الله منك حتى تؤمن بالقدر، وتعلم أن ما اصابك لم يكن ليخطئك، وما أخطأك لم يكن ليصيبك، ولو مت على غير هذا لكنت من أهل النار). قال: فأتيت عبد الله بن مسعود، وحذيفة بن اليمان، وزيدبن ثابت، فكلهم حدثني بمثل ذلك عن النبي (ﷺ). حديث صحيح رواه الحاكم في صحيحه.**

ابن الديلمی دەڵێت: (چووم بۆ لای ئوبەی کوڕی کەعب پێیم گوت شتێ لە دڵم دایە لەبارەی قەدەرەوە، جا شتێکم بۆ باس بکە بەڵکو خودا ئەو شتەم لە دڵ دا نەهێڵێت، ئەویش گوتی: ئەگەر بەقەد کێوی ئوحد زێڕ ببەخشیت ئەوا خودا لێت قبوڵ ناکات هەتا ئیمان نەهێنیت بە قەدەر و دڵنیا نەبیت کە هەر چیەک تووشت بووە و هاتووە بەسەرتا نەدەبوو تووشت نەبێت و نەیەت بەسەرتدا، هەر چیەکیش کە توشت نەبووە و نە هاتووە بە سەرتدا. نەدەبوو توشت نەبێت و نەیەت بە سەرتدا، خۆ ئەگەر لەسەر غەیری ئەمە بمریت ئەوا دڵنیابە دەبیتە خاوەنی جەهەننەم.

ابن الديلمی گوتی: ڕۆیشتم بۆلای عبد الله بن مسعود و حذيفة بن اليمان و زيد بن الثابت یش هەر هەموویان وەک ئەم فەرموودەیان لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆ باسکردم).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(ابن الديلمي):** ناوی عبدالله بن فيروز الديلمی یە، یەکێکە لە گەورە تابعی یەکان، باوکی کە ناوی فیروز بووە ئەسوەدی عنسی کوشتووە لە یەمەن کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کردووە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە ئیمان هێنان بە قەدەر واجبە، هەر کەسێک ئیمانی بە قەدەر نەبێت کافرە.

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە بگەڕێیتەوە بۆ لای ئەهلی عیلم ئەگەر کێشە بۆ مرۆڤ دروست بوو لە هەر شتێک، مرۆڤ ئەگەر نەخۆش کەوت دەبێت بچێت بۆ لای دکتۆر، بۆ نەخۆشی دڵ و گومان دروست بوون دەبێت بگەڕێیتەوە لای ئەهلی عیلم.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئەهلی عیلم ئەهلی بەڵگەن، سەرچاوەیان قورئان و سوننەتە، ئەهلی علم هیچ ناڵێن ئیلا بەڵگە هاتبێت لە قورئان و سوننەت، ابن عمر فەرموودەی باوکی خۆی کردە بەڵگە کاتێک جبریل دێتە لای پێغەمبەر (ﷺ) و پرسیاری لێ دەکات، لە کۆتاییدا دەفەرمووێت: (تؤمن بالقدر خيره وشره)، حوزەیفەی کوڕی یەمان دەفەرمووێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو دەیفەرموو: (هەر کەسێک بمرێت لەسەر بێجگە لەمە ئەوە لەمن نییە)[١].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئیمان هێنان بە قەزا و قەدەر واجبە و ئینکاری کردنی کوفرە.

---

[١] إعانة المستفيد (٣٦٤/٢).

## باب ما جاء في المصورين

**عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (قال الله تعالى: ومن أظلم ممن ذهب يخلق كخلقي، فليخلقوا ذرة، أو ليخلقوا حبة، أو ليخلقوا شعيرة). أخرجاه[١].**

**ولهما عن عائشة رضي الله عنها، أن رسول الله (ﷺ) قال: (أشد الناس عذابا يوم القيامة الذين يضاهئون بخلق الله)[٢].**

**ولهما عن ابن عباس رضي الله عنهما: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (كل مصور في النار يجعل له بكل صورة صورها نفس يعذب بها في جهنم)[٣].**

**ولهما عنه مرفوعا: (من صور صورة في الدنيا كلف أن ينفخ فيها الروح، وليس بنافخ)[٤].**

**ولمسلم عن أبي الهياج قال: قال لي علي: (ألا أبعثك على ما بعثني عليه رسول الله صلى الله عليه وسلم؟ أن لا تدع صورة إلا طمستها، ولا قبرا مشرفا إلا سويته)[٥].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** التغليظ الشديد في المصورين.

**الثانية:** التنبيه على العلة، وهو ترك الأدب مع الله لقوله: (ومن أظلم ممن ذهب يخلق كخلقي).

---

[١] أخرجه البخاري (٥٩٥٣)، ومسلم (٢١١١).

[٢] أخرجه البخارى (٥٩٥٤)، ومسلم (٢١٠٧).

[٣] أخرجه البخارى (٢٢٢٥)، ومسلم (٢١١٠).

[٤] أخرجه البخارى (٥٩٦٣)، ومسلم (٢١١٠/١٠٠).

[٥] أخرجه مسلم (٩٦٩).

**الثالثة:** التنبيه على قدرته وعجزهم، لقوله: (فليخلقوا ذرة أو شعيرة).

**الرابعة:** التصريح بأنهم أشد الناس عذابا.

**الخامسة:** أن الله يخلق بعدد كل صورة نفسا يعذب بها المصور في جهنم.

**السادسة:** أنه يكلف أن ينفخ فيها الروح. السابعة: الأمر بطمسها إذا وجدت.

# باب ما جاء في المصورين
## بابی باسکردنی ئەوەی کە چ سزایەک هاتووە سەبارەت بە وێنەکێشان

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (مناسبەی ئەم بابە لە کتابی تەوحید: وێنە دروست کردن و داهێنان بە وێنەکێش دەکرێت، ئەمەش شەریک بوونە لەگەڵ خوا لە دروست کردن و داهێناندا)[1].

صالح آل الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (مناسبەی ئەم بابە بە کتابی تەوحیدەوە لە دوو ڕووەوەیە:

یەکەم: لاسایی کردنەوەی دروستکراوەکانی خوای تێدایە، هەروەها تمثيل بە دروستکراوەکانی خوا و ناو و سیفەتی تێدایە.

دووەم: ئەمە هۆکارە بۆ تووش بوون بە شیرک، بەڵێ وێنە هەیە نایکەیتە شەریک لەگەڵ خوا، بەڵام وێنە لە ڕووی جنسەوە هۆکارێکە لە هۆکارەکانی شیرک، چونکە شیرکی زۆر لە موشریکەکان بەهۆی وێنەوە بووە، تەحقیقی تەوحید ئەوەیە دان بە وێنە نەنێیت لەبەر ئەوەی هۆکارێک بووە لە هۆکارەکانی تووش بوون بە شیرک کە موشریکەکان تووشی بوون لە عیبادەت دا)[2].

دانەری کتاب ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەگەر بەم ئایەتە دەستی پێبکردبا باشتر دەبوو: ﴿هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ {الحشر:٢٤}.

---

[1] القول المفيد (٢٨٤/٣).

[2] التمهيد لاپەڕە (٥٢٧).

**عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (قال الله تعالى: ومن أظلم ممن ذهب يخلق كخلقي، فليخلقوا ذرة، أو ليخلقوا حبة، أو ليخلقوا شعيرة). أخرجاه.**

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خودای بەرزو بڵند فەرمووی: کێ هەیە لەو کەسە زاڵم تر بێت، وێنەیەک دروست دەکات بە نیازی ئەوەی لاسایی ئەو وێنەیە بکاتەوە کە من دروستم کردووە، دەی ئەگەر ڕاست دەکەن با زەڕەیەک دروست بکەن، یان دەنکە گەنمێ دروست بکەن، یان دەنکە جۆیەک دروست بکەن).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(ومن أظلم):** واتە: کێ هەیە لەو کەسە ستەمکارتر بێت.

**(فليخلقوا ذرة):** واتە: با زەڕەیەک دروست بکەن، مەبەست پێی تەحدی یە.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

قەرعاوی دەفەرموێت: (فەرموودەکە بەڵگەیە وێنە کێشان حەرامە، وێنە کێشان حەرام کراوە چونکە لاسایی کردنەوەی خوای تێدایە و شیرکە لەگەڵ خوا لە پەروەردگاریەتیدا)[1].

## سوودەکانی فەرموودەکە:

---

[1] الجديد لاپەڕە (٤١١).

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەناو لاسایی کەرەوەکان کەس لەو کەسە ستەمکارتر نیە کە لاسایی دروستکراوەکانی خوای گەورە دەکاتەوە.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە وێنە کێشان حەڕامە، زانایان دەڵێن وێنە کێشان ئەم چەند حاڵەتانەن:

حاڵەتی یەکەم: کێشانی وێنەی دروستکراوێک کە ڕوحی نەبێت:

١- ئەگەر وێنەی دروست کراوێک بکێشیت کە ڕوحی نەبێت و ئەو دروستکراوە مرۆڤ دروستی کردبێت، ئەمەیان دروستە و هەموو زانایان یەک دەنگن لەسەری، وەک وێنە کێشانی ئوتومبێل و خانوو.

٢- ئەگەر وێنەی دروستکراوێک بکێشیت ڕوحی نەبێت و ئەو دروستکراوە خوای گەورە دروستی کردبێت و گەشەی نەبێت، ئەمەیان دروستە و هەموو زانایان یەک دەنگن لەسەری، وەک: وێنە کێشانی چیا و دۆل و ڕووبار.

**٣-** ئەگەر وێنەی دروستکراوێک بکێشیت ڕوحی نەبێت و ئەو دروستکراوە خوای گەورە دروستی کردبێت و گەشەی هەبێت، وەک: دار و ڕووەک، ئەمەیان جیاوازی هەیە لە نێوان زانایان:

أ- زۆربەی زانایان بۆ ئەوە چوون دروستە وێنەی بکێشیت.

ب- هەندێ زانای تر دەڵێن نابێت وێنەی بکێشیت، بەڵگە:

عن أبي هريرة رضى الله عنه قال : قال رسول الله (ﷺ): (قال الله تعالى: و من أظلم ممن ذهب يخلق كخلقى، فليخلقوا ذرة، أو ليخلقوا حبة، أو ليخلقوا شعيرة)[١].

واتە: خوای گەورە دەفەرمووێت: کێ هەیە لەو کەسە ستەمکار تربێت وێنەیەک دروست بکات بە نیازی ئەوەی لاسایی ئەو وێنەیە بکاتەوە کە من دروستم کردووە، دەی ئەگەر ڕاست دەکەن با زەڕەیەک (واتە مێرووەیەکی بچووک) دروست بکەن، یان دەنکە گەنمێ دروست بکەن، یان دەنکە جۆیەک دروست بکەن.

دەڵێن: (يخلق كخلقى) ئەم فەرموودەیە گشتیە وهەمو وێنەیەک دەگرێتەوە، تەواو کەری فەرموودەکە باسی دەنکە جۆ و گەنم دەکات، با ئەم دووانە دروست بکەن، کەچی هەردووکیان گەشەیان هەیە.

وتەی ڕاست وتەی زۆربەی زانایانە، بەڵگە:

(أ) فەرموودەی ابن عباس دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو دەیفەرموو: (من صور صورة كلف أن ينفخ فيها الروح ، وليس بنافخ) رواه البخارى، مسلم، واتە: هەر کەسێک وێنەیەک بکێشیت لە دونیا دا،

ئەوا لە قیامەت دا داوای لێ دەکرێت کە ڕۆحی بە بەردا بکات، ناشتوانێت ڕۆحی بە بەردا بکات، کەواتە ئەمە بەڵگەیە کە خاوەن ڕوح حەڕامە.

(ب) وە دەڵێین: (ليخلقوا حبة أو ليخلقوا شعيرة) ئەمە مەبەستی تەحدییە، واتە ئەو وێنە کێشانە ناتوانن دروستکراوی بێ ڕوح دروست بکەن ئەی چۆن دەتوانن خاوەن ڕوح دروست بکەن.

---

[١] رواه البخارى (٥٩٥٣) مسلم (٢١١١).

حاڵەتی دووەم: وێنە کێشانی دروستکراوێک بە دەست بکێشیت کە ڕۆحی هەبێت:

(١) ئەگەر پەیکەرێک یان وێنەیێک دروست بکات بۆ ئەوەی خەڵک بیپەرستن ئەوا کوفری گەوریە، ئەگەرچی باوەڕیشی بەم پەیکەر پەرستنە نەبێت.

(٢) ئەگەر وێنە یان پەیکەر دروست بکات و بڵێت ئەمە باشتر و جوانترە لە دروست کراوی خوا یان وەک خوا دروستی دەکەم، ئەمە کوفری گەورەیە.

(٣) ئەگەر وێنە یان پەیکەر دروست بکات و مەبەستی لاسای کردنەوەشی نەبێت حەڕامە و تاوانێکە لە تاوانە گەورەکان، چونکە کارەکەی بەڵگەیە کە لاسایی ئەو وێنەیە دەکات، یان وەک ئەو دروستی دەکات.

(٤) ئەگەر وێنە یان پەیکەر دروست بکات و تەنها سەر دروست بکات، زانایان دەڵێن نابێت.

ابن قدامە ڕەحمەتی خوای لێ دەڵێت: (ئەگەر وێنە سەری نەما کەراهەتیەکە دەڕوات، ابن عباس دەڵێت: وێنە سەرە ئەگەر سەر نەما ئەوا وێنە نیە)[1].

(٥) ئەگەر وێنە دروست بکات چاو یان لووت یان دەمی نەبێت دەڵێن ئەمە وێنە نیە.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (ئەگەر وێنە ڕوون نەبێت، چاو و یان لووت یان دەمی نەبێت ئەوا وێنەکە تەواو نیە و لاسایی دروستکراوی خوای گەورە نیە)[2].

---

(١) المغنی (١١١/٨).

(٢) مجموعة الفتاوی ابن عثیمین (٢٧٨/٢-٢٧٩).

(٦) ئەگەر وێنەی دواوەی مرۆڤ دروست بکات واتە ڕوخسار دەرنەچێت، یان وەک سێبەر دروستی بکات، دەڵێن ئەمەیان دروستە.

(٧) ئەگەر وێنە دروست بکات بەشتێک کاتی بێت، وەک دروست کردنی بە بەفر یان هەویر یان شیرینی، هەندێک دەڵێن دروستە بەڵام زۆربەیان دەڵێن نابێت و حەڕامە، ئەگەر وێنەکە تەواو و ڕوون بوو .

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (ئەو وێنەیەی کە حەڕام دەبێت ئەو پەیکەرەیە کە وەک پەیکەرە، واتە: دروست کردنی مرۆڤ بە هەویر یان جبس یان گەچ یان هەر موادێکی تر، دروست بکەیت لەسەر شێوەی مرۆڤ یان ئاژەڵ ئەمەیان حەڕامە)[1].

لەوانەیە یەکێک بڵێت بۆچی حەڕامە دروستی بکەیت لەکاتێکدا هیچ دروست کراوێک وەک بەفر نیە، شێوەی هیچ مرۆڤێکیش وەک بەفر نیە، دەڵێین ڕاستە بەڵام مەبەستی حەڕامیەکەی ئەوەیە نابێت وەک شێوەی ڕوح لەبەر بێت، واتە: سەری هەبێت یان لێو یان لووت مەرج نیە ئیلا لە ڕەنگ و شێوە وەک یەک بن جا لە گەچ یان ئاسن یان هەر موادێکی تر بێت.

حاڵەتی سێیەم: وێنەی روح لەبەر بگریت بە هۆی کامیرەوە یان موبایل یان ڤیدیۆ جیاوازی هەیە لە نێوان زانایان:

(١) هەندێک زانا دەڵێن وێنە و ڤیدیۆ حەڕامە.

(٢) هەندێک زانای تر دەڵێن وێنە و ڤیدیۆ دروستە.

---

[1] شرح ریاض الصالحین (٦/٢٠٧).

(٣) هەندێک زانای تر دەڵێن وێنە حەڕامە بەڵام ڤیدیۆ دروستە ئەگەر پێویست بکات.

دەڵێین ئەگەر وێنە نەگرێت باشترە، دەڵێین پەیکەر لەهەمووان ترسناکترە، پاشان وێنە کێشان بە دەست دواتر وێنە گرتن بە کامیرە یان مۆبایل، باشتر وایە وێنە بە کامیرە و مۆبایل نەگریت بۆ ئەوەی لە خیلاف ڕزگار ببیت ئەگەر وێنەشت گرت بەرفراوانی تێدایە، والله أعلم.

**٣-** ئەم فەرموووودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیر کردنی وتە بۆ خوای گەورە، خوای گەورە قسە دەکات بەڵام وەک قسەی دروستکراوەکان نیە، بەڵکو قسەی خالق بە هیچ دروستکراوێک ناچێت[١].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لاسایی کردنەوەی خوا لە وێنەدا حاڵەت هەیە کوفری گەورەیە.

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (لاسایی کردنەوە لە وێنەدا لە دوو حاڵەت کوفرە:

حاڵەتی یەکەم: پەیکەرێک دروست دەکات یان وێنەی خوایەک دروست دەکات، وەک ئەوەی پەیکەری بوزا بۆ بوزی یەکان دروست بکات، یان وێنە بکێشێت بۆ گاور و جولەکەکان، یان وینەی دایکی مەسیح بکێشێت، دروستکردنی وێنە و پەیکەری ئەو شتانەی دەپەرسترێن لەگەڵ خوا لەگەڵ ئەوەش زانستی هەبێت ئەم پەیکەرە دەپەرسترێت ئەمەیان کوفرە، چونکە وێنەی پەیکەرە بۆ پەرستن و دەزانێت دەپەرسترێت ئەمە شیرکی گەورەیە و کوفرە بە خوا.

---

[١] إعانة المستفيد (٣٦٦/٢).

حاڵەتی دووەم: وێنەیەک یان پەیکەرێک دروست دەکات و دەڵێت ئەمە جوانترە لە دروستکراوی خوا و ئەمە جوانترە  یان منیش وەک خوا دروستم کردووە، ئەمەیان کوفری گەورەیە و شیرکە بە خوای گەورە)[(١)].

---

[(١)] التهيد لاپەڕە (٥٢٩).

**ولهما عن عائشة رضي الله عنها، أن رسول الله (ﷺ) قال: (أشد الناس عذابا يوم القيامة الذين يضاهئون بخلق الله).**

واته: له عائیشه دهگێڕیتهوه خوا لێی ڕازی بێت دهفهرموویت: پێغهمبهر (ﷺ) فهرمووی: (سهختترین سزا لهناو خهڵکیدا له ڕۆژی قیامهتدا بۆ ئهو کهسانهیه که لاسایی خودا دهکهنهوه.)

**ڕاڤهی وشهکانی فهرموودهکه:**

**(ولهما):** واته: بوخاری و موسلیم.

**(الذين يضاهئون بخلق الله):** واته: ئهوانهی که لاسایی خودا دهکهنهوه.

**هۆکاری باسکردنی ئهم فهرموودهیه لهم بابه:**

دانهری کتاب لهبهر ئهوه ئهم فهرموودهی باسکردووه تاوهکو ڕوونی بکاتهوه وێنه کێشان حهڕامه.

**سوودهکانی فهرموودهکه:**

**١-** ئهم فهرموودهیه بهڵگهیه تصویر حهڕامه و له تاوانه گهورهکانه، لهبهر جێگیربوونی وهعید لهسهری، حیکمهت له حهڕامی ئهمه لاسایی کردنهوهی دروستکراوهکانی خوای تیدایه[١].

**٢-** ئهم فهرموودهیه بهڵگهیه واجبه ئیحترامی لایهنی پهروهردگاریهتی بگیرێت، چونکه کهس ناتوانێت شتێک دروست بکات وهک دروستکراوی خوا، لهبهر وتهی: (یضاهئون

[١] القول المفيد (٣/٢٥٩-٢٦٠).

بخلق الله)، لەبەر ئەوە خۆ بەگەورە دانان حەڕامکراوە، چونکە منازعەی تیدایە لەگەڵ خوا)[١].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە توندترین سزا بۆ ئەوانەیە کە لاسایی خوا دەکەنەوە، جا نییەتی لاسایی کردنەوەی هەبێت یان نا.

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لاسایی کردنەوەی خوا لە وێنەدا حاڵەت هەیە کوفری گەورەیە.

---

[١] القول المفيد (٣/٢٥٩-٢٦٠).

**ولهما عن ابن عباس رضي الله عنهما: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (كل مصور في النار يجعل له بكل صورة صورها نفس يعذب بها في جهنم).**

واته: له ابن عباس دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: گوێم له پێغەمبەر بوو (ﷺ) دەیفەرموو: (هەموو وێنەکێشێک له ئاگردایە، بە هەر وێنەیەک کە کێشاویەتی ڕۆح لەبەرێکی بۆ دادەنرێت له جەهەنەمدا و پێی عەزاب دەدرێت).

**ولهما عنه مرفوعا: (من صور صورة في الدنيا كلف أن ينفخ فيها الروح، وليس بنافخ).**

واته: دیسانەوە ابن عباس خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێک وێنەیەک بکێشێت له دونیادا، ئەوا له قیامەتدا داوای لێدەکرێت کە ڕۆحی بەبەردا بکات و ناشتوانێت ڕۆحی بەبەردا بکات).

**ڕاڤەی وشەکانی هەردوو فەرموودەکان:**

**(كل مصور في النار):** واته: هەموو وێنە کێشێک بۆ ناو ئاگره.

**(كلف):** واته: داوای لێدەکرێت، واته خوای گەورە داوای لێ دەکات.

**هۆکاری باسکردنی ئەم دوو فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم دوو فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە وێنەی ڕوح لەبەر حەرامە.

**سوودەکانی هەردوو فەرموودەکان:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە وێنەی ڕوح لەبەر حەرامە، هەر وێنەیەک ڕوح لەبەر نەبێت دروستە.

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (هەموو وێنەیەک دەگرێتەوە لە مرۆڤ و ئاژەڵ و دار و دەریا، بەڵام وتەی: (يجعل له بكل صورة صورها نفسا)، بەڵگەیە مەبەست پێی وێنەی خاوەن نەفسە، واتە ڕوحی هەیە)[(١)].

**٢-** ئەم فەرموودەیە دەکرێتە بەڵگە کە هەموو وێنەیەک حەڕامە هەتا ئەگەر بەهۆی کامێراشەوە بێت، کە ئەمە وتەی هەندێک لە زانایانە.

**٣-** ئەم فەرموودانە بەڵگەن وەعیدی توونـد هاتووە سەبارەت بە وێنە کێشان، لەوانە:

- پێغەمبەر (ﷺ) نەفرەتی لە وێنە کێشان کردووە.

- ستەمکارترین کەسە.

- توونـدترین سزای بۆ هەیە.

- بە هەر وێنەیەک کە کێشاویەتی ڕۆح لەبەرێکی بۆ دادەنرێت لە جەهەنەمدا و پێی عەزاب دەدرێت.

- لە قیامەتدا داوای لێدەکرێت کە ڕۆحی بەبەردا بکات و ناشتوانێت ڕۆحی بەبەردا بکات.

---

(١) القول المفيد (٣/٢٦٠-٢٦١).

**ولمسلم عن أبي الهياج قال: قال لي علي: (ألا أبعثك على ما بعثني عليه رسول الله (ﷺ)؟ ألا تدع صورة إلا طمستها، ولا قبرا مشرفا إلا سويته).**

واتە: موسلیم دەیگێڕێتەوە کە ئەبو هەیاج گوتی: ئیمامی عەلی خوا لێی ڕازی بێت پێی گوتم: (بزانە ڕەوانەت دەکەم بۆ کارێکی گرنگ، کە پێغەمبەریش (ﷺ) بۆ هەمان کار ڕەوانەی کردووم، ئەویش ئەمەیە کە نابێت لێ بگەڕێیت هیچ وێنەیەک بمێنێت ئیلا دەبێت بیسڕیتەوە یان تێکی بدەیت، هیچ قەبرێکی بەرزیش نەمێنێت ئیلا دەبێت تەختی بکەیت).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(عن أبي الهياج):** لە تابعی یەکانە.

**(قال لي علي):** واتە: عەلی بە منی گوت، عەلی مەبەست پێی عەلی کوڕی ئەبو تالبە.

**(ألا أبعثك):** بعث: ناردنە بۆ کاری گرینگ، وەک بانگەوازی کردن بۆ لای خوا.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

قەرعاوی دەفەرمووێت: (فەرموودەکە بەڵگەیە وێنە کێشان و هێشتنەوەی حەڕامە)[1].

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

[1] الجديد لاپەڕە (٤٤٨).

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەڕامە وێنەی ڕوح لەبەر هەڵبگریت و بهێلیتەوە، (طمس) بۆ شتێک بەکاردێت کە لاشەی نەبێت، چونکە ئەگەر لاشە بوایا دەیوت: (لكسرتها)، واتە: بیشکێنیت، بەڵگەیە کە باسی وێنەیە نەک پەیکەر.

زانایان دەڵێن هەڵواسینی وێنە بە دیوارەوە ئەم سێ حاڵەتانەن:

حاڵەتی یەکەم: هەڵواسینی وێنەی سروشتی کە ڕوحیان نیە، وەک: چیا و ڕووبار و دار و خانوو و شتی تری وەک ئەمانە، ئەمەیان دروستە هەڵیبواسی بە دیوارەوە.

حاڵەتی دووەم: هەڵواسینی وێنەی مرۆڤ جا چ ژن بێت یان پیاو وە چ مردوو بێت خاوەنی وێنەکە یان زیندوو بێت بۆ یادگاری ئەمەیان دروست نیە و حەڕامە.

حاڵەتی سێیەم: هەڵواسینی وێنە و پەیکەر و گۆڕی پیاو چاک کە خەڵک تووشی شیرک بوونە پێی یان بۆ بەگەورە دانان، ئەمەیان حەڕامە.

عَنْ أَبِي طَلْحَةَ الْأَنْصَارِيِّ قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: (لَا تَدْخُلُ الْمَلَائِكَةُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلَا تَمَاثِيلُ)[1].

واتە: لە باوکی تەلحەوە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەفەرموویێت: (فریشتەی ڕەحمەت ناچنە ماڵێک سەگ و پەیکەری تێدا بێت).

---

[1] رواه مسلم (٢١٠٦).

عَنْ أَبِي الْهَيَّاجِ الْأَسَدِيِّ قَالَ: قَالَ لِي عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ: أَلَا أَبْعَثُكَ عَلَى مَا بَعَثَنِي عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ لَا تَدَعَ تِمْثَالًا إِلَّا طَمَسْتَهُ وَلَا قَبْرًا مُشْرِفًا إِلَّا سَوَّيْتَهُ[١].

واته: ئەبوهەیاج گوتی: ئیمام عەلی پێی گوتم: بزانە ڕەوانەت دەکەم بۆ کارێکی گرنگ، کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هەمان کار منی ڕەوانە کردووە ئەویش ئەمەیە کە نابێت لێ بگەڕێیت هیچ وێنەیەک بمێنێت ئیلا دەبێت بیسڕیتەوە یان تێکی بدەیت، وە هیچ قەبرێکی بەرزیش نەمێنێت ئیلا دەبێت تەختی بکەیت .

عبدالله الحمید ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: ((طمس) بۆ شتێک بەکاردێت کە لاشەی نەبێت چونکە ئەگەر لاشە بوایا دەیوت: (لكسرتها)، واتە: بیشکێنیت "بەڵگەیە کە باسی وێنەیە نەک پەیکەر")

ئیمام النووی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە فەرمان کراوە بە گۆڕینی وێنەی خاوەن ڕوح.)[٢].

هەروەها دەفەرموویێت: (هەموو زانایان یەک دەنگن لە ڕێگری کردنی ئەگەر سێبەری هەبێت، واجبە بگۆڕدرێت، قاضی دەفەرموویێت: ئیلا ئەوە هاتووە یاری کردن بە بووکۆکی منالآن بۆ کچان ڕوخسەت دراوە بۆ ئەمە)[٣].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە هێشتنەوەی وێنەی ڕوح لەبەر حەرامە ئیلا ئەگەر وێنەکە لەسەر ڕەگەزنامە یان ناسمانە یان پارە بێت لەم حاڵەتە خۆ پاراستن لێی گرانە.

---

[١] أخرجه مسلم (٩٦٩).

[٢] شرح مسلم (٣٦/٧).

[٣] شرح مسلم (٨٢/١٤).

**٣-** ئەم فەرموودەکە بەڵگەیە واجبە وێنە بسڕیتەوە.

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە قەبری بەرز نەمێنێت ئیلا دەبێت تەخت بکرێت، لەبەر ئەوە وێنە و گۆڕی بەرزی پێکەوە باسکردووە چونکە هەردووکیان هۆکارن بۆ تووش بوون بە شیرک.

## باب ما جاء في كثرة الحلف

وقول الله تعالى: ﴿وَٱحۡفَظُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡۚ﴾ [المائدة: ٨٩]

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (الحلف منفقة للسلعة، ممحقة للكسب) أخرجاه[١].

عن سلمان رضي الله عنه أن رسول الله (ﷺ) قال: (ثلاثة لا يكلمهم الله ولا يزكيهم ولهم عذاب أليم: أشيمط زان، وعائل مستكبر، ورجل جعل الله بضاعته، لا يشتري إلا بيمينه، ولا يبيع إلا بيمينه) رواه الطبراني بسند صحيح[٢].

وفي الصحيح عن عمران بن حصين رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (خير أمتي قرني، ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم، قال عمران: فلا أدري أذكر بعد قرنه مرتين أو ثلاثا؟ ثم إن بعدكم قوما يشهدون ولا يستشهدون، ويخونون ولا يؤتمنون، وينذرون ولا يوفون، ويظهر فيهم السمن)[٣].

وفيه عن ابن مسعود رضي الله عنه أن النبي (ﷺ) قال: (خير الناس قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم، ثم يجيء قوم تسبق شهادة أحدهم يمينه، ويمينه شهادته).

قال إبراهيم: كانوا يضربوننا على الشهادة والعهد ونحن صغار[٤].

---

[١] أخرجه البخاري (٢٠٨٧)، ومسلم (١٦٠٦).

[٢] أخرجه الطبراني في "الكبير" (٢٤٦/٦ رقم ٦١١١)، و"الأوسط" (٣٦٧/٥ رقم ٥٥٧٧).

[٣] أخرجه البخاري (٢٦٥١)، ومسلم (٢٥٣٥).

[٤] أخرجه البخاري (٢٦٥٢)، ومسلم (٢٥٣٣).

**فيه مسائل:**

**الأولى:** الوصية بحفظ الأيمان.

**الثانية:** الإخبار بأن الحلف منفقة للسلعة، ممحقة للبركة.

**الثالثة:** الوعيد الشديد فيمن لا يبيع ولا يشتري إلا بيمينه.

**الرابعة:** التنبيه على أن الذنب يعظم مع قلة الداعي.

**الخامسة:** ذم الذين يحلفون ولا يستحلفون.

**السادسة:** ثناؤه صلى الله عليه وسلم على القرون الثلاثة، أو الأربعة، وذكر ما يحدث بعدهم.

**السابعة:** ذم الذين يشهدون ولا يستشهدون.

**الثامنة:** كون السلف يضربون الصغار على الشهادة والعهد.

## باب ما جاء في كثرة الحلف
## باسی زۆر سوێند خواردنی بەخوا

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (مناسبەی ئەم بابە لە کتابی تەوحید: زۆر سوێند خواردن بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە گەورەیی خوای گەورە لە دڵی سوێند خۆردا نیە، وە بەگەورە دانانی خوای گەورەش لە تەواوی تەوحیدە)[1].

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (مناسبەی ئەم بابە لە کتابی تەوحید دیارە: تەحقیقی تەوحید و تەواوی تەوحید لەگەڵ زۆر سوێند خواردن کۆنابنەوە، زۆر سوێند خواردن نەفی تەواوی تەوحید دەکات، سوێند هەروەک باسمان کرد تەئکید کردنەوەیە بە شتێکی گەورە کە خوای گەورەیە، هەر کەسێک تەئکید بکاتەوە و زۆر سوێند بەخوا بخوات ئەوا لەوانە نیە کە خوای گەورەی بە گەورە دانابێت، کەواتە دەبێت ناوی خوای گەورە بپارێزێت و دەبێت سوێند خواردن پێی بپارێزرێت ئیلا لە کاتی پێویست نەبێت، سەبارەت بە زۆر سوێند خواردنیش لە سیفەتی خەڵکی باش نیە)[2].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (دانەری کتاب دەیەوێت ڕوونی بکاتەوە زۆر سوێند خواردن تەوحید و ئیمان کەم دەکەنەوە، چونکە زۆر سوێند خواردن سەر دەکێشێت بۆ ئەم شتانە:

١- ئاسانکاری کردن لە سوێند خواردن و گوێ پێ نەدانی.

٢- درۆ.

٣- گومانی درۆ پێ بردن.

هەر کەسێک زۆر سوێند بخوات تووشی درۆ دەبێت، دەبێت سوێند کەم بکرێتەوە و زۆر سوێند نەخورێت، لەبەر ئەوە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَاحْفَظُواْ أَيْمَانَكُمْ﴾

---
[1] القول المفيد (٣/٢٧٢).
[2] التمهيد لاپەڕە (٥٣٣).

{المائدة:٨٩}، ئەم فەرمانە بۆ واجبی یە و دەبێت سوێند بپارێزرێت مەگەر پێویستی پێ هەبێت، ئیماندار سوێند دەپارێزێت ئیلا ئەگەر پێوسیت بکات یان مەسڵەحەتێکی شەرعی تێدا بێت یان لە کاتی کێشە، زۆر سوێند مەخۆ لەبەر ئەوەی گومانی درۆت پێ دەبردرێت)[1].

[1] التعلیق المفید لاپەڕە (٢٦٧).

وقول الله تعالى: ﴿وَاحْفَظُواْ أَيْمَانَكُمْ﴾ {المائدة:٨٩}.
واتە: خوای گەورە دەفەرموویت: (سوێندەکانتان بپارێزن).

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿وَاحْفَظُواْ أَيْمَانَكُمْ﴾: ئەم ئایەتە باسکراوە لە سیاقی کەفارەتی سوێند، پاراستنی سوێند سێ مانای هەیە:

١- پاراستنی لە سەرەتادا، واتە زۆر سوێند نەخۆیت، بزانە زۆر سوێند خواردن متمانە کەم دەکات و گومان دروست دەکات لە خەبەرەکەی.
٢- پاراستن لە ناوەڕاستدا، واتە کاتێک سوێندت خوارد سوێندەکە مەشکێنە مەگەر لەو حاڵەتانەی باسمان کرد.
٣- پاراستنی لە کۆتاییدا، واتە کەفارەت بدەیت دوای شکاندنی سوێند)[١].

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

قەرعاوی دەفەرموویت: (ئایەتەکە بەڵگەیە حەڕامە زۆر سوێند بخۆیت بە بێ هۆکار، مناسبەی ئەم بابە لە کتابی تەوحید ئەوەیە: ئایەتەکە بەڵگەیە حەڕامە زۆر سوێند بخۆیت، چونکە بەگەورە دانانی خوای گەورە کەم دەکاتەوە و نەفی تەوحید دەکات)[٢].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ پاراستنی سوێند، واتە پاراستنی سوێند لە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی دەگرێتەوە.

---

[١] القول المفيد (٢٧٢/٣-٢٧٥).
[٢] الجديد (٤٥١).

**عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (الحلف منفقة للسلعة، ممحقة للكسب) أخرجاه.**

واتە: لە ئەبو هوڕەیرە دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویت: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: (سوێند خواردن لە کڕین و فرۆشتندا پاڵ دەنێت بە شمەکەوە، کەسابەت و دەستکەوتەکەش تیا دەبات، واتە: بەرەکەتی تیا ناهێڵێت).

## ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:

**(الحلف):** واتە: سوێند خواردن بە درۆ، هەروەک ڕیوایەتی ئەحمد دەفەرموویت: (اليمين الكاذبة)[1].

**(منفقة للسلعة):** واتە: پاڵ دەنێت بە شمەکەوە و سەرفی دەکات.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردوە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە زۆر سوێند خواردن یان سوێند خواردن بە درۆ نەفی بەگەورە دانانی خوای گەورە دەکات.

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەڕامە بە درۆ سوێند بخۆیت بۆ کڕین و فرۆشتن.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە سوێند خواردن بە درۆ بەرەکەت ناهێڵێت و کەسابەت لەناو دەبات.

---

[1] أخرجه أحمد في المسند (٢/٢٣٥-٢٤٣،٤١٣).

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نەمانی بەرەکەت جۆرێکە لە جۆرەکانی سزا لەبەر ئەوەی هەڵنەستاوە بە جێ بەجێکردنی واجبێک ئەویش بە گەورە دانانی خوای گەورەیە.

صالح ال الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (ئەمە جۆرێکە لە سزا، چونکە ئەوەی دەفرۆشێت بە سوێند شت و مەکی خۆی سەرف دەکات، بەڵام بەرەکەت لە کەسابەتەکەیدا نامێنێت، چونکە بەرەکەت نەمان جۆرێکە لە جۆرەکانی سزا لەبەرئەوەی هەڵ نەستاوە بە جێ بەجێکردنی واجبێک ئەویش بە گەورە دانانی خوای گەورەیە)[1].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ڕاستگۆیی و سوێند پاراستن هۆکارە بۆ بەرەکەت، وە درۆ و بەکەم دانانی سوێند هۆکارە بۆ نەمانی بەرەکەت[2].

---

(١) التمهيد لاپەڕە (٥٣٣).

(٢) إعانة المستفيد (٣٨٥/٢).

**عن سلمان رضي الله عنه أن رسول الله (ﷺ) قال: (ثلاثة لا يكلمهم الله ولا يزكيهم ولهم عذاب أليم: أشيمط زان، وعائل مستكبر، ورجل جعل الله بضاعته، لا يشتري إلا بيمينه، ولا يبيع إلا بيمينه) رواه الطبراني بسند صحيح.**

لە سەلمان دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (سێ کەس هەن خوای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکات لە ڕۆژی قیامەتدا، خوا گەورە پاکیان ناکاتەوە لە گوناهەکانیان و سزایەکی بە ئێشیان بۆ هەیە، ئەوانیش ئەمانەن:

یەکەمیان: سەرسپی ئەوەی کە مووی سەری تێکەڵە لە ڕەش و سپی و زیناکەرە.

دووەمیان: هەژارێ کە موتەکەبیرە.

سێیەمیان: پیاوێکیش سوێند خواردنی بە خوا کردووە بە شمەکەکەی، هیچ نافرۆشێت ئیلا سوێندێکی لەگەڵدا دەخوات).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(أشيمط):** ئەو کەسەیە ڕەش و سپی مووی سەری تێکەڵ بە یەکتر بووە لەبەر گەورەیی تەمەنی.

**(عائل):** واتە: هەژار، هەژارێکە منالّی زۆری هەیە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە زۆر سوێند خواردن لە تاوانە گەورەکانە.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە زۆر سوێند خواردن لە تاوانە گەورەکانە.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە وەعیدێکی توونډ هاتووە سەبارەت بەو کەسەی کە زۆر سوێند دەخوات، ئەمە لە تاوانە گەورەکانە، چونکە وەعیدێکی توونډ لەسەری باسکراوە، بەڵگەیە زۆر سوێند خواردن لە تاوانە گەورەکانە)[1].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی وتە بۆ خوای گەورە، خوای گەورە قسە لەگەڵ ئەهلی تاعەت و عیبادەت دەکات.

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی وتە بۆ خوای گەورە، خوای گەورە قسە دەکات بەڵام وەک قسەی دروستکراوەکان یان سیفەتی دروستکراوەکان نیە، کە ئەمە مەزهەبی ئەهلی سوننەیە و پێچەوانەی جەهمی و موعتەزیلەیە)[2].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە مەبەست لە نەفی قسە کردن قسەی ڕازی بوونە، نەک خوای گەورە هەرگیز قسەیان لەگەڵ نەکات.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (مەبەست بە نەفی قسە کردن قسەی ڕازی بوونە، بەڵام قسەی تووڕە بوون و سزا ئەمە داخلی فەرموودەکە نابێت)[3].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە تاوانەکان هەندێکیان لە هەندێکی تر توونډ ترن، زینا کردن لە تەمەنی پیری توونډترە لە زینا کردن لە تەمەنی گەنجییەتی، خۆ بەگەورە دانان لە

---

[1] إعانة المستفيد (٣٨٥/٢).

[2] إعانة المستفيد (٣٨٥/٢).

[3] القول المفيد (٢٧٩/٣-٢٨٠).

هەژاری توندترە لە دەوڵەمەندی، تاوانە گەورەکان لێک جیاوازن بەگوێرەی حاڵی کەسەکە کە تووش بووە[١].

---

[١] إعانة المستفيد (٣٨٥/٢).

**وفي الصحيح عن عمران بن حصين رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (خير أمتي قرني، ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم، قال عمران: فلا أدري أذكر بعد قرنه مرتين أو ثلاثا؟ ثم إن بعدكم قوما يشهدون ولا يستشهدون، ويخونون ولا يؤتمنون، وينذرون ولا يوفون، ويظهر فيهم السمن).**

له عمران بن حصين دهگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (باشترینی ئوممەتەکەم ئەمانەی سەردەمی خۆمن، پاشان ئەوانی دوای ئەمانەن، پاشان ئەوانی دوای ئەوان ـ عیمران گوتی نازانم دوای خۆی دوو سەردەمی دیکەی باسکرد یان سیان ـ پاشان دوای ئێوە قەومێک پەیدا دەبن کە:

١ـ شاهیدی دەدەن لەگەڵ ئەوەشدا داوای شاهیدیان لێنەکراوە و ئاگاداری مەسەلەکەش نین.

٢ـ خیانەتکارن و خەڵکی بە ئەمانەت پارێزیان نازانن.

٣ـ نەزر دەکەن و نەزرەکەیان بەجێ ناهێنن.

٤ـ قەڵەویش لە ناویاندا بڵاو دەبێتەوە.

(واتە: هەموو ئاواتیان شەهوەت و ورگ و خواردن و خواردنەوەیە، ئەوەندەش تیایدا ڕۆدەچن هەتا قەڵەو دەبن.)

**وفيه عن ابن مسعود رضي الله عنه أن النبي (ﷺ) قال: (خير الناس قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم، ثم يجيء قوم تسبق شهادة أحدهم يمينه، ويمينه شهادته).**

**قال إبراهيم: كانوا يضربوننا على الشهادة والعهد ونحن صغار.**

له ابن مسعود دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (باشترینی خەڵكی ئەوانەی سەردەمی خۆمن. پاشان ئەوانی دوای ئەمان. پاشان ئەوانی دوای ئەوان. پاشان قەومێک پەیدا دەبن شاهیدی یەكێكیان پێش ئەوە دەكەوێت كە سوێند بخوات، وە یان سوێندخواردنەكەی پێش شاهیدیەكەی دەكەوێت.) (واتە: ئەوەندە پەلەدەكات لە سوێند خواردندا بەلایەوە گرنگ نیە بە هەر جۆرێک سوێند بخوات).

إبراهيم النخعي كە تابیعی تابیعییە دەڵێت: عادەت و بەرنامەی سەلەف وا بوو لێمانیان دەدا لەسەر شاهیدی دان و پەیمان دان، لە كاتێكدا كە ئێمە منداڵ بووین.

## ڕاڤەی وشەكانی ئەم دوو فەرموودەیە:

**(قرني):** هەندێک لە زانایان دەڵێن لێرە مەبەست پێی كات نیە بەڵكو وەسفە، واتە باشترینی خەڵک هاوەڵانان، پاشان تابعی یەكان، پاشان ئەوانی دواتر، وە هەندێكی تر بە كات لێكی دەدەنەوە، جیاوازی هەیە سەبارەت بە "قرن" :

(١) هەندێک دەڵێن چل ساڵە.

(٢) هەندێكی تر دەڵێن هەشتا ساڵە.

(٣) هەندێكی تر دەڵێن سەد ساڵە.

(٤) هەندێكی تر دەڵێن سەد و بیست ساڵە.

**(ثم إن بعدكم قوما يشهدون ولا يستشهدون):** واتە: شاهیدی دەدەن لەگەڵ ئەوەشدا داوای شاهیدیان لێنەكراوە و ئاگاداری مەسەلەكەش نین.

**(ويخونون ولا يؤتمنون):** واتە: خیانەتكارن و خەڵكی بە ئەمانەت پارێزیان نازانن.

**هۆکاری باسکردنی ئەم دوو فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم دوو فەرموودەیەی باسکردووە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە زۆر سوێند خواردن و گوێ پێ نەدان نیشانەی کەسی خراپە.

**سوودەکانی هەردوو فەرموودەکە:**

**١-** ئەم دوو فەرموودەیە بەڵگەن بۆ فەزڵی هاوەڵان خوا لێیان رازی بێت، ئەوان باشترینی ئومەتن، بەڵکو باشترینی خەڵکن[(١)].

**٢-** ئەم دوو فەرموودەیە بەڵگەن لەسەر فەزڵی هاوەڵان و تابعی یەکان و تابعی تابعی یەکان، چونکە ئەم قەرنانە زۆر زانست و زانای تیدا بوو، زۆرینەی زانایان لەم قەرنەدا بوون، وەک چوار پێشەوایەکان[(٢)].

**٣-** ئەم دوو فەرموودەیە بەڵگەن لەسەر نەهی کردن لەسەر زۆر سوێند خواردن و زۆر شایەتی دان، زەمی ئەو شایەتی دانە کراوە پێش ئەوەی داوای لێ بکرێت، چونکە ئەمە بەڵگەیە لەسەر پەلە کردن و زۆر گوێ پێ نەدانی بە شایەتی، بەڵام فەرموودە هاتووە ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە باشترین شایەتی دان ئەوەیە کەسەکە بڕوات شایەتی بدات پێش ئەوەی پرسیاری لێ بکەن.

عن زيد بن خالد الجهني رضي الله عنه أن النبي (ﷺ) قال: (ألا أخبركم بخير الشهداء؟ الذي يأتي بشهادته قبل أن يسألها)[(٣)].

---

(١) إعانة المستفيد (٢/٣٩٥).

(٢) إعانة المستفيد (٢/٣٩٥).

(٣) رواه مسلم (١٧١٩).

سەبارەت بەم دوو فەرموودەیە سێ وتە هەیە:

یەکەم: هەندێ زانا بۆ ئەوە چوون فەرموودەی "عمران بن حصین" ڕاسترە، چونکە فەرموودەکە بوخاری و موسلیمە.

دووەم: هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون فەرموودەی "زيد بن خالد" ڕاسترە، چونکە ڕیوایەتی ئەهلی مەدینەیە، بەڵام فەرموودەی "عمران بن حصين" ڕیوایەتی ئەهلی عیراقە، یان لەوانەیە فەرموودەی عمران مەبەست پێی سوێند بێت نەک شایەتی دان، کە ئەمە وتەی ابن عبدالبرە[1].

سێیەم: هەندێ زانای تر بۆ جمع چوون، جمعەکانیش ئەمانەن:

(١) فەرموودەی زيد بن خالد باسی ئەو حاڵەتەیە کەسێک شایەتی لە لایە بەڵام خاوەنی حەق ئەمە نازانێت، کەسەکە دێت شایەتی دەدات بێ ئەوەی داوای لێ بکرێت، یان دەمرێت کەسەکە دێتە لای میراتگرەکانی شایەتی دەدات، فەرموودەی عمران بن حصين شایەتی دەدات پێش ئەوەی داوا لێی بکرێت، یان کەسەکە شایستەی شایەتی دان نیە.

(٢) فەرموودەی (زيد بن خالد) باسی مافەکانی خوایە و فەرموودەی (عمران) باسی مافەکانی بەندەیە.

(٣) فەرموودەی (زيد بن خالد) لە بابی کنایەیە، وەک کنایە بەکارهاتووە لەبەر زوو چوون بۆ شایەتی دان، کەواتە داوای لێکراوە بەڵام لەبەر ئەوە دەڵێت پێش ئەوەی داوای لێ بکرێت چونکە بەپەلە وەڵامی دەداتەوە و ئامادە دەبێت.

---

[1] التمهيد (٣٠٠/١٧)، الإستذكار (٢٧/٢٢).

ابن تيمييه ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەوەی ڕاست بێت زەم کردن لەم فەرموودانە باسی ئەو کەسەیە کە شایەتی دەدات بە باطل، هەروەک ڕیوایەت هاتووە: (ثم يفشو فيهم الكذب، حتى يشهد الرجل وما يستشهد)، لەبەر ئەوە لەگەڵ ئەمەش باسی خیانەت و تەرک کردنی وەفا بە نەزر کراوە)[(١)].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (تەفسیلی تێدایە لەم دوو بەشە:

بەشی یەکەم: ئەگەر ئەوەی شایەتی بۆی دەدرێت نەزانێت، لەم حاڵەتە واجبە شایەتی بۆ بدات و خەبەری پێ بدات ئەگەر داواش نەکات.

بەشی دووەم: کەسێک شاهیدێکی هەیە و دەزانێت، باشتر وایە پەلە نەکات هەتا داوای لێ دەکرێت لەبەردەم ئەو کەسەی کێشەی لەگەڵ هەیە یان حاکم)[(٢)].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەم دوو فەرموودەیە بەڵگەن لەسەر نەهی کردن لەسەر زۆر سوێند خواردن و زۆر شایەتی دان، ئەمە ڕووی باسکردنی ئەم دوو فەرموودەیەیە لەم بابە)[(٣)].

**٤-** ئەم دوو فەرموودەیە بەڵگەن لەسەر واجبی پاراستنی ئەمانەت و خیانەت نەکردن تیایدا[(٤)].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە زەمی ئەوە کراوە سەرقاڵ بیت بە شەهوەت و خۆشی یەکانی نەفس، قەڵەو بوون بە دەست مرۆڤ نەبێت هیچی تێدا نیە و زەمکراو نیە.

---

(١) مجموع الفتاوي (٢٠/٢٩٦).

(٢) فتح ذي الجلال والإكرام (١٤/٥٦٠-٥٦١).

(٣) إعانة المستفيد.

(٤) إعانة المستفيد (٢/٣٩٦).

ابن حجر ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (قەلەوی زەمکراوە چونکە زۆرینەی قەڵەوەکان تێگەیشتنیان کەمە و گرانن بۆ عیبادەت کردن هەروەک ئەمە بەناوبانگە)[١].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە زەمی ئەوە کراوە سەرقاڵ بیت بە شەهوەت و خۆشی یەکانی نەفس، چونکە ئەمانە بێ تاقەتت دەکەن لە عیبادەت، نیشانەکەی بەدیار کەوتنی قەڵەوی یە لەسەر کەسەکە)[٢].

**٦-** ئەثەری ئیبراهیم بەڵگەیە لەسەر گرینگی دان بە پەروەردەی مناڵ و دروستە لە مناڵ بدەیت، کە ئەمە ڕێگایەکە لە ڕێگاکانی پەروەردەکردنی مناڵ.

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت : (دروستە لە مناڵ بدەیت ئەگەر هەڵەیەکی کرد بۆ ئەوەی چاک بێت ئەگەر مناڵەکە لە دە ساڵ کەمتریش بێت، ئەگەر لە حەوت ساڵیش کەمتر بێت ئەگەر بزانێت سوودی هەیە جا چ کوڕ بێت یان کچ، بەڵام لێدانێک بێت زیانی پێ نەگات و زۆر نەبێت بەلێدان لێڕا بێت و لووس ببێت، ئەگەر مناڵەکە لە خوشک و براکانی خۆی بدات یان ماڵەوە ئازار بدات، دروستە لێی بدەیت بە سووکی یان قسەی توند).

فەرمووده هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (مناڵەکانتان لێڕابێنن بۆ نوێژ لە حەوت ساڵی، ئەگەر گەیشتنە دە ساڵ لێیان بدەن لەسەر نوێژ)[٣].

---

[١] فتح الباري (٢٦٠/٥).
[٢] إعانة المستفيد (٣٩٧/٢).
[٣] رواه ابو داود.

هەروەها فەرموودەی ئەنەس هاتووە دەفەرموویت: (منالەکانتان لێڕابێنن بۆ نوێژ لە حەوت ساڵی، ئەگەر گەیشتنە سیانزە ساڵ لێیان بدەن لەسەر نوێژ)[1].

زانایان دەڵین ئەم دوو فەرموودەیە نابنە بەڵگە کە نابێت پێش دە یان سیانزە ساڵی لە منال بدەیت، بەڵکو باسی ئەوەی کردووە ئەگەر گەیشتنە ئەو تەمەنە نوێژیان نەکرد لێیان بدەن، بەڵام ئەگەر هەڵەیەکی تری کرد دروستە لێی بدەیت، هەروەها زانایان دەڵێن دەبێت لە کاتی لە منال دان دا ئەم خاڵانە ڕەچاو بکات:

(١) لێدانێکی زۆر نەبێت سنوور ببەزێنێت.

(٢) لێدانێکی زۆر بە ئازار نەبێت.

(٣) لێدانەکە دووبارە نەکەیتەوە لە یەک شوێنی لاشەی منالەکە.

(٤) لە نێوان دوو لێدان ماوە هەبێت بۆ ئەوەی ئازاری کەم بێتەوە.

(٥) نابێت لە ڕوخسار و سەر و عەوڕەتی منال بدەیت.

(٦) هەروەها دەبێت لێدانەکە سوودی هەبێت، نەک لە کەسێک بدات تێ نەگات و سوودی نەبێت، کەواتە ئەگەر زۆر بچووک بێت و تێ نەگات نابێت لێی بدەیت.

(٧) هەروەها هەندێک دەڵێن دەبێت لێدانەکە بۆ چاک بوونی منالەکە بێت، نەک لێدانەکە تۆڵە سەندنەوە بێت لە منال.

---

(١) رواه الدارقطني.

منداڵەکە نابێت شیر خۆر بێت، خەڵکانێک جاری وا هەیە لە منداڵی شیر خۆر دەدەن کە ئەمە نابێت.

## باب ما جاء في ذمة الله وذمة نبيه

وقول الله تعالى: ﴿وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَـٰهَدتُّمْ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلْأَيْمَـٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا﴾ [النحل: ٩١]

عن بريدة رضي الله عنه أن رسول الله (ﷺ) كان إذا أمر أميرا على جيش أو سرية أوصاه بتقوى الله ومن معه من المسلمين خيرا، فقال: (اغزوا بسم الله، في سبيل الله، قاتلوا من كفر بالله، اغزوا ولا تغلوا ولا تغدروا، ولا تمثلوا، ولا تقتلوا وليدا، وإذا لقيت عدوك من المشركين فادعهم إلى ثلاث خصال ـ أو خلال ـ فآيتهن ما أجابوك فاقبل منهم وكف عنهم، ثم ادعهم إلى الإسلام فإن هم أجابوك فاقبل منهم، ثم ادعوهم إلى التحول من دارهم إلى دار المهاجرين، وأخبرهم أنهم إن فعلوا ذلك فلهم ما للمهاجرين، وعليهم ما على المهاجرين، فإن أبوا أن يتحولوا منها فأخبرهم أنهم يكونون كأعراب المسلمين، يجري عليهم حكم الله تعالى، ولا يكون لهم في الغنيمة والفيء شيء إلا أن يجاهدوا مع المسلمين، فإن هم أبوا فاسألهم الجزية، فإن هم أجابوك فاقبل منهم وكف عنهم، فإن هم أبوا فاستعن بالله وقاتلهم. وإذا حاصرت أهل حصن فأرادوك أن تجعل ذمة الله وذمة نبيه، فلا تجعل لهم ذمة الله وذمة نبيه، ولكن اجعل لهم ذمتك وذمة أصحابك، فإنكم إن تخفروا ذممكم وذمة أصحابكم أهون من أن تخفروا ذمة الله وذمة نبيه.

وإذا حاصرت أهل حصن فأرادوك أن تنزلهم على حكم الله، فلا تنزلهم على حكم الله، ولكن أنزلهم على حكمك. فإنك لا تدري، أتصيب حكم الله فيهم أم لا) رواه مسلم[(١)].

**فيه مسائل:**

**الأولى:** الفرق بين ذمة الله وذمة نبيه، وذمة المسلمين.

---

(١) أخرجه مسلم (١٧٣١).

**الثانية:** الإرشاد إلى أقل الأمرين خطرا.

**الثالثة:** قوله: (اغزوا بسم الله في سبيل الله).

**الرابعة:** قوله: (قاتلوا من كفر بالله).

**الخامسة:** قوله: (استعن بالله وقاتلهم).

**السادسة:** الفرق بين حكم الله وحكم العلماء.

**السابعة:** في كون الصحابي يحكم عند الحاجة بحكم لا يدري أيوافق حكم الله أم لا.

# باب ما جاء في ذمة الله وذمة نبيه

## باسکردنی پەیمانی خوا و پەیمانی پێغەمبەرەکەی

صالح ال الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەمە لەبەر بەگەورە دانانی خوا و بەگەورە دانانی پێغەمبەرە (ﷺ)، بەگەورە دانانی خوا لە موناجات و داوا لێکردن و عیبادەت و مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵک هەموو ئەمانە لە تەواوی تەوحیدن، ئەم بابە لەڕووی مامەڵە کردنە لەگەڵ خەڵک، هەروەک بابی پێشووتر، بابی پێشووتر: "باب ما جاء في كثرة الحلف" پەیوەستە بە بەگەورە دانانی خوا لە مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکدا و ئەم بابەش "باب ما جاء في ذمة الله وذمة نبيه"، پەیوەستە بە بەگەورە دانانی خوا لە مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکدا لە حاڵەتی گران کە حاڵەتی جیهاد کردنە، دانەری کتاب ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە دەبێت خوای گەورە بە گەورە دابنرێت لە مامەڵە کردن لە گەڵ خەڵکدا لە گرانترینی حاڵەتەکاندا کە جیهاد کردنە، بەندە دەبێت ناو و سیفەتەکانی خوا بە گەورە دابنێت، لەوانە بەڵێنی خوا و پێغەمبەریش بەگەورە دابنێت.

والذمة: بەمانای بەڵێن دێت، (ذمة الله)؛ واتە بەڵێنی خوای گەورە و بەڵێنی پێغەمبەرەکەی، ئەگەر بەڵێنی خوای دا، پاشان بیشکێنێت ئەوا بەڵێنی خوای شکاندووە و تاوانی کردووە، ئەمە نەفی تەواوی تەوحیدی واجب دەکات، چونکە واجبە لەسەر بەندە خوای گەورە بە گەورە دابنێت و بەڵێنی خوا نەشکێنێت)[١].

مناسبەی ئەم بابە لە کتابی تەوحید: وەفا نەکردن بە بەڵێن دانی بەخوا بەکەم دانانە، ئەمەش خەلەلە لە تەوحید[٢].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەمە لە بابی بەگەورە دانانی بەڵێنی خوا و بەڵێنی پێغەمبەرە (ﷺ)، هەروەها لە بابی تەواو کردنی تەوحید و ئیمانیشە، وە شکاندنی بەڵێن نەقسە لە تەوحید و هۆکارە بۆ گاڵتە پێکردن)[٣].

عبدالله بن جار الله دەفەرمووێت: (مناسبەی ئەم بابە لە کتابی تەوحید: شکانی بەڵێن

---

[١] التمهيد لاپەڕە (٥٣٨).

[٢] القول المفيد (٣/٣٠٠).

[٣] التعليق المفيد لاپەڕە (٢٧١).

بەڵگەیە لەسەر بە گەورە دانەنانی خوای گەورە و قەدحە لە تەوحیددا)[١].

---

[١] الجامع الفرید لاپەڕە (٢١٧).

**وقول الله تعالى:** ﴿وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمۡ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلۡأَيۡمَٰنَ بَعۡدَ تَوۡكِيدِهَا﴾ [النحل: ٩١]

واته: خوای گەورە دەفەرموویت: (بەرامبەربە پەیمانی خودا بە وەفا بن کاتێ کە پەیمان دەدەن بە یەکتر، وە پەیمان شکێنی مەکەن دوای ئەوەی کە ئەو پەیمانەتان بە ناوی خوداوە پتەو کرد، وە بە تەئکید خواتان کردووە بە کەفیل بەسەر خۆتانەوە، واتە: "بە چاودێر و بە شاهید"، بە تەئکید هەرچییەک بکەن خودا دەیزانێت.

**ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:**

﴿وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ﴾: واتە: بەرامبەر پەیمانی خودا بە وەفا بن.

﴿وَلاَ تَنقُضُواْ الأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا﴾: واتە: پەیمان شکێنی مەکەن دوای ئەوەی کە ئەو پەیمانەتان بە ناوی خوداوە پتەو کرد.

**هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:**

عبدالله بن جار دەفەرموویت: (مناسبەی ئەم ئایەتە لەم بابە بەڵگەیە واجبە وەفا بە بەڵێن بکرێت و حەڕامە بشکێنرێت)[1].

قەرعاوی دەفەرموویت: (ئایەتەکە بەڵگەیە حەڕامە بەڵێن بشکێنێت، چونکە شکاندنی بەڵێن بەڵگەیە لەسەر بەگەورە دانەنانی خوای گەورە و نەفی تەوحید دەکات)[2].

**سوودەکانی ئایەتەکە:**

١- ئەم ئایەتە بەڵگەیە حەڕامە بەڵێن بشکێنیت.

---

(١) الجامع الفريد لاپەڕە (٢١٧).

(٢) الجديد لاپەڕە (٤٦١).

**٢-** هۆكاری دابەزینی ئەم ئایەتە ابن الجوزی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بەوەی كە لەسەر كێ دابەزیوە، دوو وتە هەیە: یەكەم: سەبارەت بە سوێندی ئەهلی جاهلی دابەزی، موجاهد و قەتادە ئەمەیان گوتووە. دووەم: سەبارەت بە خەڵكانێک دابەزی كە بەیعەتیان دا بە پێغەمبەر درووود و سەلامی خوای لێ بێت)[1].

[1] زاد المسير (٣٦٩/٤).

**عن بريدة رضي الله عنه أن رسول الله (ﷺ) كان إذا أمر أميرا على جيش أو سرية أوصاه بتقوى الله ومن معه من المسلمين خيرا، فقال: (اغزوا بسم الله، في سبيل الله، قاتلوا من كفر بالله، اغزوا ولا تغلوا ولا تغدروا، ولا تمثلوا، ولا تقتلوا وليدا، وإذا لقيت عدوك من المشركين فادعهم إلى ثلاث خصال ـ أو خلال ـ فآيتهن ما أجابوك فاقبل منهم وكف عنهم، ثم ادعهم إلى الإسلام فإن هم أجابوك فاقبل منهم، ثم ادعوهم إلى التحول من دارهم إلى دار المهاجرين، وأخبرهم أنهم إن فعلوا ذلك فلهم ما للمهاجرين، وعليهم ما على المهاجرين، فإن أبوا أن يتحولوا منها فأخبرهم أنهم يكونون كأعراب المسلمين، يجري عليهم حكم الله تعالى، ولا يكون لهم في الغنيمة والفيء شيء إلا أن يجاهدوا مع المسلمين، فإن هم أبوا فاسألهم الجزية، فإن هم أجابوك فاقبل منهم وكف عنهم، فإن هم أبوا فاستعن بالله وقاتلهم. وإذا حاصرت أهل حصن فأرادوك أن تجعل ذمة الله وذمة نبيه، فلا تجعل لهم ذمة الله وذمة نبيه، ولكن اجعل لهم ذمتك وذمة أصحابك، فإنكم إن تخفروا ذممكم وذمة أصحابكم أهون من أن تخفروا ذمة الله وذمة نبيه.**

**وإذا حاصرت أهل حصن فأرادوك أن تنزلهم على حكم الله، فلا تنزلهم على حكم الله، ولكن أنزلهم على حكمك. فإنك لا تدري، أتصيب حكم الله فيهم أم لا) رواه مسلم.**

واته: له بوڕیده دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت گوتی: (پێغەمبەری خودا (ﷺ) سوننەتی وا بوو کاتێ کە ئەمیرێکی دادەنا بۆ سوپایەک یا سریەیەک، ئامۆژگاری دەکرد بەمانە:

١- لە خۆیدا تەقواو لە خواترسان بەدی بهێنێت.

٢- لەگەڵ ئەو سەربازە موسڵمانانەشدا کە لەگەڵیدان چاکە بکات، پاشان دەیفەرموو:

٣- موجاهیدەکان غەزا بکەن بە پشتیوانی و ناوی خوا.

٤- لە ڕێگا و لە پێناوی خوادا بە (تەنها).

٥- بجەنگێن دژی هەرکەسێک کافر بووە بە خودا، (بە زاتی خوداو ناوەکانی و صیفاتەکانی و فەرمانەکانی.)

٦- غەزا بکەن و ماڵی غەنیمەت پێش دابەشکردن مەخەنە لاوە بۆ خۆتان، غەدر مەکەن، واتە (پەیمان شکێنی) مەکەن. لاشەی کوژراوەکان مەشێوێنن و مناڵ مەکوژن.

٧- کاتێ ڕووبەڕووی دوژمن بوویتەوە ئەوانەی کە موشریکن ئەوا بانگیان بکە بۆ یەکێ لەم سێ شتانە جا ئەگەر هەرکامیان پێ قبووڵ بوو، تۆش لێیان قبوڵ بکە و لێیان گەڕێ:

یەکەم: بانگیان بکە بۆ موسڵمان بوون، جا ئەگەر قبوڵیان کرد تۆش لێیان قبوڵ بکە، پاشان بانگیان بکە بۆ ئەوەی لە شار و وڵاتی خۆیانەوە ـواتە لە وڵاتی کوفرەوە کۆچ بکەن بۆ شار و وڵاتی موهاجیران، پێیان ڕابگەیەنە ئەگەر ئەوەیان کرد موهاجیرین چ حەقێکیان هەبێت ئەوانیش هەمان حەقیان هەیە، وەک ئەوانیش ئەرکیان دەکەوێتە سەر، جا ئەگەر نەیانویست و وڵاتی خۆیان بەجێ نە هێشت ئەوا خەبەریان پێ بدە کە وەک دەشتەکیە موسڵمانەکان حسابیان لەگەڵدا دەکرێت و حوکمی خودایان بەسەردا جێ بەجێ دەکرێت لە دەستکەوت و غەنیمەتەکاندا هیچیان بەر ناکەوێت، مەگەر کاتێ کە لەگەڵ موسڵمانەکاندا بەشداری جەنگ بکەن.

دووەم: ئەگەر ئەوانەشیان قبوڵ نەکرد ئەوا داوای جزیەو سەرانەیان لێ بکە. خۆ ئەگەر بەمەش ڕازی بوون لێیان قبوڵ بکە و لێیان گەڕێ.

سێیەم: جا ئەگەر بەوەش ڕازی نەبوون ئەوا داوای کۆمەکی لە خودا بکە و لە دژیان بجەنگێ، کاتێکیش کە خەڵکی قەڵایەکت گەمارۆدا داوایان لێت کرد کە پەیمانی خودا و پەیمانی پێغەمبەریان پێبدەیت، واتە (سوێندیان بۆ بخۆیت و پەیمانیان بدەیتێ کە خۆیان و ماڵیان سەلامەت دەبێت) ئەوا پەیمانی خودا و پێغەمبەریان پێ نەدەیت.

بەڵکو پەیمانی خۆت و پەیمانی هاوەڵەکانتیان پێ بدە, چونکە ئەگەرهاتوو کەسانی "نەفام و بێ ئاگا"پەیمانی خۆت و هاوەڵەکانت بشکێنن، تاوانەکەی سوکترە لەوەی کە پەیمانی خودا و پەیمانی پێغەمبەرەکەی بشکێنن.

خۆ ئەگەر خەڵکی قەڵایەکت گەمارۆدا و داوایان لێت کرد کە دایان بەزێنیت لە قەڵاکە بەشەرتێ کە حوکمی خودایان بەسەردا جێبەجێ بکەیت، ئەوا دایان مەبەزێنە (لەسەر ئەوە)، چونکە تۆ نازانیت ئایا حوکمی خودا لەو بارەوە دەپێکیت یان نا.

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(علی جیش أو سریة):** (جیش): جەنگاوەری زۆرن، (سریة): بەشێکە لە جەیش و لێی جیادەبێتەوە و  پاشان دەگەڕێتەوە.

**(ولا تغلوا):** واتە: ماڵی غەنیمە مەبەن، (الغلول): بردنی ماڵی غەنیمەیە پێش دابەش کردن.

**(ولا تغدروا):** واتە: غەدر مەکەن.

**(ولا تقتلوا ولیدا):** (الولید): مناڵە نەگەیشتۆتە حەدی تەکلیف.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەیەی باسکردوە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە نابێت پەیمانی خوا و پێغەمبەر بە خەڵک بدەیت، چونکە شکاندنی پەیمانی خۆت سوکترە لە پەیمانی خوا و پێغەمبەر.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە جزیە لە هەموو کافرێک وەربگریت، جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بە جزیە، سێ وتە هەیە:

یەکەم: هەندێ زانا بۆ ئەوە چوون جزیە لە هەموو کافرێک وەردەگیرێت، کە ئەمە وتەی مالکی و ابن تیمیە و ابن قیم و صنعانی و ابن عثیمینە، بەڵگە:

- فەرموودەی بوڕەیدە: (قاتلوا من کفر بالله)، و وتەی: (وإذا لقیت عدوك من المشرکین).

- ئایەتی سوڕەت تەوبە: ﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلا بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنْ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾ {التوبة:٢٩}، ئەمە مفهومی نیە چونکە خەبەرە بە واقع، بەڵگە منطوقی فەرموودەی بوڕەیدەیە.

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەم وتەیە وتەیەکی بەهێزە و بەڵگەکانی بەهێزن).

دووەم: هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون (جزیة) لەهەموو کافرێک وەردەگیرێت ئیلا لە پەیکەر پەرستەکانی عەرەب نەبێت، ئەمانە نابێت جزیەیان لێ وەربگریت دەبێت یان موسڵمان بن یان شمشێر، کە ئەمە وتەی حەنەفی و وتەیەکە لە وتەکانی ئەحمەد، بەڵگە:

- پیغەمبەر (ﷺ) جزیەیانی لێ وەرنەگرتوە و لەبەر ئەوە کوفرەکەیان توندترە لە کوفری کەسانی تر، چونکە قورئان بە زمانی ئەوان دابەزیوە و موعجیزە بۆ حەقی ئەوان دیارترە.

سێیەم: هەندێ زانای تر بۆ ئەوە چوون جزیە تەنها لە ئەهلی کتاب و مەجوسی وەردەگیرێت، کە ئەمە وتەی شافعی و وتەیەکە لە وتەکانی ئەحمەد و وتەی ابن حزمە، بەڵگە:

(١) خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلا بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنْ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾ {التوبة:٢٩}

(٢) عن عبدالرحمان بن عوف رضي الله عنه أن النبي (ﷺ) أخذها -يعني الجزية- من مجوس هاجر[١].

ابن عبدالبر ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (وتەی پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بە مەجوس: (سنوا سنة أهل الكتاب)، واتە: مەبەست پێی جزیەیە، بەڵگەیە ئەوان ئەهلی کتاب نین، لەسەر وتەی زۆربەی زانایان)[٢].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (دروستە جزیە لە بێجگە لە گاور و جوولەکە و مەجوس وەربگیرێت، چونکە ئەهلی کتاب دەقیان لەسەریان هاتووە بۆ جزیە لێ وەرگرتنیان، وە مەجوسیش فەرموودەیان لەسەر هاتووە، سەبارەت بە بێجگە لەمانە جیاوازی هەیە لەنێوان ئەهلی عیلم: وتراوە بێجگە لەمانە لە کەسی تر وەرناگیرێت، هەروەها وتراوە: لە موشریکی عەرەب وەرناگیرێت چونکە زەلیلی تێدایە، ئەوەی ڕاست

---

[١] رواه البخاري (٣١٥٦-٣١٥٧).
[٢] التمهيد (١١٩/٢).

بێت لە هەموو کافران وەردەگیرێت، لەبەر عمومی وتەی: "من کفر بالله"، نەی گوت: گاور و جوولەکە)[١].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (دروستە جزیە لە کافر وەربگریت ئەگەر موسڵمان نەبوو، ئەوەی دیار بێت ئەم جزیەیە عقوبە نیە، بەڵکو لەبەر پاراستنی ماڵ و منداڵ و خوینی ئەوانە لەبەر ئەوە واجبە لەسەر ئێمە پارێزگاری لێ بکەین، ئەگەر کەسێک تەعەدایان لێکرد حەقی وەردەگرینەوە، وە هەروەها واجبە لەسەر ئێمە تەعەدایان لەسەر لابدەین ئەگەر کەسێک بیەوێت تەعەدایان لێ بکات)[٢].

وتەی ڕاست وتەی یەکەمە جزیە لە هەموو کافرێک وەردەگیرێت، چونکە:

- فەرموودەی بورەیدە عامە و دوای ئایەتی جزیە بووە.

- ئایەتی جزیە تەنها باسی ئەهلی کتابی کردوە و فەرموودەش هاتووە جزیەی لە مەجوس وەرگرتوە، کەواتە هیچ کێشە دروست نابێت ئەگەر لە هەموو کافرێکی تر وەربگیرێت.

پوختەی وتەی زانایان:

(١) هەموو زانایان یەک دەنگن جزیە لە ئەهلی کتاب و مەجوس وەردەگیرێت ئەگەر موسڵمان نەبوون.

(٢) وتەی ڕاست جزیە لە هەموو کافرێک وەردەگیرێت.

(٣) ئەم جزیەیە عقوبە نیە، بەڵکو لەبەر پاراستنی ماڵ و منداڵ و خوێنی ئەوانە.

---

[١] القول المفید (٣/٣١٨-٣٢٢).

[٢] فتح ذي الجلال والإكرام (١٤/٦١).

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ناردنی سەریە، سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) وابوو سەریە و جەیشی دەنارد، ئەگەر یەکێک بڵێت بۆچی سەریە و جەیشی دەنارد و بەخۆی نەدەچوو لەگەڵیان؟

دەڵێین: چونکە دینی ئیسلام شعائیری هەیە، شرائع پێویستیان بەوەیە هەندێک مرۆڤ پێی هەڵسن و بەڕێوەی ببەن، نموونە: پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هەموو جەنازەیەک نەدەچوو، جار هەبوو جەنازە بەلایدا دەبردرا و خۆی نەدەچوو، لەبەرئەوەی سەرقاڵ بوو بە شتێک کە گرینگتر بوو لە شوێن کەوتنی جەنازە، هەروەها جیهادیش بەهەمان شێوە، هەموو جار لەگەڵ هەموو سەریە و جەیشێک نەدەچوو، بەڵکو لە مەدینە دەمایەوە بۆ ئەوەی خەڵک فێری خێر و چاکە بکات، ئاماژە بۆ ئەمە کراوە بە وتەی خوای گەورە: ﴿وَمَا كَانَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةٗۚ﴾ [التوبة: ١٢٢]، دینی ئیسلام دەبێت تەواو بکرێت، ئیمانداران هەندێکیان هەندێک شتی تر تەواو دەکەن و تەواوکەری یەکترن)[١].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ هاندانی جەنگاوەرەکان، لەبەر وتەی: (اغزوا)، پاشان جارێکی تر تەئکیدی کردووە بە وتەی: (اغزوا)، واتە: بجەنگێن بە جەنگانێکی ڕاست و بنیات نرا بێت لەسەر زیرەکی و بەرەو پێش چوون[٢].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ پشت بەستن بەخوا و داوای یارمەتی کردن لێی، لەبەر وتەی (بسم الله)[٣].

[١] فتح ذي الجلال والإكرام (١٤/٥٣-٥٤).
[٢] فتح ذي الجلال والإكرام (١٤/٥٤).
[٣] فتح ذي الجلال والإكرام (١٤/٥٥).

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئامۆژگاری کردنی جەنگاوەران بۆ ئیخلاس.، لەبەر وتەی: (في سبيل الله)[1].

**٦-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە واجبە شەڕ بکەیت لەگەڵ کافران؛ لەبەر وتەی "قاتلوا من كفر بالله"، عموم تایبەت کراوە لەم فەرموودەیە ئەویش ئەوەیە ئەگەر جزیەی دا وازی لێ دەهێنرێت و شەڕی لەگەڵ ناکرێت[2].

**٧-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە زۆر لێ کردن لە ئیسلامدا نیە، ئەگەر زۆر لێ کردن هەبوایا ئەوا جزیەش لە کافران قبووڵ نەدەکرا، قبووڵ کردنی جزیە بەڵگەیە زۆری لێ کردن لە ئیسلامدا نیە[3].

**٨-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نابێت زانا لە حوکمێک لە حوکمەکان بڵێت: حوکمی ئیسلام بەم شێوەیەیە، ئەمە نابێت بگوترێ چونکە دەکرێت تووشی هەڵە بیت، ئەو کات هەڵە دەدرێتە پاڵ ئیسلام، بەڵکو بەم شێوەیە بڵێ من وای دەبینم حوکمی ئیسلام ئاوا و ئاوایە، هەندێک لە متأخرینەکان لە کتابەکانیاندا دەڵێن: "ئیسلام ئاوا دەڵێت، ئیسلام ئاوا مەنع دەکات"، شتی تری وەک ئەمانە، کەوابو دەبێت خۆت بپاریزیت لەم قسانە.

سەبارەت بەوەی ئەحکامێک ڕوون و ئاشکرا بێت و دیار بێت، وەک: نوێژ و زەکات، وەک ئەوەی بڵێت مرداربوو حەڕامە لە دینی ئیسلام، وە زینا حەڕامە لە حوکمی ئیسلام، ئەمە شتێکی ڕوون و ئاشکرایە.

بەڵام هەتا ئەگەر مرۆڤ فەتوا بدات و دەربڕین بەم شێوەیە ئەمە ئیسلامە، ئەوە ئەمەیان بە گومانی من جۆرێکە لەوەی مرۆڤ سەرسام بێت بە نەفسی خۆی، وە زەعیمی ئیسلام

---

[1] فتح ذي الجلال والإكرام (١٤/٥٥).
[2] فتح ذي الجلال والإكرام (١٤/٥٥).
[3] فتح ذي الجلال والإكرام (١٤/٦٠).

بێت. ئەوە بەسە بڵێیت ئەمە حەڕامە و پاشان بەڵگە باس بکەیت لە کتابی خوای گەورە [١].

**٩-** دروستە دوژمن گەمارۆ بدەیت، واتە: دەوریان بدەیت و گەمارۆیان بدەیت، وە لەو گەمارۆدانانە دروستە ئاویان لێ ببڕیت ئەگەر ئەمە نزیکتر بێت بۆ وەڵام دانەوە. ئەگەر یەکێک بڵێت: چۆن دەبێت ئاویان لێ ببڕیت، بڕینی ئاو منداڵ و ئافرەت و پیرەکان بە هیلاک دەبات، ئەمانەش لەوانەن کە نابێت بکوژرێن؟

دەڵێین: ئەمە شتێکی پێویستە و تابعە بۆ بێجگە لە مەبەستی ئێمە، ئێمە مەبەستمان بەهیلاک دانی ئەوانە نییە کە شەڕ ناکەن، بەڵکو مەبەستمان بەهیلاک دانی جەنگاوەرەکانە، بە هیلاک چوونی ئەمانە تابعە بۆ بێجگە لە مەبەستی ئێمە، لەبەر ئەوە دروستە بە مەنجەنیق هێرش بکەیتە سەریان لە کۆنەوە [٢].

**١٠-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروست نیە بۆ سەرکردەی جەنگ کە گەمارۆی قەڵای دا دوژمن دابەزێنێت و پەیمانی خوا و پێغەمبەریان پێبدات، (واتە سوێندیان بۆ بخۆیت و پەیمانیان بدەیتێ کە خۆیان و ماڵیان سەلامەت دەبێت)، عیلەتەکە پێغەمبەر

(ﷺ) باسیکردوە ئەویش ئەوەیە هەندێک جار ئەو بەڵێنە دەشکێندرێت، شکاندنی بەڵێنی مرۆڤ سوکترە لەوەی پەیمانی خوا و پێغەمبەرەکەی بشکێنی [٣].

---

[١] فتح ذي الجلال والإكرام (٦٧/١٤).

[٢] فتح ذي الجلال والإكرام (٦٢/١٤-٦٣).

[٣] فتح ذي الجلال والإكرام (٦٣/١٤).

**١١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەڕامە مناڵ بکوژیت، زانایان سەبارەت بە کوشتنی ئافرەت و مناڵ دەڵێن ئەم دوو حاڵەتەیە:

حاڵەتی یەکەم: ئافرەت شەڕ ناکات، لەم حاڵەتە نابێت بیکوژیت، بەڵگە:

ابن عمر خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویت: پێغەمبەر (ﷺ) ئافرەتێکی کوژراوی بینی لە یەکێک لە جەنگەکان، ئینکاری کوشتنی ئافرەت و منالی کرد[1].

قاضی عیاض ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (هەموو زانایان یەک دەنگن و ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە کە نابێت ئافرەت و منال بکوژیت ئەگەر شەڕ نەکەن)[2].

حاڵەتی دووەم: ئافرەت شەڕ دەکات دژی موسڵمانان، لەم حاڵەتە دروستە ئافرەت بکوژیت، بەڵگە:

فەرموودەی ڕباح بن ربیع رواه ئەبوداوده ڕوون و ئاشکرایە.

خطابی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە ئافرەت ئەگەر شەڕی کرد دەکوژرێت، ئایا نابینیت کە علەتی حەڕامی کوشتنی ئەوەیە کە شەڕ ناکات، ئەگەر شەڕی کرد دروستە شەڕی لەگەل بکەیت و بیکوژیت)[3].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (بەڵێ ئەگەر ئافرەت شەڕ بکات هەروەک سەردەمی ئێستای ئێمە، ئافرەت هەیە ئێستا فڕۆکە لێ دەخوڕێت و گولە و

---

(١) متفق علیه

(٢) الإکمال (٣/٤٨).

(٣) معالم السنن (٤/١٣).

ساروخ و شتی تر دەهاوێژێت، ئەوا شەڕی لەگەڵ دەکرێت و دەکوژرێت، چونکە هیچ جیاوازی نییە لە نێوان ئەمە و پیاو.

ئەگەر یەکێک بڵێت: ئافرەت چارەسەری نەخۆش و بریندارەکان دەکات، ئایا حوکمیان هەمان حوکمی ئەوانەیە کە شەڕ دەکەن؟

دەڵێین: ئەوەی دیار بێت ئەمە سوکترە، چونکە ئەمانە چارەسەر دەکەن نەک شەڕ، ئەگەر ئافرەتێک ببینین جل و بەرگێک لەبەر دەکات وەک جل و بەرگی جەنگاوەرەکان، ئەوا شەڕی لەگەڵ ناکەین ئیلا ئەگەر دڵنیا بین کە بەژداری جەنگی کردووە)[1].

**١٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەرامە لاشەی بشێوێنیت و غەدر بکەیت وماڵی غەنیمە بدزیت.

**١٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە نابێت یەکسەر شەڕ لەگەل کافران بکەیت، بەڵکو جیهاد لەگەڵ ولاتانی کافر بەم هەنگاوانەیە:

یەکەم: سەرەتا بانگی دەکەیت بۆ ئیسلام، ئەگەر قبوڵیان کرد دەبێت قبووڵ بکرێن و نابێت شەڕیان لەگەڵ بکرێت.

دووەم: ئەگەر قبوڵیان نەکرد و موسڵمان نەبوون، ئەوا داوای سەرانە (جزية)یان لێ دەکرێت، ئەگەر سەرانەیان دا ئەوا دەبێت وازیان لێ بهێنرێت لەناو موسڵمانان دا بژین بێ ئەوەی ئازار بدرێن و مافەکانیان پارێزراو دەبن.

---

[1] فتح ذي الجلال والإكرام (٨١/١٤).

سێیەم: ئەگەر نە ئیسلامیان قبووڵ کرد و نە سەرانەشیان قبووڵ کرد ئەوا شەڕیان لەگەڵ دەکرێت.

**١٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە بانگیان دەکەیت بۆ موسڵمان بوون، جا ئەگەر قبوڵیان کرد تۆش لێیان قبووڵ بکە، پاشان بانگیان بکە بۆ ئەوەی لە شار و وڵاتی خۆیانەوە واتە لە وڵاتی کوفرەوە کۆچ بکەن بۆ شار و وڵاتی موهاجیران، پێیان ڕابگەبەنە: ئەگەر ئەوەیان کرد موهاجیرین چ حەقێکیان هەبێت ئەوانیش هەمان حەقیان هەیە، وەک ئەوانیش ئەرکیان دەکەوێتە سەر جا ئەگەر نەیانویست و وڵاتی خۆیان بەجێ نەهێشت ئەوا خەبەریان پێ بدە کە وەک دەشتەکیە موسڵمانەکان حسابیان لەگەڵدا دەکرێت و حوکمی خودایان بەسەردا جێ بەجێ دەکرێت لە دەستکەوت و غەنیمەتەکاندا هیچیان بەر ناکەوێت، مەگەر کاتێ کە لەگەڵ موسڵمانەکاندا بەشداری جەنگ بکەن.

**١٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە موجتەهید جار وایە صواب دەپێکێت و جار وایە صواب ناپێکێت، لەبەر وتەی (فإنك لا تدري أتصيب فيهم حكم الله أم لا؟)، وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (إذا حكم الحاكم، فاجتهد، فأصاب فله أجران، وإن أخطأ فله أجر واحد)[1].

---

[1] القول المفيد (٣١٨/٣-٣٢٢).

## باب ما جاء في الإقسام على الله

**عن جندب بن عبد الله رضي الله قال: قال رسول الله (ﷺ): (قال رجل: والله لا يغفر الله لفلان، فقال الله عز وجل: من ذا الذي يتألى علي أن لا اغفر لفلان؟ إني قد غفرت له وأحبطت عملك) رواه مسلم[١].**

**وفي حديث أبي هريرة أن القائل رجل عابد، قال أبو هريرة: تكلم بكلمة أو بقت دنياه وآخرته[٢].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** التحذير من التألي على الله.

**الثانية:** كون النار أقرب إلى أحدنا من شراك نعله.

**الثالثة:** أن الجنة مثل ذلك .

**الرابعة:** فيه شاهد لقوله (إن الرجل ليتكلم بالكلمة) الخ..

**الخامسة:** أن الرجل قد يغفر له بسبب هو من أكره الأمور إليه.

---

[١] أخرجه مسلم (٢٦٢١).

[٢] أخرجه أحمد (٢/٢٢٣ رقم ٨٢٩٢)، وأبو داود (٤٩٠١)، وابن حبان (١٣/٢٠ رقم ٥٧١٢).

## باب ما جاء في الإقسام على الله
## باسی سوێند خواردن لەسەر خوا

عبدالرحمن بن ناصر السعدی ڕەحمەتی خوای لی بێت دەفەرمووێت: (سوێند خواردن بەسەر خوا زۆرینەی جار لە بابی سەرسام بوونە بە نەفس و بێ ڕەوشتی یە لەگەڵ خوا، ئیمان تەواو نابێت هەتا سەلامەت نەبیت لەمە)[١].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لی بێت دەفەرمووێت: (باب باسكردنی وەعید سەبارەت بەمە، لەبەر ئەوە سوێند خواردن بەسەر خوا جورئەتە بەسەر خوا و نەقسە لە تەوحیددا و لاواز بوونە لە ئیمان هەروەک دانەری کتاب باسیکردووە)[٢].

صالح آل الشيخ خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (سوێند خواردن لەسەر خوا لە دوو ڕووەوەیە:

ڕووی یەکەم: لە ڕووی خۆ بەگەورە دانان و ناچار کردنە، ئەو کەسەی سوێند بەسەر خوا دەخوات نەفسی خۆی بەرز دەکات هەتا وای لێ دێت وەک ئەوەی بڵێیت مافی بەسەر خواوە هەیە، ئەمە نەفی تەواوی تەوحید دەکات و جار هەیە نەفی ئەسلی تەوحید دەکات، خاوەنەکەی شایستەی ئەم سزایەیە کە فەرموودەکە باسیکردووە، ئەوەی سوێند بەسەر خواوە دەخوات حوکم دەکات بەوەی خۆی هەڵیبژاردووە، دەڵێت: سویند بەخوا فلانە شت بۆ فلانە کەس نابێت و بەدەستی نایێنێت، ئەمە خۆ بەگەورە دانان و بە کەم دانانی کەسانی ترە، دەیەوێت حوکمی خوا وەک حوکمی خۆی بێت لەبەر خۆ بەگەورە دانان بەسەر خوا کە خوا وا دەکات بە گوێرەی گومانی، ئەمەیان سوێند خواردن بەسەر

---

[١] القول السديد لاپەڕە (١٣٦).
[٢] التعليق المفيد.

خوا جۆرێکە لە تحکم کردن بەسەر کارەکان و کردەوەکانی خواوە، ئەمەش لە دڵی کەسێک دەرناچێت کە خوای گەورەی بە گەورە دانابێت.

ڕووی دووەم: سوێند بەسەر خوا دەخوات نەک وەک خۆ بەگەورە دانان و زاڵ کردن بەسەر خوا، بەڵکو گومانی ڕاستی بەرامبەر واقع هەیە، یان لە شتێک ئاڕاستەی دەبێت، ئەمەیان سوێند بەسەر خوا دەخوات بۆ داهاتوو وەک زەلیلی و ملکەچی نەک خۆ بەگەورە دانان و زاڵ کردن، ئەمەیان فەرموودەی لەسەر هاتووە: (إن من عباد الله من لو أقسم على الله لأبره)، چونکە سوێندی بەسەر خواوە خواردووە نەک لە ڕووی خۆ بەگەورە دانان و زاڵ کردن، بەڵکو لە ڕووی پێویستی و هەژاری بووە بۆ لای خوا)[1].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لی بێت دەفەرمووێت: (سوێند خواردن بەسەر خوا دابەش دەبێت بۆ سێ بەش:

یەکەم: سوێند دەخوات بەسەر خوا بە شتێک کە خوا و پێغەمبەر خەبەریان داوە جا چ نەفی بێت یان جێگیرکردن، ئەمەیان هیچی تێدا نیە، ئەمەیان گومانی تێدا نیە و بەڵگەی لەسەر هاتووە، وەک: (والله، ليشفعن الله نبيه في الخلق يوم القيامة)، نموونە: (والله لايغفر الله لمن أشرك به).

دووەم: سوێند دەخوات بەسەر خوا لەبەر بەهێزی ئومێد و گومانی باشی بە خوای گەورە، لەبەر چیرۆکی الربيع بنت النضر عمة أنس بن مالك رضي الله عنهما: "کاتێک ددانی ئافرەتێکی ئەنساری شکاند، کێشەکەیان هێنایە لای پێغەمبەری خوا بۆ ئەوەی حوکم بکات لەنێوانیان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بە تۆڵە سەندنەوە، سولحی پێشکەشیان کرد ڕازی نەبوون، ئەنەسی کوڕی نضر گوتی: ددانی ڕوبەیع دەشکێنن؟ سوێند بە خوا ئەی

[1] التمهيد لاپەڕە (٥٤١-٥٤٢).

نێردراوی خوا ددانی ڕوبەیع ناشکێندرێ، ئەنەس نەیدەویست حوکمی شەرعی ڕەت بکاتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەی ئەنەس کتابی خوا گەورە تۆلە دەسەنێتەوە"، واتە: ددان بە ددانە، گوتی: سوێند بەخوا ددانی ناشکێندرێت، ئومێدی بە خوا هەبوو کە ددانی ڕوبەیع ناشکێندرێت، خوای گەورە عەفوی خستە ناو دڵی ئەنساڕییەکان و عەفویان کرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (إن من عبادكم لو أقسم على الله لأبره).

بەشی سێیەم: کەسێک سوێند بەسەر خوا دەخوات و سەرسامە بە نەفسی خۆی، فەزڵی خوای گەورە مەنع دەکات و گومانی خراپ بە خوای گەورە دەبات، ئەمەیان حەڕامە و هۆکارە بۆ پووچ بوونەوەی کردەوە، ئەم سوێند خواردنە مەبەستی دانەری کتابە لەبەر ئەوەش ئەم فەرموودەیەی باسکردووە)[1].

---

[1] القول المفيد (٣/٣٢٩-٣٣٦).

**عن جندب بن عبد الله رضي الله قال: قال رسول الله (ﷺ): (قال رجل: والله لا يغفر الله لفلان، فقال الله عز وجل: من ذا الذي يتألى علي أن لا اغفر لفلان؟ إني قد غفرت له وأحبطت عملك) رواه مسلم.**

واته: جوندوبی کوڕی عبد الله خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (پیاوێک لە نەوەکانی ئیسرائیل گوتی: والله خوا لە فلان خۆش نابێت، خوداش فەرمووی: ئەوە کێیە (خۆی کردووە بە گەورە بەسەر منەوەو) سوێند دەخوات کە لە فلان کەس خۆش نابم، ئەوا من لێی خۆش بووم و کردەوەکەی تۆشم پووچەڵ کردەوە).

**وفي حديث أبي هريرة أن القائل رجل عابد، قال أبو هريرة: تكلم بكلمة أو بقت دنياه وآخرته.**

واته: لە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەدا هاتووە کە ئەوەی قسەکەی کرد پیاوێکی خواپەرست بووە، ئەبو هورەیرە فەرمووی: گوتەیەکی لە دەم هاتە دەر دونیا و قیامەتی لە دەست خۆی دا.

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(قال رجل):** ئەم پیاوە لەوانەیە ئەو پیاوە بێت کە لە فەرموودەی ئەبو هورەیرە باسکراوە.

**(والله لا يغفر الله لفلان):** ئەمە بەڵگەیە کەسەکە لە ڕەحمی خوای گەورە بێ ئومید بووە و بەندەکەی بەکەم داناوە و سەرسام بووە بە نەفسی خۆی.

**(وأحبطت عملك):** واتە: کردەوەکەی تۆم پوچەڵ کردەوە.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

قەرعاوی دەفەرموویت: (فەرموودەکە بەڵگەیە حەڕامە سوێند بەسەر خوا بخۆیت، چونکە تیابردنی حەقی پەروەردگاریەتی و بەندایەتی یە و نەفی تەوحید دەکات)[١].

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر حەڕامی سوێند خواردن بەسەر خوا، ئەگەر وەک ناچار کردنی خوا بێت و خێر و چاکەی بۆ بەندە نەکات، ئەمەیان نەقسە لە تەوحید[٢].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ترسناکی زمان، جاری وایە بە یەک وشە هەڵە دەکات دونیا و ئاخیرەتی تیادەچێت، ئەی دەبێت ئەو کەسە حاڵ و عاقیبەتی چۆن بێت کە زۆر لە دژی دین قسە دەکات؟[٣].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ئەوەی دانەری کتاب ئاماژەی بۆ کردووە: ئاگری دۆزەخ لە هەر کام لە ئێوە نزیکترە لە پەتی نەعلەکانتان، بەهەشتیش بەهەمان شێوە[٤].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە حەرامە مرۆڤ سەرسام بێت بە نەفسی خۆی و کەسانی تری پێ کەم بێت[٥].

---

[١] الجديد لاپەڕە (٤٦٧).

[٢] إعانة المستفيد (٤٢٣/٢).

[٣] إعانة المستفيد (٤٢٣/٢).

[٤] إعانة المستفيد (٤٢٣/٢-٤٢٤).

[٥] إعانة المستفيد (٤٢٤/٢).

## باب لا يستشفع بالله على خلقه

**عن جبير بن مطعم رضي الله عنه قال: جاء أعرابي إلى النبي (ﷺ) فقال: يا رسول الله: نهكت الأنفس، وجاع العيال، وهلكت الأموال، فاستسق لنا ربك، فإنا نستشفع بالله عليك وبك على الله، فقال النبي (ﷺ): (سبحان الله! سبحان الله!) فما زال يسبح حتى عرف ذلك في وجوه أصحابه؛ ثم قال النبي (ﷺ): (ويحك، أتدري ما الله؟ إن شأن الله أعظم من ذلك، إنه لا يستشفع بالله على أحد من خلقه) وذكر الحديث. رواه أبو داود[١].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** إنكاره على من قال: نستشفع بالله عليك.

**الثانية:** تغيره تغيرا عرف في وجوه أصحابه من هذه الكلمة.

**الثالثة:** أنه لم ينكر عليه قوله: (نستشفع بك على الله).

**الرابعة:** التنبيه على تفسير (سبحان الله).

**الخامسة:** أن المسلمين يسألونه الاستسقاء.

---

[١] أخرجه أبو داود (٤٧٢٦)، وابن أبي شيبة في "العرش" (ص٥٦ رقم(١)، ابن أبي شيبة في "التوحيد (٢٣٩/١ رقم ١٤٧).

## باب لا یستشفع بالله علی خلقه
## نابێت ناوی خوا بکرێتە واستە و تکاکار لای دروستکراوەکان

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (مناسبەی ئەم بابە لە کتابی تەوحید ئەوەیە: خوا کردنە شەفاعەتکار لای دروستکراوەکان نەقسە بۆ خوای گەورە، چونکە وای لێ دێت پلەی خوای نزمتر کردووە لە هی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەگەر لە بەرزترین پلەشدا بێت خوای گەورە پێویستی بەوە نیە شەفاعەت بکات لە لای)[1].

عبدالله بن جار الله دەفەرمووێت: (مناسبەی ئەم بابە لە کتابی تەوحید: خوا کردنە شەفاعەتکار لای دروستکراوەکان نەفی تەوحید دەکات، چونکە نەقسە بۆ خوای گەورە)[2].

[1] القول المفید (٣/٣٣٨).
[2] الجامع الفرید لاپەڕە (٢٢٣).

**عن جبير بن مطعم رضي الله عنه قال: جاء أعرابي إلى النبي (ﷺ) فقال: يا رسول الله: نهكت الأنفس، وجاع العيال، وهلكت الأموال، فاستسق لنا ربك، فإنا نستشفع بالله عليك وبك على الله، فقال النبي (ﷺ): (سبحان الله! سبحان الله!) فما زال يسبح حتى عرف ذلك في وجوه أصحابه؛ ثم قال النبي (ﷺ): (ويحك، أتدري ما الله؟ إن شأن الله أعظم من ذلك، إنه لا يستشفع بالله على أحد من خلقه).**

واته: جوبەیر کوڕی موتعیم خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: دەشتەکیەک هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) و گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا گیانلەبەرەکان لاواز بوون، ماڵ و منالّ کەوتنە برسێتیەوە، سەروەت و سامانمان تیاچوو، جا داوای بارانمان بۆ بکە لای پەروەردگارت، ئێمە خودا دەکەینە شەفاعەتکار لای تۆ (کە داوای باران بارینمان بۆ بکەیت)، تۆش دەکەین بە شەفاعەتکار لای خودا، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (سبحان الله، سبحان الله) هەر سوبحانەڵلای دەکرد هەتا ئەم ناڕەحەت بوون و هەڵوێستەی پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕوخساری هاوەڵەکانیدا بەدی کرا و ڕەنگی دایەوە، پاشان فەرمووی: هاوار بە حاڵت، ئایا دەزانیت الله کێیە؟ (شأن الله) (قەدر و گەورەیی) خودا زۆر لەوە گەورەترە، بە تەئکید خودا ناکرێت بە شەفاعەتکار و تکاکار لای هیچ کەس.

**ڕاڤەی وشەکانی فەرمودەکە:**

**(جاء أعرابي):** واتە: دەشتەکی یەک هات.

**(نهكت):** واتە: لاواز بوون.

**(فاستسق لنا ربك):** واتە: جا داوای بارانمان بۆ بکە لای پەروەردگارت.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

قەرعاوی دەفەرمووێت: (فەرموودەكە بەڵگەیە خوا كردنە شەفاعەتكار لای دروستكراوەكان حەرامە، چونكە كردنە شەفاعەتكار بە كەم دانانی گەورەیی و پلە و پایەی خوای تێدایە ئەمەش نەفی تەوحید دەكات)[١].

**سوودەكانی فەرموودەكە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە خوا كردنە شەفاعەتكار لای دروستكراوەكان حەرامە، ئەم فەرموودەیە لاوازە بەڵام ماناكەی ڕاستە، دروست نیە بۆ كەس بڵێت: (نستشفع بالله عليك)[٢].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (وتەی: (فإنا نستشفع بالله عليك)، ئەم وشەیە خراپە و هەڵەیە، چونكە خوای گەورەی كردوەتە شافع لای پێغەمبەر (ﷺ)، وە شافع پلەی نزمترە لە مشفوع عندە، ئەمەش نەقسە بۆ خوای گەورە.

وتەی: (ونستشفع بك على الله)، ئەمەیان هیچ خراپەی تێدا نیە لە ژیانی پێغەمبەر (ﷺ)، وە هیچ خراپەی تێدا نیە دوای مردنیش، ماناكەی داواكردنی دوعایە لە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەوەی دوعایان بۆ بكات تاوەكو باران ببارێت، هەروەها داوای دوعا لە پیاو چاكە زیندووەكان هیچی تێدا نیە)[٣].

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە دروستە داوای باران بارین بكەیت لە كاتی تاخیر بوونی باران، ئەمە سونتەتێكە جێگیر بووە، داوا كردن لە پیاو چاكانی زیندوو و ئامادە بوو بۆ

---

[١] الجديد لاپەڕە (٤٧٠).
[٢] القول المفيد.
[٣] إعانة المستفيد (٤٢٧/٢).

ئەوەی دوعا بۆ موسڵمانان بکەن هیچی تێدا نیە، سەبارەت بە مردوو داوای لێ ناکرێت، نە شەفاعەت و نە دوعا دروست نییە[١].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئینکاری کردنی خراپە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ئینکاری ئەم دەشتەکییەی کرد و بێ دەنگ نەبوو[٢].

**٤-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فێرکردنی نەزان، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ئەم نەزانەی فێرکرد دوای ئەوەی ئینکاری لێکرد و ئاگاداری کردەوە لەسەر ئەو هەڵەیە بۆ ئەوەی خۆی لێ بە دوور بگرێت[٣].

**٥-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر تەسبیح و تەکبیر لێدان لە کاتی ڕوودانی خراپەیەک یان شتێکی سەیر، نەک وەکو چەپڵە لێدان کە داهێنراو و تەقلیدی کافرانە[٤].

---

[١] إعانة المستفيد (٤٢٨/٢).

[٢] إعانة المستفيد (٤٢٨/٢).

[٣] إعانة المستفيد (٤٢٨/٢).

[٤] إعانة المستفيد (٤٢٩/٢).

## باب ما جاء في حماية النبي (ﷺ) حمى التوحيد وسده طرق الشرك

**عن عبد الله بن الشخير رضي الله عنه، قال: انطلقت في وفد بني عامر إلى النبي (ﷺ) فقلنا: أنت سيدنا، فقال: (السيد الله تبارك وتعالى). قلنا: وأفضلنا فضلا، وأعظمنا طولاً؛ فقال: (قولوا بقولكم، أو بعض قولكم، ولا يستجرينكم الشيطان) رواه أبو داود بسند جيد[١].**

**وعن أنس رضي الله عنه، أن ناسا قالوا: يا رسول الله: يا خيرنا وابن خيرنا، وسيدنا وابن سيدنا، فقال: (يا أيها الناس، قولوا بقولكم، أو بعض قولكم، ولا يستهوينكم الشيطان، أنا محمد، عبد الله ورسوله، ما أحب أن ترفعوني فوق منزلتي التي أنزلني الله عز وجل)[٢].**

**فيه مسائل:**

**الأولى:** تحذير الناس من الغلو.

**الثانية:** ما ينبغي أن يقول من قيل له: أنت سيدنا.

**الثالثة:** قوله: (ولا يستجرينكم الشيطان) مع أنهم لم يقولوا إلا الحق.

**الرابعة:** قوله: (ما أحب أن ترفعوني فوق منزلتي).

---

[١] أخرجه أبو داود (٤٨٠٦)، والبخاري في "الأدب المفرد"(ص٨٣ رقم ٢١١).

[٢] رواه النسائي بسند جيد.أخرجه النسائي في "الكبرى" (٧٠/٦ رقم ١٠٠٧٧)، وأحمد (١٥٣/٣ رقم ١٢٥٥١).

# باب ما جاء في حماية النبي (ﷺ) حمى التوحيد وسده طرق الشرك

# باسی (پێغەمبەر (ﷺ) سنوورەکانی تەوحیدی پاراستووە و دەرگا و ڕێگاکانی شیرکیشی داخستووە)

صالح آل الشیخ خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (وتەی کەسێک کە دەڵێت: أنت سیدنا وابن سیدنا، وخیرنا وابن خیرنا، هەروەها وشەی تری هاوشێوەی ئەمانە، ئەم وشانە بەگەورە دانانی تیدایە و نابێت ڕووبەڕووی مرۆڤ بکرێن، پێغەمبەر (ﷺ) سەییدی نەوەی ئادەمە، هەروەک خۆی خەبەری داوە، بەڵام پێی باش نەبووە ئەم وشەیەی ئاڕاستە بکرێت.

پێغەمبەر (ﷺ) سنوورەکانی تەوحیدی پاراستووە و دەرگا و ڕێگاکانی شیرکیشی داخستوە لە ڕووی بیروباوەڕەو و وتە و کردەوەوە، ئەگەر وردبیتەوە لە سوننەتی و ئەوەی دانەری کتاب لە (کتاب التوحید)دا باسیکردووە، هەست دەکەیت پێغەمبەر (ﷺ) دەرگا و ڕێگاکانی بیروباوەڕی پووچ و کردەوەی پووچیشی داخستووە، وەک وتەی: (اشتد غضب الله علی قوم اتخذوا قبور أنبیائهم مساجد)، هەروەها دەرگا و ڕێگای وتەشی داخستووە کە سەر بکێشێت بۆ زیادەڕەوی کردنێکی زەمکراو و فەرموویەتی: (لا تطروني کما أطرت النصاری ابن مریم إنما أنا عبد، فقولوا: عبدالله ورسوله)، هەروەها ئەم بابەش ڕوونکردنەوەی ئەوەیە کە پێغەمبەر سنوورەکانی تەوحیدی پاراستووە و دەرگا و ڕێگاکانی شیرکیشی داخستووە لەو شتانەی کە پەیوەستن بە وتە سەر دەکێشێت بۆ شیرک)[1].

---

[1] التمهید لاپەڕە (٥٤٩).

**عن عبد الله بن الشخير رضي الله عنه، قال: انطلقت في وفد بني عامر إلى النبي (ﷺ) فقلنا: أنت سيدنا، فقال: (السيد الله تبارك وتعالى). قلنا: وأفضلنا فضلا، وأعظمنا طولا؛ فقال: (قولوا بقولكم، أو بعض قولكم، ولا يستجرينكم الشيطان) رواه أبو داود بسند جيد.**

واتە: لە عبد الله بن الشخیردەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: لەگەڵ نوێنەری بەنی عامردا ڕۆیشتین بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوتمان: تۆ گەورە و سەییدی ئێمەیت، ئەویش فەرمووی: (السيد خودایە تبارک و تعالی)، گوتمان: لە هەموومان چاکتری و لە هەمووماں گەورەتریت و بەخشندەتریت، ئەویش فەرمووی: (وتەکانی پێشووترتان بڵێن یا هەندێک وتەی دیکەتان بڵێن، "واتە: بڵێن بەندە و پێغەمبەری خودا" با شەیتان نەتان کات بە نامەبەری خۆی، "یان با کێشتان نەکات بەرەو زیادەڕەوی").

**وعن أنس رضي الله عنه، أن ناسا قالوا: يا رسول الله: يا خيرنا وابن خيرنا، وسيدنا وابن سيدنا، فقال: (يا أيها الناس، قولوا بقولكم، أو بعض قولكم، ولا يستهوينكم الشيطان، أنا محمد، عبد الله ورسوله، ما أحب أن ترفعوني فوق منزلتي التي أنزلني الله عز وجل). رواه النسائي بسند جيد.**

واتە: لە ئەنەس دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: خەڵکانێک گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ئەی لە هەمووماں باشتر، کوڕی باشترینمان و سەیید و گەورەمان و کوڕی سەیید و گەورەمان، ئەویش فەرمووی: (ئەی خەڵکینە قسەکانی پێشترتان بڵێن، ڕێگە مەدەن شەیتان پلە بە پلە گومڕاتان بکات، من محمدم بەندەی خوا و پێغەمبەری ئەوم، پێم خۆش نیە لە پلەی خۆم زیاتر بەرزم بکەنەوە، ئەو پلەیەی کە خوا بۆمی داناوە).

### ڕاڤەی وشەکانی هەردوو فەرموودەکە:

**(انطلقت في وفد بني عامر):** ئەوەی دیار بێت ئەم وەفدەی هاتوونە لای پێغەمبەر لە ساڵی نۆی هیجری بوو، چونکە وەفدەکان زۆر بوون لەو ساڵە، لەبەر ئەوە پێی دەڵێن ساڵی وەفدەکان.

**(تبارك):** واتە: زۆری بەرەکەت و خێر و چاکەکانی، زانایان دەڵێن: ئەم کارە نابێت کەس پێی وەسف بکرێت جگە لە خوای گەورە، لەبەر ئەوە دەڵێن نابێت بڵێیت: تبارك فلان.

**هۆکاری باسکردنی ئەم دوو فەرموودەیە لەم بابە:**

قەرعاوی دەفەرموویت: (فەرموودەکە بەڵگەیە حەرامە زیادەڕەوی بکەیت لە وەسفی پێغەمبەردا (ﷺ) و کەسانی تریش، چونکە ئەمە ڕێگایەکە بۆ گەیاندنی بە شیرک)[1].

**سوودەکانی هەردوو فەرموودەکە:**

**١-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە باش نیە وشەی (سید)، بەکاربهێنیت ئەگەر ترسی زیادەڕەوی کردنی تێدا بێت.

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (ڕاڤەکارانی کتابی تەوحید دەڵێن پێغەمبەر نەهی کردووە لە وتەی (سیدنا)، هەوڵیان داوە جمع بکەن لەنێوان وتەی: (أنا سید ولد آدم)، و وتەی: (قوموا إلى سیدکم)، و وتەی: (ولیقل سیدی ومولاي) بە یەکێک لەم سێ ڕووانە:

یەکەم: نەهی بۆ کەڕاهەت و ئەدەبە، ڕێگەپێدان بۆ دروستی یە.

---

[1] الجدید لاپەڕە (٤٧٣).

دووەم: لەبەر ئەوە نەهی كراوە ترسی ئەوە هەیە مەفسەدەتی لێ بكەوێتەوە، ئەویش ئەوەیە سەر بكێشێت بۆ زیادەڕەوی تێدا كردن، سەبارەت بە ڕێگەپێدانی دروستە ئەگەر هیچ شتی قەدەغەكراو نەبێت.

سێیەم: نەهی یەكە بۆ خطابە، واتە نابێت ڕوو بە ڕوو بڵێیت: تۆ سەییدی منی یان سەییدی ئێمەی، بە پێچەوانەی غائب، چونكە مخاطب هەندێک جار تووشی سەرسام بوون بە نەفس و خۆ بەگەورە دانان دەبێت، پاشان شتێكی تری تێدایە ئەویش ئەوەیە ئەو كەسەی ئەم قسەیە دەكات خۆی زەلیل و كەم دەكات بۆكەسانی تر بە پێچەوانەی ئەوە بۆ كەسانی تر، نموونە: (قوموا إلى سيدكم)، یان كەسەكە ئامادە نیە؛ وەک وتەی بەندە: سەیدم گوتی و وشەی تری وەک ئەمانە، بەڵام ئەمەیان سەبارەت بە ڕێگەپێدانی بەڵگە هاتووە لە پێغەمبەرەوە بە خاوەنی خۆی دەڵێت: سیدی.

ئەوەی دیار بێت ئەسڵەن هیچ پێچەوانەی نیە؛ چونكە پێغەمبەر ﷺ ئیزنی داوە ئەم وتەیە بڵێین، بەڵكو نەهی لەوە كردووە با شەیتان نەتان كات بە نامەبەری خۆی بە زیادەڕەوی تێدا كردن، چونكە (السيد المطلق) خوای گەورەیە، لەسەر ئەمە دروستە بڵێیت: (سيدنا، وسيد بني فلان ونحوه)، بەڵام بە مەرج ئەوەی وشەی سەییدی ئاراستە دەكرێت شایستە بێت، سەبارەت بەوەی ئەگەر فاسق بێت یان زندیق ئەوا نابێت پێی بڵێی سەیید ئەگەر چی لە بەرزترین پلە و جاە بێت، فەرموودە هاتووە: (ولا تقولوا للمنافق سيد، فإنكم إذا قلتم ذالك أغضبتم الله)، ئەگەر شایستە بێت بۆ ئەمە ئەوا هیچ قەدەغە كراوی تێدا نیە و هیچی تێدا نیە، بەڵام ئەگەر ترسی شتیكی قەدەغە كراو هەبوو یان ئەهلی ئەوە نەبوو، دروست نییە، قەدەغە كراو ئەوەیە ترسی زیادەڕەوی كردنی تێیدا هەبێت)[1].

---

[1] القول المفيد (٣/٣٥١-٣٥٣).

صالح آل الشيخ خوا بيپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە وشەی (السيد) بۆ مرۆڤ مەکروهە، وە ڕووبەڕوو گوتن بەرامبەر کەسەکە دەبێت نەگوترێ و دابخرێت، ڕووبەڕوو بە کەس نەڵێی: (أنت سيدنا)، بەشێوەی کۆ، چونکە ئەمە جۆرێک لە بەگەورە دانانی تێدایە لە ڕووی کەسی بەرامبەر ڕاستەوخۆ، ڕووی دووەم بەکارهێنانی ئەو وشەیە، پێغەمبەر سەییدە هەروەک خۆی دەفەرموویێت: (أنا سيد ولد آدم يوم القيامة)، بەڵام لەگەڵ ئەوەش ڕووبەڕوو پێ گوتنی پێ باش نەبووە و ڕێگری کردووە، بۆ ئەوەی سەر نەکێشێت بۆ شتی گەورەتر لە بەگەورە دانان و زیادەڕەوی تێداکردن)[١].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نەهی کراوە لە وەسف کردنی پێغەمبەر (ﷺ) بە (السيد)، کێشە هەیە لای ئەهلی علم ئینکاری دەکەن بە کەسێک بڵێت: (أنت سيدنا)، وە دەفەرموویێت: (السيد الله).

فەرموودەی تر هاتوون بەڵگەن دروستە وشەی (سيد) بەکاربهێنیت، لەوانە:

١- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (أنا سيد ولد آدم ولا فخر).

٢- سەبارەت بە حەسەنی کوڕی عەلی دەفەرموویێت: (إن ابني هذا سيد، وسيصلح الله به بين طائفتين عظيمتين من المسلمين).

٣- هەروەها دەفەرموویێت: (الحسن و الحسين سيدا شباب أهل الجنة).

٤- کاتێک سعد بن معاذ خوا لێی ڕازی بێت هات لە ساڵی خەندەق، پێغەمبەر (ﷺ) بە ئەنسارییەکانی فەرمووی: (قوموا لسيدكم).

جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان بۆ وەڵامی ئەم فەرموودانە سێ وتە هەیە:

---

[١] التمهيد لاپەڕە (٥٥٠).

وتەی یەکەم: حەڕامە وشەی السید بەکاربهێنرێت بۆ دروستکراو، نابێت السید بۆ کەس بەکاربهێنرێت مەگەر بۆ خوا بەکاربهێنرێت، هەروەک لەم دوو فەرموودەیە باسکراوە: (السید الله)، ئەمە نقل کراوە لە ئیمام مالک ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

وەڵام بۆ فەرموودەکان دەڵێن فەرموودەکان پێش تر بوون و فەرموودەی: (السید الله) تاخیر ترە، چونکە لە ساڵی وەفد بوو ساڵی نۆی هیجری، کەواتە نەسخی ئەو فەرموودانەی کردووە کە بەڵگەن لەسەر دروستی وتەی السید بۆ دروستکراوەکان.

وتەی دووەم: دروستە وشەی (السید) بۆ دروستکراو بەکاربهێنیت، بەڵگە کار بەم فەرموودانە دەکەن: (أنا سید ولد آدم)، (إن ابني هذا سید)، (قوموا إلی سیدکم)، دروستە وتەی سید بۆ دروستکراوەکان بەکاربهێنیت.

وتەی سێیەم: دروستە بێ کەڕاهەت، ئیلا ئەگەر ترسی زیادە ڕەوی تێدا کردنی هەبێت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ترساوە لێیان لە زیادەڕەوی کردن، هەروەک لە هەردوو فەرموودەکە باسکراوە، ئەگەر ترسی زیادەڕەوی کردن هەبوو ئەوا نەهی لێی دەکرێت، بەڵام ئەگەر ترسی زیادەڕەوی نەبوو هیچی تێدا نییە وەک کردەوە کردن بە فەرموودەکانی تر کە دروستە وتەی سید بەکاربهێنیت.

وتەی چوارەمیش هەیە ئەویش ئەوەیە وتەی سید دروست نیە ڕووبەڕووی کەسەکە بیڵێیت، وە دروستە بیڵێیت ئەگەر کەسەکە ئامادە نەبوو واتە غائب بوو، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ئینکاری کرد لەوەی ڕووبەروو ئاڕاستەی کرا، ڕێگری دەکرێت ڕووبەرووی مرۆڤ بڵێیت: (أنت السید)، (أنت سیدنا)، یان ئەگەر ترسی ئەوەی هەبوو سەرسام بێت بە نەفسی خۆی، هەروەک فەرموودە هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کردووە لە مەدح کردنی مرۆڤێک کەسەکە خۆی ئامادە بێت.

به هەر حاڵ چەندین وتە هەیە سەبارەت بەم بابەتە.

ئاگاداری: ئێستا وتەی: (السید)، بەکاردێت بۆ کەسێک باوەڕی وایە سوود و زیانی بە دەستە، پێیان دەڵێن السادة من أهل البیت یان السادة من الصوفیة، ئەم بیروباوەڕە و وتەش لەگەڵی، گومانی تیدا نییە ئەمەیان حەڕامە)[١].

پوختەی وتەی زانایان:

- نابێت وشەی سید بۆ کەسی خراپ و دووڕوو بەکاربهێنیت.

- بەکارهێنانی وشەی سید بۆ کەسێک باوەڕی وایە سوود و زیانی بە دەستە، گومانی تێدا نیە حەڕامە.

- نابێت وشەی سید بەرامبەر کەسێک بەکاربهێنێت ئەگەر ترسی فیتنەی هەبوو.

**٢-** ئەم دوو فەرموودەیە بەڵگەن بۆ ئاگادارکردنەوەی خەڵک لە زیادەڕەوی کردن[٢].

**٣-** ئەم دوو فەرموودەیە بەڵگەن بۆ کەراهەتی مەدح کردن و خۆ پاراستن لێی[٣].

**٤-** ئەم دوو فەرموودەیە بەڵگەن بۆ گەورەیی قەدری پێغەمبەر (ﷺ) لە نەفسی هاوەڵان و ڕێزگرتنیان[٤].

---

[١] إعانة المستفید (٢/٤٣٧-٤٣٩).

[٢] الجامع الفرید لاپەڕە (٢٢٧).

[٣] الجامع الفرید لاپەڕە (٢٢٧).

[٤] الجدید لاپەڕە (٤٧٣).

**٥-** ئەم دوو فەرموودەیە بەڵگەن پێغەمبەر (ﷺ) لایەنی تەوحیدی پاراستووە و هەموو ئەو ڕێگایانەی داخستووە کە مرۆڤ ڕادەکێشێت بەرەو شیرک.

## باب ما جاء في قول الله تعالى:
## ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾

**عن ابن مسعود رضي الله عنه قال: جاء حبر من الأحبار إلى رسول الله (ﷺ) فقال: يا محمد! إنا نجد أن الله يجعل السماوات على إصبع، والأرضين على إصبع، والشجر على إصبع، والماء على إصبع، والثرى على إصبع، وسائر الخلق على إصبع، فيقول: أنا الملك. فضحك النبي (ﷺ) حتى بدت نواجذه، تصديقاً لقول الحبر، ثم قرأ رسول الله (ﷺ):** ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾[١].

**وفي رواية لمسلم: (والجبال والشجر على إصبع، ثم يهزهن فيقول: أنا الملك، أنا الله)[٢].**

**وفي رواية للبخاري: (يجعل السماوات على إصبع، والماء والثرى على إصبع، وسائر الخلق على إصبع) أخرجاه[٣].**

**ولمسلم عن ابن عمر مرفوعا: (يطوي الله السماوات يوم القيامة، ثم يأخذهن بيده اليمنى، ثم يقول: أنا الملك، أين الجبارون؟ أين المتكبرون؟ ثم يطوي الأرضين السبع ثم يأخذهن بشماله، ثم يقول: أنا الملك، أين الجبارون؟ أين المتكبرون[٤].**

---

[١] متفق عليه: أخرجه البخاري (٤٨١١)، ومسلم (٢٧٨٦).

[٢] أخرجه مسلم (٢٧٨٦).

[٣] أخرجه البخاري (٤٨١١).

[٤] أخرجه مسلم (٢٧٨٨).

**وروي عن ابن عباس، قال: (ما السماوات السبع والأرضون السبع في كف الرحمن إلا كخردلة في يد أحدكم)[١].**

**وقال ابن جرير: حدثني يونس، أنبأنا ابن وهب، قال: قال ابن زيد: حدثني أبي، قال: قال رسول الله (ﷺ): (ما السماوات السبع في الكرسي إلا كدراهم سبعة ألقيت في ترس)[٢].**

**قال: وقال أبو ذر رضي الله عنه: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (ما الكرسي في العرش إلا كحلقة من حديد ألقيت بين ظهري فلاة من الأرض)[٣].**

**وعن ابن مسعود قال: (بين السماء الدنيا والتي تليها خمسمائة عام، وبين كل سماء خمسمائة عام، وبين السماء السابعة والكرسي خمسمائة عام، وبين الكرسي والماء خمسمائة عام، والعرش فوق الماء، والله فوق العرش، لا يخفى عليه شيء من أعمالكم). أخرجه ابن مهدي عن حماد بن سلمه عن عاصم عن زر عن عبدالله[٤].**

**ورواه بنحوه عن المسعودي عن عاصم، عن أبي وائل، عن عبد الله[٥].**

**قاله الحافظ الذهبي رحمه الله تعالى، قال: وله طرق[٦].**

---

[١] أخرجه ابن جرير في "التفسير"(٢٥/٢٤)، وعبدالله بن أحمد في "السنة" (٤٧٦/٢ رقم ١٠٩٠).

[٢] أخرجه ابن جرير في "التفسير"(١٠/٣)، وأبو الشيخ في "العظمة"(٥٨٧/٢ رقم ٣١).

[٣] أخرجه ابن جرير في "التفسير"(١٠/٣)، وأبو الشيخ في "العظمة"(٦٣٥/٢ رقم ٦٣).

[٤] أخرج هذا الطريق البيهقي في "الأسماء والصفات" (٣٩٣/٢).

[٥] أخرجه ابن خزيمة في "التوحيد"(٨٨٥/٢ رقم ٥٩٤)، وأبو الشيخ في "العظمة"(٥٦٥/٢ رقم ٢٠٣).

[٦] في (العلوا) (ص ٤٥).

**وعن العباس بن عبد المطلب رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (هل تدرون كم بين السماء والأرض؟) قلنا: الله ورسوله أعلم قال: (بينهما مسيرة خمسمائة سنة، ومن كل سماء إلى سماء مسيرة خمسمائة سنة وكثف كل سماء خمسمائة سنة، وبين السماء السابعة والعرش بحر بين أسفله وأعلاه كما بين السماء والأرض، والله سبحانه وتعالى فوق ذلك، وليس يخفى عليه شيء من أعمال بني آدم). أخرجه أبو داود وغيره[1].**

**فيه مسائل:**

**الأولى: تفسير قوله:** ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾.

**الثانية:** أن هذه العلوم وأمثالها باقية عند اليهود الذين في زمنه (ﷺ) لم ينكروها ولم يتأولوها.

**الثالثة:** أن الحبر لما ذكر للنبي (ﷺ)، صدقه، ونزل القرآن بتقرير ذلك.

**الرابعة:** وقوع الضحك من رسول الله (ﷺ)، لما ذكر الحبر هذا العلم العظيم.

**الخامسة:** التصريح بذكر اليدين، وأن السماوات في اليد اليمنى، والأرضين في الأخرى.

**السادسة:** التصريح بتسميتها الشمال.

**السابعة:** ذكر الجبارين والمتكبرين عند ذلك.

**الثامنة:** قوله: (كخردلة في كف أحدكم).

---

[1] أخرجه أبو داود (٤٧٢٣)، والترمذي (٣٣٢٠)، وأحمد (٢٠٦/١ رقم ق٧٧٠).

**التاسعة:** عظم الكرسي بالنسبة إلى السماوات.

**العاشرة:** عظم العرش بالنسبة إلى الكرسي.

**الحادية عشرة:** أن العرش غير الكرسي والماء.

**الثانية عشر:** كم بين كل سماء إلى سماء.

**الثالثة عشر:** كم بين السماء السابعة والكرسي.

**الرابعة عشر:** كم بين الكرسي والماء.

**الخامسة عشر:** أن العرش فوق الماء.

**السادسة عشرة:** أن الله فوق العرش.

**السابعة عشر:** كم بين السماء والأرض.

**الثامنة عشر:** كثف كل سماء خمسمائة عام.

**التاسعة عشر:** أن البحر الذي فوق السماوات بين أعلاه وأسفله مسيرة خمسمائة سنة.

## باب ما جاء في قول الله تعالى:
## ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾

باسکردنی وتەی خوای گەورە کە دەفەرموویت: (خوانەناسان؛ قەدری خوایان وەک پێوست نەگرت، ڕێزیان بۆ دانەنا، هەر هەموو گۆی زەوی مشتێکی ئەو زاتەیە لە ڕۆژی قیامەتدا، ئاسمانەکانیش بەدەستی ڕاست و دروستی خوا پێچراوەن "ئاماژەیە بۆ دەسەڵاتی بێ سنوری ئەو زاتە"، پاکی و بێگەردی و بڵندی بۆ ئەو پەروەردگارە مەزنەی شایستەی ئەوە نی یە نەفامان هاوەڵی بۆ بڕیار بدەن و قەدری نەزانن).

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (دانەری کتاب بەم بابە کۆتایی هێنا بە کتابی تەوحید، چونکە ئەم بابە ناو و سیفەت لەخۆ دەگرێت، چونکە کتابی تەوحید هەمووی بە دەوری تەوحیدی بەندایەتی کردن دا دەسوڕێتەوە، وە باسی تەواوکەرەکانی تەوحید دەکات وە باسی ئەو شتانەی تەوحید کەم دەکەن و داواکارییەکانی تەوحید دەکات، لەم بابە باسی ناو و سیفەتی کردووە بۆ ئەوەی کتابەکە تەواو بێت هەموو جۆرەکانی تەوحیدی تێدا بێت، چونکە تەوحیدی بەندایەتی تەوحیدی پەروەردگاریەتیش لەخۆ دەگرێتەوە، لە تەوحیدی پەروەردگاریەتیش ئەوەیە ئیمانت بە ناو و سیفەتی خوای گەورە هەبێت، بەڵام ناو وسیفەت بە شێوەیەکی تایبەت باس دەکرێن لەبەر بوونی ئەوانەی پێچەوانەی مەزهەبی ئەهلی سونەن، لەوانە جەهمی و موعتەزیلە و ئەشاعرە و ئەوانەی شوێن ئەوان کەوتوون، پێشەوایان بە توندی ئینکاری مەزهەبیان کردووە، وە زۆر کتابیان نووسیوە و وەڵامیانی داوەتەوە، چونکە ئەم مەزهەبانە نەفی ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە دەکەن، وە ئیلحادە لە ناو و سیفەتەکانی خوا، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٨٠﴾ [الأعراف: ١٨٠]

خوای گەورە ناو وسیفەتی بۆ خۆی جێگیر کردووە، بینین و بیستن و توانا و ژیان و زانست و ڕوخسار و دوو دەستی بۆ خۆی جێگیرکردووە، سیفەتی کمالی بۆ خۆی جێگیرکردووە، هەر کەسێک نەفی ئەمانە بکات ئەوە لایداوە لە ناوەکانی خوای گەورە،

لەو کەسانەیە کە خوای گەورە سەبارەت بەوان دەفەرموویت: ﴿وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ﴾ [الأعراف: ١٨٠]، واتە: وازیان لێ بێنە و ئاوڕ لە وتەیان مەدەوە، چونکە سەرپێچی کتابی خوا و سوننەتی پێغەمبەری خوایان کردووە)[١].

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویت: (ئەم بابەی کۆتایی هەرسێ جۆرەکانی تەوحیدی کۆ کردۆتەوە)[٢].

## ڕاڤەی وشەکانی ئایەتەکە:

﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ﴾: واتە: قەدری خوایان وەک پێوسیت نەگرت و بەگەورەیان دانەنا.

## هۆکاری باسکردنی ئەم ئایەتە لەم بابە:

عبدالله بن جار الله دەفەرموویت: ( ئایەتەکە بەڵگەیە شەریک بۆ خوا بڕیاردان نەفی تەوحید و بەگەورە دانان و ئیمان دەکات)[٣].

## سوودەکانی ئایەتەکە:

**١-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ گەورەی خوا[٤].

**٢-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە شەریک دانان بۆ خوای گەورە نەفی بەگەورە دانانی خوا دەکات.

---

[١] إعانة المستفيد (٢/٤٤١-٤٤٢).

[٢] التعليق المفيد لاپەڕە (٢٨١).

[٣] الجامع الفريد لاپەڕە (٢٢٨).

[٤] تفسير سورة الزمر لاپەڕە (٤٥٤).

**٣-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ جوانی فێرکردنی قورئان، چونکە کاتێک باسی ئەوەی کرد ئەوان قەدری خوایان وەک پێویست نەگرت، ڕێزیان بۆ دانەنا، ئەوەی ڕوونکردەوە کە خوای گەورە لە هەموو شتێک گەورەترە[١].

**٤-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی دەست بۆ خوای گەورە[٢].

**٥-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە هەموو گۆی زەوی مشتێکی خوای گەورەیە لە ڕۆژی قیامەتدا[٣].

**٦-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ بەرزی خوای گەورە[٤].

**٧-** ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ بە پاک ڕاگرتنی خوای گەورە لە هەموو عەیب و کەمی یەک[٥].

---

[١] تفسیر سورة الزمر لاپەڕە (٤٥٤).

[٢] تفسیر سورة الزمر لاپەڕە (٤٥٤).

[٣] تفسیر سورة الزمر لاپەڕە (٤٥٤).

[٤] تفسیر سورة الزمر لاپەڕە (٤٥٥).

[٥] تفسیر سورة الزمر لاپەڕە (٤٥٥).

**عن ابن مسعود رضي الله عنه قال: جاء حبر من الأحبار إلى رسول الله (ﷺ) فقال: يا محمد! إنا نجد أن الله يجعل السماوات على إصبع، والأرضين على إصبع، والشجر على إصبع، والماء على إصبع، والثرى على إصبع، وسائر الخلق على إصبع، فيقول: أنا الملك. فضحك النبي (ﷺ) حتى بدت نواجذه، تصديقا لقول الحبر، ثم قرأ رسول الله (ﷺ):** ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾.

واته: له ابن مسعود دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: زانایەکی جولەکە هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: ئەی محمد لای ئێمە لە تەوڕاتدا ئەوە هەیە کە خودا ئاسمانەکان لەسەر پەنجەیەک دادەنێت، زەمینەکان لەسەر پەنجەیەک، دارودرەخت لەسەر پەنجەیەک، ئاو لەسەر پەنجەیەک، ئینجا دەڵێت: (تەنها خۆم مەلیکم).

پێغەمبەریش (ﷺ) لێرەدا دەستی کرد بە پێکەنین هەتا خرێکانی دەرکەوتن، ئەو پێکەنینەش بۆ ئەوە بوو کە بیسەلمێنێ کە وتەی زانا جولەکەکە ڕاستە، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾.

**وفي رواية لمسلم: (والجبال والشجر على إصبع، ثم يهزهن فيقول: أنا الملك، أنا الله).**

واته: لە ڕیوایەتەکەی موسلیمدا دەڵێت: شاخەکان و دار و درەختەکان لەسەر پەنجەیەک دادەنێت، پاشان ڕایان دەوەشێنێ، ئینجا دەڵێت: (من خۆم مەلیکم من الله م).

**وفي رواية للبخاري: (يجعل السماوات على إصبع، والماء والثرى على إصبع، وسائر الخلق على إصبع) أخرجاه.**

واتە: لە ڕیوایەتەکەی بوخاریدا دەڵێت: ئاسمانەکان لەسەر پەنجەیەک دادەنێت، ئاو و خاک لەسەر پەنجەیەک دادەنێت، هەموو مەخلوقاتەکانی دیکەش لەسەر پەنجەیەک دادەنێت.

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(الحبر):** زانایەکە زانستی زۆری لە لایە.

**(إنا نجد):** مەبەست پێی تەوراتە.

**(أصبع):** واتە: پەنجە.

**(حتى بدت نواجذه):** واتە: هەتا ددانەکانی بەدیارکەوتن.

**(الثرى):** واتە: خۆڵ.

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەی باسکردووە بۆ ئەوەی گەورەیی خوا ڕوون بکاتەوە بەوەی نابێت شەریکی بۆ بڕیار بدەیت.

**سوودەکانی فەرموودەکە:**

**١-** زانایان دەڵێن خوای گەورە پەنجەی هەیە سیفەتێکی زاتی خەبەری یە، بەڵگە:

(١) عن عبد الله بن عمرو بن العاص رضي الله عنهما؛ أنه سمع رسول الله (ﷺ) يقول: (إن قلوب بني آدم كلها بين إصبعين من أصابع الرحمن)[١].

(٢) عن عبد الله بن مسعود رضي الله عنه؛ قال: (جاء رجل إلى النبي (ﷺ) من أهل الكتاب، فقال: يا أبا القاسم! إن الله يمسك السماوات على إصبع، والأرضين على إصبع... إلى أن قال: فرأيت النبي (ﷺ) ضحك حتى بدت نواجذه، ثم قرأ: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾[٢].

ابن خزيمة ڕەحمەتی خوای لێ بێت بابێکی داناوە بۆ جێگیرکردنی پەنجە بۆ خوای گەورە، دەفەرموویێت: (باب جێگیر کردنی پەنجە بۆ خوای گەورە)[٣].

ئەبو بەکر ئاجری ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (باب باسکردنی ئیمان هێنان بەوە کە دڵی دروستکراوەکان لەنێوان هەردوو پەنجەکانی خوای گەورە دایە، بێ چۆنیەتی)[٤].

بەغەوی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (پەنجە باسکراوە لە فەرموودە سیفەتێکە لە سیفەتەکانی خوای گەورە)[٥].

---

[١] رواه مسلم (٢٦٥٤).
[٢] رواه البخاري (٧٤١٥)، ومسلم (٢٧٨٦).
[٣] التوحيد (١/١٨٧).
[٤] الشريعة لاپەڕە (٣١٦).
[٥] شرح السنة (١/١٦٨).

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (جێگیر کردنی پەنجە بۆ خوای گەورە لەبەر دان پێدانانی پێغەمبەر (ﷺ) بە قسەی ئەم جولەکەیە)[١].

سەبارەت بە ژمارەی پەنجەکان ئەهلی سونە پەنجە جێگیر دەکەن بێ ژمارە، گومانی تێدا نییە باسی دوو پەنجە کراوە، وە هەندێک دەڵێن بێگومان لە دوو پەنجە زیاترن، چونکە فەرموودەکە دەفەرمووێت: (دڵەکانی نەوەی ئادەم هەموویان لەنێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی ڕەحمان دایە)، بەڵام سەبارەت بە دیارکردنی ژمارەی پەنجەکان بە پێنج یان شەش باشتر وایە بوەستیت، والله أعلم.

ڕاستە ئەم فەرموودەیە باسی کردووە بەڵام ئەوەی ڕاست مەبەست پێی جنسی پەنجەیە نەک ژمارەی پەنجەکان، والله أعلم.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی خوا و تەواوی توانای[٢].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیر کردنی قسە بۆ خوای گەورە[٣].

---

[١] القول المفيد (٣/٣٦٥-٣٧٢).

[٢] شرح كتاب التوحيد لاپەڕە ٧٦٩، عبدالله بن حميد.

[٣] شرح كتاب التوحيد لاپەڕە ٧٦٩، عبدالله بن حميد.

**ولمسلم عن ابن عمر مرفوعا: (يطوي الله السماوات يوم القيامة، ثم يأخذهن بيده اليمنى، ثم يقول: أنا الملك، أين الجبارون؟ أين المتكبرون؟ ثم يطوي الأرضين السبع ثم يأخذهن بشماله، ثم يقول: أنا الملك، أين الجبارون؟ أين المتكبرون.**

واتە: لە ڕیوایەتێکی دیکەی موسلیمدا بەم جۆرەیە لە ابن عمر دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خوا هەموو ئاسمانەکان لە ڕۆژی قیامەتدا دەپێچێتەوە، پاشان بە دەستی ڕاستی دەیانگرێت، پاشان دەڵێت: من خۆم پادشام، ستەمکاران لە کوێن، ئەوانە لە کوێن کە خۆیان بەگەورە دەزانی؟ پاشان خوای گەورە هەر حەوت زەوی یەکان لە ڕۆژی قیامەتدا دەپێچێتەوە، پاشان بە دەستی چەپ دەیانگرێت، پاشان دەڵێت: من خۆم پادشام، ستەمکاران لە کوێن، ئەوانە لە کوێن کە خۆیان بەگەورە دەزانی؟

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکە:**

**(يطوي الله السموات يوم القيامة):** واتە: خوا هەموو ئاسمانەکان لە ڕۆژی قیامەتدا دەپێچێتەوە.

**(أنا الملك، أين الجبارون؟ أين المتكبرون):** واتە: من خۆم پادشام، ستەمکاران لە کوێن، ئەوانە لە کوێن کە خۆیان بەگەورە دەزانی؟

**هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودەیە لەم بابە:**

قەرعاوی دەفەرموویێت: (فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر واجبی بەگەورە دانانی خوای گەورە، وە بە گەورە دانانی خوای گەورە یەکخواپەرستی یە و شەریک بۆ بڕیار نەدانە)[1].

## سوودەکانی فەرموودەکە:

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە خوای گەورە دوو دەستی هەیە ڕاست و چەپ، جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بە ڕاست و چەپ دوو وتە هەیە:

یەکەم: هەندێک زانا بۆ ئەوە چوون خوای گەورە دەستی چەپی هەیە، کە ئەمە وتەی عثمان بن سعيد الدارمي، وأبو يعلى الفراء، ومحمد بن عبد الوهاب و ابن باز و ابن عثيمين و صالح الفوزانە، بەڵگە:

١- عبد الله بن عمر رضي الله عنه مرفوعا: (يطوي الله عز وجل السماوات يوم القيامة، ثم يأخذهن بيده اليمنى، ثم يقول: أنا الملك! أين الجبارون؟ أين المتكبرون؟ ثم يطوي الأرضين بشماله ثم يقول)[2].

٢- وەسف کردنی یەکێک لە دەستەکان بە ڕاست داوای ئەوە دەکات دەستەکەی تر ڕاست نییە چەپە، ڕیوایەت هاتووە دەفەرموویێت: (بيده الأخرى)، واتە دەستەکەی تر ڕاست نییە چەپە.

دووەم: هەندێک زانای تر بۆ ئەوە چوون هەردوو دەستەکانی ڕاستن چەپی نییە، کە ئەمە وتەی ابن خزيمە و ئیمام ئەحمەد و بەیهەقی و ئەلبانی یە، بەڵگە:

---

[1] الجديد لاپەڕە (٤٨٠).

[2] رواه مسلم (٢٧٨٨).

١- عن عبد الله بن عمرو بن العاص رضي الله عنهما مرفوعا: (إن المقسطين عند الله على منابر من نور عن يمين الرحمن عز وجل، وكلتا يديه يمين)[١].

٢- عن عبد الله بن عمر بن الخطاب رضي الله عنهما مرفوعا: (أول ما خلق الله تعالى القلم، فأخذه بيمينه، وكلتا يديه يمين ...)[٢].

٣- جێگیرکردنی چەپ بۆ خوای گەورە دەلالەت لەسەر نەقس دەکات بۆ حەقی خوای گەورە، چونکە چەپ لاوازترە لە ڕاست و کەمتر شەڕەفی هەیە، ئەمەش بۆ حەقی خوای گەورە ناگونجێت.

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: ( هەموو فەرموودەکان ڕاستن لای زانایانی ئەهلی سوننە، وە فەرموودەی ابن عمر مەرفوعە و صحیحە، فەرموودەکە مەوقوف نییە، وە دژی نییە لەنێوان فەرموودەکان سوپاس بۆ خوا، خوای گەورە وەسفی هەردوو دەستی کردووە بە ڕاست و چەپ لە ڕووی ناوەوە، هەروەک فەرموودەی ابن عمر هاتووە هەردوو دەستەکان ڕاست مبارەکن لەڕووی شەڕەف و فەزل، هەروەک فەرموودەی صحیحی تر هاتووە)[٣].

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (وتەی: (ثم يأخذهن بشماله)، وشەی: (شمال)، جیاوازی هەیە لەنێوان ڕاویەکان، هەندێکیان جێگیری دەکەن، وە هەندێکی تر

---

[١] رواه مسلم (١٨٢٧).

[٢] رواه ابن أبي عاصم في (السنة) (١٠٦)، والآجري في (الشريعة)، وصححه الألباني.

[٣] مجموع فتاوى الشيخ ابن باز (٢٥/١٢٦).

جێگیری ناکەن، ئەوانەی جێگیریان کردووە حوکمی شازیان بەسەرداوە، چونکە پێچەوانەی دوو متمانەی کردووە لە ڕیوایەتی ابن عمر.

هەندێکی تر دەڵێن: جێگای متمانەیە، بەڵام ڕاوی ئەمەی گوتووە لە تصرفی خۆی. ئەسلی ئەمە هەڵەیە ئەوەی جێگیر بووە لە صحیح مسلم: (أن الرسول (ﷺ) قال: "المقسطون على منابر من نور على يمين الرحمن ، وكلتا يديه يمين)، ئەمە داوای ئەوە دەکات دەستی ڕاست و چەپی نییە بەڵکو تەنها ڕاستی هەیە.

بەڵام ئەگەر چی وشەی: (شمال) محفوظه، ئەمە لای من کێشە نییە و نەفی ئەوە ناکات: (كلتا يديه يمين)، چونکە ماناکەی دەستی تر وەک دەستی چەپ نییە بە نسبەت دروستکراوەکان ناقسە بەرامبەر دەستی ڕاست، دەفەرمووێت: (كلتا يديه يمين)، واتە: نەقسی تێدا نییە، پاڵ پشتی بۆ ئەمە فەرموودەی تر هاتووە: (اخترت يمين ربي وكلتا يديه يمين مباركة)، ...)[1].

کەواتە هۆکاری جیاوازییەکە بۆ دوو شت دەگەڕێتەوە:

یەکەم: جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بە زیادەی: (شمال)، هەندێک زانا بۆ ئەوە چوون لاوازە، وە هەندێکی تر بۆ ئەوە چوون صحیحه.

دووەم: جێگیرکردنی چەپ بۆ خوای گەورە دەلالەت لەسەر نەقس دەکات بۆ حەقی خوای گەورە، چونکە چەپ لاوازترە لە ڕاست و کەمتر شەرەفی هەیە، ئەمەش بۆ حەقی خوای گەورە ناگونجێت، بەڵام ئەوانی تر دەڵێن خوای گەورە لەناو و سیفەت دا وەک دروستکراوەکان نییە، سەبارەت بە مرۆڤ چەپ نەقسە بەڵام بۆ خوای گەورە وا نییە.

---

[1] القول المفيد (٣/٣٧٥-٣٧٦).

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەلگەیە بۆ گەورەی خوا.

عبدالله بن حمید ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەی خوای گەورە، هەموو دروستکراوەکان بە دەستی خوایە و لەژێر دەستی خوایە)[1].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە زەویش حەوت چینە هەروەک چۆن ئاسمانیش حەوت چینە.

---

[1] شرح كتاب التوحيد لاپەڕە (٧٧٠).

**وروي عن ابن عباس، قال: (ما السماوات السبع والأرضون السبع في كف الرحمن إلا كخردلة في يد أحدكم).**

واته: له ابن عباس خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: (حەوت ئاسمانەکان و حەوت زەمینەکان لە نێو لەپی خودای ڕەحماندا هیچ نییە تەنها وەک ئەوە وایە یەکێکتان دەنکە خەردەلەیەک بکاتە دەستیەوە).

**وقال ابن جرير: حدثني يونس، أنبأنا ابن وهب، قال: قال ابن زيد: حدثني أبي، قال: قال رسول الله (ﷺ): (ما السماوات السبع في الكرسي إلا كدراهم سبعة ألقيت في ترس)**

واته: ابن جرير دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (هەر حەوت و ئاسمانەکان لە بەرامبەر کورسیەکەدا وەک ئەوەیە حەوت درهەم بخرێتە ناو قەڵغانێکەوە).

**قال: وقال أبو ذر رضي الله عنه: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول:(ما الكرسي في العرش إلا كحلقة من حديد ألقيت بين ظهري فلاة من الأرض).**

واته: ئەبوزەڕ رضی الله عنه دەفەرمووێت: گوێبیستی پێغەمبەر بووم (ﷺ) دەیفەرموو: (کورسیەکە لە بەرامبەر عەرشی خوا دا تەنها وەک حەلقەیەکی ئاسن وایە، کە لە بیابانێکی سەر زەمیندا فڕێ درابێت).

**ڕاڤەی وشەکانی فەرموودەکان:**

**(ترس):** واتە: قەڵغان.

**(فلاة):** واتە: بیابان.

## هۆکاری باسکردنی ئەم فەرموودانە لەم بابە:

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودانەی باسکردووە بۆ ئەوەی گەورەیی خوا ڕوون بکاتەوە و نابێت شەریکی بۆ بڕیار بدەیت.

## سوودەکانی فەرموودەکان:

**١-** فەرموودەی ابن عباس بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی کف بۆ خوای گەورە.

**٢-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی عەرش بۆ خوای گەورە، دروستکراوێکە لە دروستکراوەکانی خوای گەورە، وە گەورەترە لە کورسی، وە کورسیش گەورەترە لە ئاسمانەکان، ئەمە بەڵگەیە لەسەر گەورەی خوا لەبەر ئەم دروستکراوە گەورانە، وە وەڵامە بۆ ئەوانەی عەرش تەفسیر دەکەن بە مولک یان تەفسیری تری پوچ[١].

**٣-** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ جێگیرکردنی کورسی، زانایان دەڵێن چەندین بەڵگەی ڕوون ئاشکرا هاتوون بۆ جێگیرکردنی کورسی.

محمد عبدالرحمن الخميس خوا بیپارێزێت دەفەرموویت: (مەزهەبی ئەهلی سونە سەبارەت بە کورسی، وە مەزهەبی ئەوانەی پێچەوانەی ئەهلی سونەن:

أ- ئەهلی سونە و جەماعە بۆ ئەوە چوون کورسی شوێنی هەردوو قاچی خوای گەورەیە، ئەمە وتەی ڕاست بۆ جێگیر بوونی بەڵگە: خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ [البقرة: ٢٥٥].

---

[١] إعانة المستفيد (٢/٤٤٥).

ب- هەندێک خەڵک دەڵێن: کورسی عەرشە، ئەمە ڕاست نییە، چونکە بەڵگە هاتوون کورسی لەسەر عەرشە، هەروەک پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (ما الكرسي بين يدي العرش إلا كحلقة من حديد).

ج- وتراوە: کورسی زانستی خوای گەورەیە، کە ئەمە وتەی متکلمینە، لەبەر ئەوە نەفی کورسی دەکەن مەبەستیان نەفی کردنی بەرزی خوایە)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرموویێت: (ئەمە بەڵگەیە بۆ بوونی کورسی، دروستکراوێکە گەورەترە لە ئاسمانەکان، ئەمە وەڵامە بۆ ئەوانەی کورسی تەفسیر دەکەن بە زانست، ئەوەی ڕاست بێت کورسی زانست نییە)[2].

---

[1] توضيحات الجلية على شرح العقيدة الطحاوية (٢ /٦٦٤-٦٦٥).

[2] إعانة المستفيد (٤٦٣/٢).

**وعن ابن مسعود قال: (بين السماء الدنيا والتي تليها خمسمائة عام، وبين كل سماء خمسمائة عام، وبين السماء السابعة والكرسي خمسمائة عام، وبين الكرسي والماء خمسمائة عام، والعرش فوق الماء، والله فوق العرش، لا يخفى عليه شيء من أعمالكم). أخرجه ابن مهدي عن حماد بن سلمه عن عاصم عن زر عن عبدالله.**

**ورواه بنحوه عن المسعودي عن عاصم، عن أبي وائل، عن عبد الله.**

**قاله الحافظ الذهبي رحمه الله تعالى، قال: وله طرق.**

واته: له ابن مسعود دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموویێت: (بەینی ئاسمانی دونیا و ئەوەی دواتر (٥٠٠) ساڵە، وە بەینی سەرو و خواری هەر ئاسمانێک (٥٠٠) ساڵە، نێوانی ئاسمانی حەوتەم و کورسیەکە (٥٠٠) ساڵە، بەینی کورسیەکە و ئاو (٥٠٠) ساڵە وە عەرش لە سەروو ئاوە، خوداش لە سەروو عەرشەوەیە، هیچ شتێ لە کردەوەکانی ئێوەی لێ ون نابێت).

**وعن العباس بن عبد المطلب رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (هل تدرون كم بين السماء والأرض؟) قلنا: الله ورسوله أعلم قال: (بينهما مسيرة خمسمائة سنة، ومن كل سماء إلى سماء مسيرة خمسمائة سنة وكثف كل سماء خمسمائة سنة، وبين السماء السابعة والعرش بحر بين أسفله وأعلاه كما بين السماء والأرض، والله سبحانه وتعالى فوق ذلك، وليس يخفى عليه شيء من أعمال بني آدم). أخرجه أبو داود وغيره.**

واتە: لە عەباسی کوڕی موتەلیب دەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ئایا دەزانن بەینی ئاسمان و زەوی چەندە؟) گوتمان: خودا و پێغەمبەرەکەی دەزانن.

ئەویش فەرمووی: (نێوانیان ڕێگای (٥٠٠) ساڵە، لە هەر ئاسمانێکەوە هەتا ئاسمانێکی دیکە ڕێگای (٥٠٠) ساڵە، چڕی و ئەستوری هەر ئاسمانێک ڕێگای (٥٠٠) ساڵە، وە بەینی ئاسمان و عەرش بەحرێکی گەورەیە، کە نێوانی بنی دەریاکە و سەرەوەی دەریاکە وەک بەینی ئاسمان و زەوییە، خوداش لە سەرووی ئەوانەوەیە، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێ لە کردەوەکانی نەوەی ئادەمی لێ ون نابێت).

**ڕاڤەی وشەکانی هەردوو فەرموودەکە:**

**(وکثف کل سماء خمسمائة سنة):** واتە: چڕی و ئەستوری هەر ئاسمانێک ڕێگای (٥٠٠) ساڵە

**هۆکاری باسکردنی ئەم دوو فەرموودەیە لەم بابە:**

دانەری کتاب لەبەر ئەوە ئەم فەرموودانەی باسکردووە بۆ ئەوەی گەورەیی خوا ڕوون بکاتەوە و بە تەنیا بپەرسترێت و شەریکی بۆ بڕیار نەدەیت.

**سوودەکانی هەردوو فەرموودەکە:**

١- فەرموودەی ابن مسعود مەوقوفە بەڵام حوکمی ڕەفعی هەیە.

ابن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (فەرموودەی ابن مسعود صحیحە)[١].

ابن عثیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموویێت: (ئەمە فەرموودەیە مەوقوفە لەسەر ابن مسعود، بەڵام لەو شتانەیە مەجالی بیروڕای تێدا نیە، کەواتە حوکمی ڕەفعی هەیە، چونکە نەزانراوە ابن مسعود دەست بە ئیسرائیلیاتەوە بگرێت)[٢].

**٢-** ئەم دوو فەرموودەیە بەڵگەن بۆ جێگیرکردنی بەرزی بۆ خوای گەورە، وتەی (والله فوق العرش)، ئەمە دەقێکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ جێگیرکردنی بەرزی بۆ خوای گەورە بەرزی زاتی، بەرزی دابەش دەکرێت بۆ دوو بەش:

أ- بەرزی سیفەت، ئەمەیان کەس ئینکاری نەکردووە ئەوەی خۆی دابێتە پاڵ ئیسلام، مەبەست پێی تەواوی سیفەتەکانی خوایە، هەروەک خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿لِلَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ مَثَلُ السَّوْءِ وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الأَعْلَى وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ {النحل:٦٠}.

ب- بەرزی زات، ئەمەیان هەندێک لەوانەی خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام ئینکارییان کردووە، هەر بەرزییەک جێگیر بووبێت مەبەست پێی بەرزی سیفەتە، سەبارەت بە وتەی: "والله فوق العرش" دەڵێن: واتە لە هێز و توانا و دەسەلات و کۆنترۆل، نەک مەبەست پێی لەسەرووی هەمووان بێت بە زات، گومانی تێدا نییە ئەمە گۆڕینی دەقەکانە و نەفی کردنی سیفەتەکانە، ئەوانەی ئینکاری بەرزی خوا دەکەن دابەش دەبن بۆ دوو بەش:

أ- ئەوەی دەڵێت: خوای گەورە بە زاتی خۆی لە هەموو شوێنێکە، گومانی تێدا نییە ئەمە گومڕاییە و کوفرە.

---

[١] التعليق المفيد لاپەڕە (٢٨٤).

[٢] القول المفيد (٣/٣٧٩-٣٨٣).

ب- کەسێک دەڵێت: نە لە سەرووەیە و نە خوارەوە و نە ڕاست و نە چەپ و نە نووساوە بە دروستکراوەکان و نە جیابووتەوە لە دروستکراوەکان، ئەمە ئینکاری بوونی خوای گەورەی تێدایە پەنا بەخوا، لەبەر ئەوە زانایان دەڵێن: ئەگەر بەمە بگوترێ: نەبوون وەسف بکە، ئەوە ئەمە لەو وەسفە زیاتر ناگەین بە هیچ، ڕایان کردووە لە شتێک دەقەکان و عەقل و فیترەت بەڵگەن لەسەری بۆ شتێک دەقەکان و عەقل و فیترەت ئینکاری دەکەن)[1].

صالح الفوزان خوا بیپارێزێت دەفەرمووێت: (ئەم دەقانە بەڵگەن بۆ جێگیرکردنی بەرزی خوای گەورە لەسەر عەرشە، وەڵامە بۆ جەهمی و موعتەزیلە و ئەشاعیرە ئەوانەی نەفی بەرزی خوا دەکەن لەسەر عەرش)[2].

**٣-** ئەم دوو فەرموودەیە بەڵگەن بۆ زانستی خوای گەورە کە هیچ شتێکی لێ بزر نابێت لە کردەوەی نەوەی ئادەم.

**٤-** ئەم دوو فەرموودەیە بەڵگەن لەسەر گەورەی خوا، وە دەبێت خوای گەورە بەتەنیا بپەرسترێت و هیچ هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەردرێت.

**٥-** ئەم دوو فەرموودەیە بەڵگەن عەرش گەورەترین دروستکراوە، گەورەترە لە دەریا وە گەورەترە لە کورسی، وە گەورەترە لە ئاسمان و زەوی، لەبەر ئەوە خوای گەورە عەرشی داوەتە پاڵ نەفسی خۆی: (ذو العرش العظيم)، (رب العرش الكريم).

**٦-** ئەم دوو فەرموودەیە بەڵگەن بەینی ئاسمانی دونیا و ئەوەی دوای ئەو (٥٠٠) ساڵە، وە بەینی سەرو و خواری هەر ئاسمانێک (٥٠٠) ساڵە، نێوانی ئاسمانی حەوتەم و

---

[1] القول المفيد (٣-٣٧٩-٣٨٣).

[2] إعانة المستفيد (٢/٤٦٣).

کورسیەکە (٥٠٠) ساڵە، بەینی کورسیەکە و ئاو (٥٠٠) ساڵە وە عەرش لە سەروو ئاوە.

# پێرست

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |